سۆزان مۆلێر ئۆکێن

# ژن لە فەلسەفەی سیاسیی رۆژئاوادا

## وەرگێڕانی بۆ فارسی

## نووری زادە

## وەرگێڕانی بۆ کوردی

## رەسوڵ سوڵتانی



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ژن لە فەلسەفەی سیاسیی رۆژئاوادا**
- **نووسینی:** سۆزان مۆلێر ئۆکێن
- **ئامادەکردنی و وەرگێڕانی بۆ فارسی:** نووری زادە
- **وەرگێڕانی:** رەسوڵ سوڵتانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **پیتچنین:** رێدار جەعفەر
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **ژمارەی سپاردن:** ١٦١٤
- **نرخ:** ٣٢٥٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠٠٨
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣١٧)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشکەش

وەرگێڕانی ئەم کتێبە پێشکەش بە رووباری خەمەکانی دایکم (روحیزاد کاکە رەش)



## ناوەڕۆک

## پێشەکیی نووسەر:

بە هۆی توێژینەوەکانی ئەم دواییانە کە سەبارەت بە "خستنەڕووی ڕەوشی ژن و تایبەتمەندیی ژنایەتی کراون، بزووتنەوەی ژنان لە بوارگەلی مێژوو، ماف، مرۆڤناسی، کۆمەڵناسی و رەخنەی ئەدەبیدا بە مەبەستی رزگاریی لە کۆت و بەندی روانگە نەریتی و لۆکاڵییەکان هەنگاوی کاریگەری هەڵێناوەتەوە. بەڵام هەتا ئێستاش هیچ کەسێک بە شێوەیەکی بنەمایی و رێکوپێک؛ سەبارەت بە ئاکارناسیی ژنان لە روانگەی فەلسەفەی سیاسیی کۆنەوە کە لەلایەن فەیلەسووفەکانەوە خراوەتەڕوو لێکۆڵینەوەیەکی نەکردووە. بۆیە ئێمە هەوڵ دەدەین لەم نڤیسارەدا تاڕادەیەک ئەم کەمایەسی و کەموکوڕیانە قەرەبوو بکەینەوە.

بەرلە هەر شتێک پێویستە ئەوە بزانین کە تاوتوێکردن و توێژینەوە سەبارەت بە تیۆرییە سیاسییەکانی سەردەمی کۆن، تەنیا تاوتوێکردن و توێژینەوەیەکی زانستی و ئاکادیمیک نییە، بەڵکو خستنەڕووی گریمانە و بۆچوونە فەلسەفی–سیاسییەکان، کاریگەرییەکی بەرچاوی دەبێ لە بیچم گرتنی بیرۆکەی خەڵک و شێوەی خەباتکردنیاندا.

ئێستاکە لە زۆربەی وڵاتاندا، بەتایبەت لە وڵاتانی رۆژئاوایی ژنان بە شێوەی فەرمی وەک هاووڵاتی چاویان لێدەکرێ. ئەوان لە سەرەتادا لە چوارچێوەی ماڵدا قەتیس کرابوون. بەڵام ئێستاکە وەک هاووڵاتیگەلێک لە قەڵەم دەدرێن کە لە هەرێمی سیاسەت و حکوومەتدا مافی دەنگدان و بیروڕادەربڕینیان هەیە. بەڵام وێڕای ئەوەی کە مافی سیاسیی ژنان لەچاو رابردوو و سەرەتای بزووتنەوەی ژنان پەرەی گرتووە، دیسانیش لە بوار و بیاڤەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا لەچاو پیاوان هەلومەرجێکی نایەکسانیان هەیە. بە سەرنجدان بەوەی کە ژنان بە تەواوی خاوەنی مافی هاووڵاتی بوونی خۆیانن، نابێ ئەم راستییە لە بەرچاونەگرین کە ئێستاش ئەوان هەر وەک هاووڵاتیی پلەدوو چاویان لێدەکرێ. هۆیەکەشی ئەوەیە کە هێشتا تایبەتمەندییەکانی فێربوونی زانست و سەربەخۆیی ئابووری و دۆخی کارو چالاکیی ژنان هەر بە ربەو پێوەرە نەریتییەکان



هەڵدەسەنگێندرێن. ئاشکرایە کە ئەم روانگەیە دەبێتە هۆی ئەوەیکە مەودا و نایەکسانییەکانی نێوان ژنان و پیاوان هەروەک خۆی بمێنێتەوە. بۆ وێنە ژنان لە وەرگرتن و دەستڕاگەیشتن بە پلە سیاسییەکان، بە تایبەت لە ئاستەکانی سەرەوەدا واتە بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی، زۆر لە دواوەی پیاوانن.

لە دەیەی رابردوودا ژنان لەسەر مەسەلەی پلەدوو بوونیان و هەروەها لە پێناو گەیشتن بە یەکسانی دەگەڵ پیاوان هەوڵی زۆر بەرچاویان داوە. ئەوان بۆ دەستەبەرکردنی مافی یەکسانی هاووڵاتی بوونیان دەگەڵ پیاو؛ (یەک لەوان؛ ئەندامێتی لە ئاستەکانی سەرەوەی پلە کۆمەڵایەتییەکان) تێدەکۆشن. ئەم تێکۆشانانە بۆتە هۆی ئەوەی کە لانیکەم مافەکانیان بە فەرمی بناسرێن. بەڵام دەستەبەرکردنی مافی فەرمیی هاووڵاتی بوون؛ بەمانای یەکسانی دەگەڵ پیاوان نییە.

گەلێک پرسیار سەبارەت بە رۆڵی ژنان لە فەلسەفەی سیاسیدا هەیە کە شیاوی ئەوەن بۆ وەڵامدانەوەیان بگەڕێینەوە بۆ بەرهەمی بیرمەندان و بلیمەتانی ئەم بوارە. یەکەم پرسیار ئەوەیە کە ئایا لە فەلسەفەی سیاسی کلاسیک (باو)دا مەسەلەی ژن لە گۆڕێدا بووە؟ ئەگەر نەبووە هۆیەکەی چییە؟ وەڵامدانەوە بەو پرسیارە دەراوومان بۆ خۆش دەکا گریمانەکانی نایەکسانیی رەگەزی ژن و پیاو بناسین گریمانەگەلێک کە فەیلەسووفان خستوویاننەتەڕوو، گریمانەگەلێک کە وەک میراتی فەلسەفیی رۆژئاوا چاویان لێدەکرێ. بەسەرنجدان بەو باسە فەلسەفی و تیۆرییە سیاسییانەی سەبارەت بەپێگەی گونجاوی ژنان لە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا هاتوونەتە ئاراوە دووهەمین پرسیار ئەوەیە کە ئایا ئەم شتانە لە دەستەبەربوونی مافە مەدەنی، سیاسی، فەرمی و کۆمەڵایەتییەکانیاندا یارمەتیدەری ژنانن؟ بەرلەوەی بچینە سەر وەڵامی ئەو پرسیارانە پێویستە ئاماژە بە بابەتێکی گرینگ و بنەڕەتی بکەین. ئەویش ئەوەیکە تەواوی فەیلەسووفەکان لە ئاخافتن و نووسینەکانیاندا رووی قسەیان لە پیاوان بووە. بە واتایەکی تر تەواوی بەرهەمە نووسراوەکانی ئەوان سەبارەت بە پیاوان، بۆ پیاوان و بە دەستی پیاوان نووسراونەتەوە. کاتێک خوێنەر لە بەرهەمەکانی فەیلەسووفگەلێکی وەک: ئەفلاتوون؛ ئەرەستۆ، رۆسۆ و، ئیستوارت میلدا چاوی بە وشەی مرۆڤ (man) یا رەگەزی مرۆڤ (man Kind) دەکەوێ کە زۆر

جاران دەگەڵ راناوی ئەو (پیاو) دێ لەوانەیە وا بیربکاتەوە کە مەبەستی ئەم فەیلەسووفانە لە دەکارکردنی ئەم وشەیە (نەژادی مرۆڤ بێ). بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە بەرهەمەکانیان و تێی رامێنین؛ زوو بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم بۆچوونە پووچ و بێ بنەمایە. بۆ وێنە ژان ژاک رۆسۆ لە سەرەتای کتێبەکەیدا (سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکان[1]) بە خوێنەرەکانی دەڵێ: "من دەپەیڤم؛ چونکە مرۆڤم" Discorse on the origin of Inequality. مەبەستی ئەو لە وشەی مرۆڤ رەگەزی نێرینە و پیاوە. ئەو لە درێژەی قسەکانیدا کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی بووە ئاماژە بە نایەکسانی لە نێو پیاواندا دەکا. لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێین کە مایەی شانازییە کە دەکارکردنی ئەو وشەگەلە؛ چ لە رابردوو چ لە ئێستاشدا لە چاوی تیژی ژنان و روانگەی فێمێنیستیانەیان ون نەبوونە. ژنان بە جوانی ئاگایان لە دەکارکردنی ئەمجۆرە وشە ناڕوون و دوولایەنانە بووە، چونکە ئەوان بە باشی تێگەیون کە ئەم وشانە لە باری دەکارکردنی زمان ناسیانەیانەوە لە کەلتووری پیاو مەزنیەوە سەرچاوەیان گرتووە. [2]

فەیلەسووفەکان لەو بەشانەدا کە ویستوویانە بە شێوەی گشتی و بێ هیچ پێچ و پەنایەک و بەحورمەتەوە لە مرۆڤ بدوێن یان مەسەلەی ژنانیان وەلادەنا، یان ئەوەیکە لە دەرەنجامی لێدوانەکانیاندا ژنیان هەڵ داوارد. بۆ وێنە: ئەرەستۆ لە باسی "بەرزترین بەرژەوەندییەکان"دا بۆ مرۆڤ؛ لە خەسڵەتەکانی ژنان دەدوێ و تەنیا نەک هەر بەپێی نەریت لە "بەرزترین بەرژەوەندییەکان" بێبەشیان دەکا. بەڵکو ئەم بێ بەشییە دەکاتە یاسایەک کە شیاوی ژنانە و پڕ بە پێستیانە. بەو پێیە بەو ئاکامە دەگەین کە وشەگەلێکی وەک "کەس" ، "مرۆڤ" و "عەقڵانییەت" لە فەلسەفەی باو و کۆندا بەگوێرەی پێویست رەگەزی ژن ناگرنەوە. لە بەرهەمەکانی فەیلەسووفگەلێکی وەک: ئەفلاتوون، ئەرەستۆ، ئاگۆستین، ماکیاڤێللی، لۆک، رۆسۆ، هێگل و...... هتد دا زۆر جاران چاومان بەوشەی (ماهییەتی مرۆڤ human nature) دەکەوێ؛ بەڵام ئەو وشانە بە تەواوی، تەنیا " ماهییەتی پیاوان" دەگرنەوە و بەردەنگەکەیان تەنیا پیاوانن. بەواتایەکی دیکە؛ مافی مرۆیی مێینە- کە نیوەی رەگەزی مرۆڤی لەخۆگرتووە؛ لەبەر چاو ناگیرێ و پێ شێل دەکرێ.



هەر لە کۆنەوە حەز و ئێنتمایەکی گشتگیر لە نێوان فەلسەفە و کولتووری سیاسیدا هەبووە و ئێستاش هەر هەیە ئەویش ئاوڕلێنەدانەوە یان لەبەرچاونەگرتنی مافی ژنانە و هەتا ئێستاش هەرچی سەبارەت بەڕەگەزی مرۆڤ هەیە و گوتراوە فۆرم و بیچی پیاوانەی هەیە، وێڕای کەمتەرخەمیی گشتی سەبارەت بە لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی رەوشی ژن چەند کەسێک لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی فەلسەفەی سیاسی باو؛ ئاوڕیان لە مەسەلەی ژن داوەتەوە. بۆ وێنە: "ئەفلاتوون، ئەرەستۆ، ژان ژاک رۆسۆ و جان ئێستوارت میل روانگەکانی خۆیان سەبارەت بە "ماهییەت" رۆڵ و پێگەی کۆمەڵایەتیی ژن" خستۆتەڕوو. لەو نێوەدا مارکس و سۆسیالیستەکانی دیکەش هەن کە لەسەر بابەتی ژن و کۆمەڵگا قسەیان زۆرە بۆ گوتن کە ئەوە خۆی تاوتوێکردنێکی جیای پێویستە.

ئەوەی بۆ یەکەمین جار پێگەی ژنانی لە کۆمەڵگەدا بە بنەماییترین پێوەر بۆ پێشکەوتنی جڤاتەکان لەقەڵەم دا؛ شارل فێورییە* و تێڕوانینی خەیاڵ خوڵقێنی ئەوبوو. فێورییە لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە چەندەی ژنان لە کۆمەڵگەدا ئازادتر بن؛ ئەم کۆمەڵگەیە بەو رادەیە پێشکەوتووتر دەبێ. بەواتایەکی دیکە: بەلای ئەوەوە ئازادیی ژنان پێوەرێک بوو بۆ هەڵسەنگاندنی کراوەیی و پێشکەوتوویی کۆمەڵگاکان. چونکە لە روانگەی ئەوەوە رووداوەکانی کۆمەڵگا لەژێر کارتێکەریی گۆڕانی سیاسیی پێگەی ژنان دان و هەتا هەلومەرج و پێگەی ژن لە کۆمەڵگەدا گۆڕانی بەسەردانەیە؛ کۆمەڵگا نە بەرەوپێش دەکشێ و نە دادەکشێ. هەروەها فێورییە هۆکاری بنەڕەتی و سەرەکیی گۆڕان و پێشکەوتنی هەر کۆمەڵگایەکی لە هەراویی ئەم دەسکەوتانەدا دەبینی کە ژنانی ئەم کۆمەڵگایە هەیانبووە.

داهێنان و تێفکرینی نوێی فێورییە جێی پەسندی بزووتنەوەی ژنان و سۆسیالیستگەلێکی وەک فلۆرا تریستان Flora Tristan فێمینیست و کۆمەڵناسی فەرەنسی و کارڵ مارکس و جان ئێستوارت میل بووە. لەو نێوەدا مارکس ساڵی ١٨٤٤ لە دەستنووسەکەی خۆیدا بیرۆکەی پەیوەندیی چڕ و پڕی نێوان یەکسانیی ژنان و گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانی خستەروو کە لە بیروبۆچوونەکانی فێورییەوە سەرچاوەی دەگرت. ئەو نووسیی هۆگریی نێوان پیاو و ژن یەکێکە لە

* charles feuvrier (١٧٧٣ – ١٨٣٨) تیۆریسیەن و کۆمەڵناسی فەرەنسی.

سروشتیترین بەستراوەیی هۆگرییەکانی هاوژینی نێوان مرۆڤەکان و هەر ئەم بەستراوەییەشە کە قووڵایی و ناخی ئاکاری سروشتیی مرۆڤ دەردەخا. بەگشتی، هاوژینی و پێکەوە بەستراوەیی ئەو دوو رەگەزە پێوەری مرۆڤ و ناخی ماهییەتی مرۆییە و لە رۆچنەی ئەم هاوژینی و بەستراوییەوەیە کە مرۆڤەکان لە تەواوی قۆناغەکانی بەرەوپێشچوونی ژیانیاندا هەڵدەسەنگێندرێن.[٣] ئەگەرچی بابەتی ژن لە بەرهەمەکانی کارل مارکسدا وەک مەسەلەیەکی گرینگ تاوتوێ نەکراوە، بەڵام فریدریک ئینگڵس و ئاگۆست بێبەل August Bebel و تیۆری داڕێژانی رەخنەگری قوتابخانەی فرانکفۆرت؛ لە دەلاقەی رەخنەی کۆمەڵایەتی (پێگەی ژن لە کۆمەڵگەدا) و بنەماڵەی نەریتییەوە؛ مەسەلەی ژنیان تاوتوێ کردووە.

هەروەک باسمان کرد واباشترە بیرورای سۆسیالیستەکان سەبارەت بە ژن؛ بە شێوەی جیاجیا و بەتیۆرەتەسەلی بخرێتە بەرباس و خوێندنەوە. تەنیا پێویستە بە کورتی بڵێین کە سۆسیالیستەکان دوو دەزگای فیکرییان سەبارەت بە مەسەلەی ژن خستۆتەڕوو کە برێک وێکچوونییان پێکەوە هەیە: "یەکەم ئەو تاقمە لە تیۆری داڕێژەرانی سۆسیالیست کە حەزیان لێ نییە یا کەمتر حەزیان لەوەیە کە بنەماڵە وەک بنەمایەکی سەقامگیر و ناوەندێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەن. ئەوانە زیاتر سەرنج و بایەخ بە پەیوەندی و بەستراوەیی چەشنە جۆراوجۆرەکانی رێکخراوگەلی بنەماڵەیی و پێکهاتە ئابوورییەکانی دەدەن و جارجارەش بە دیدێکی رەخنەییانە دەڕواننە رۆڵی ژن لە بنەماڵەدا. دووهەم ئەو سۆسیالیستانەن کە ئینتمایەکی کەمتر بۆ چەمکگەلێکی وەک جەوهەر Nature و سروشت Naturلە خۆیان نیشان دەدەن. ئەوانە دەیانهەوێ پێوەری بەها کۆمەڵایەتییەکانی "مرۆڤایەتی" و "کولتوور" لەجێگەی پێوەرە جەوهەری و سروشتییەکان دانێن. دیارە لە فەلسەفەی سیاسیی هاوچەرخدا هەردووک دەزگا هزرییەکەی سۆسیالیستەکان بە نیسبەت مەسەلەی ژنەوە زۆر گرینگ و جێی سەرنجن.

لەم کتێبەدا و لە بەشی دەرەنجامی بیروبۆچوونەکانی ئەفلاتوون، ئەرەستۆ و رۆسۆ و میل دا دەگەین بەدوو هەڵوێستی پێکەوە گرێدراو بەنیسبەت پێگەی



شیاو و گونجاوی ژن و رۆڵی سیاسیی ئەو. یەکەمین و گرینگترین گرێدراوییەک کە لە بیرۆکەی ئەم فەیلەسووفانەدا بەدیدەکرێ روانگەی گشتیی ئەوانە بۆ ژن و بنەماڵە. لە روانگەی ئەم فەیلەسووفانەوە بنەماڵە ناوەندێکی پێویستە و ژن بە هۆی تایبەتمەندی و خەسڵەتی ژنێتی خۆی – زاوزێ و پەروەردەی منداڵ – رۆڵێکی سروشتی لەم ناوەندەدا دەگێڕێ. ئەم راستییە فەیلەسووفان دێنێتەسەر ئەوەی کە یاساگەلێکی ئەخلاقی و چەمکگەلێکی بواری "ماف" بێننەگۆڕێ کە تایبەت بە ژنان بێ و جیاوازییەکی بەرچاوی دەگەڵ پیاوان هەبێ. گریمانەی پێویست بوونی بنەماڵە، فەیلەسووفەکان دەکێشێتە سەر کێشەی ژین لە نێوان پیاوو ژندا، کە لوتکەی ئەم کێشەیە لە فۆرمی زێدەخوازیی پیاوەزنیدا بەدی دەکرێ. دووهەمین خاڵی هاوبەشی بیروبۆچوونی ئەم فەیلەسووفانە کە پەیوەندییەکی چڕوپڕی بە بابەتی یەکەمەوە هەیە پێگەی ژنانە، بە سەرنجدان بە "دۆخی جەوهەریی و سروشتی"ی ئەوان لە نێو کۆمەڵدا. ئەو کاتانەی ئەم فەیلەسووفانە لەسەر ژن قسەدەکەن زۆرجاران لە هێنانە گۆڕێی مەسەلەی "جەوهەری مرۆڤ" خۆ دەبوێرن و ئەم واتایە بە جوانی روون ناکەنەوە. ئەوان نەک وێڕای ئەوەی بڕوایان بە رۆڵێکی دیاریکراوە بۆ ژنان  ژن لە پیاو بە جیا دەزانن و ئەم جیاکردنەوەیەش لە ژێر پەردەی وارسکەی زاتی (جەوهەری) ژنان وەک زاوزێ و پەروەردەی منداڵدا دەخەنەڕوو هەر وەها ئەم فەیلەسووفانە؛ ئەوشتەی وا خۆیان باوەڕیان پێی بووە یا حەزیان لێی بووە بە باشترین پارادایمیان لە قەڵەم داوە و پەرەیان پێداوە و دەرخواردی کۆمەڵگەکانیان داون. لەم رووەوە سەرەتا پێویستە لەو فەیلەسووفانەی خاوەنی بیروهزری سیاسین بپرسین "پیاوان کێن و تواناییەکانیان چییە؟" لە پەیوەندی دەگەڵ ژنانیش لێیان بپرسین "ژنان کێن و بۆچی خوڵقاون؟" ئەوجار تێدەگەین بۆچوونی نایەکسان بە نیسبەت پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان و هەڵسوکەوتە بنەمایییەکانی ژنان چۆناوچۆن هاتۆتە نێو مێژووی فەلسەفەی سیاسییەوە.

ئەم پێشەکییە بەو ئاکامگەلەمان دەگەیەنن کە بریتین لە:

١- ژنان هەروا بە سووک و هاسانی ناتوانن چاوەڕوانی ئەوەیان هەبێ کە مەسەلەی پەیوەندیدار بەوانەوە لە فەلسەفەی سیاسیدا بەبێ جیاوازی دانان

تاوتوێ بکرێ، لەبەر ئەوەی بەرهەمەکانی فەیلەسووفانی رۆژئاوایی لە سەر بنەمای گریمانەی نایەکسانیی رەگەزی، داڕێژراون.

٢- هەروەک دەبینین ئێستاکەش روانگەگەلی سواو و گریمانەی "ماهییەت خوازی سەبارەت بەژن" شێوازەکانی پیاومەزنی و هەڵسوکەوتی نایەکسان لە ژیانی ئەمرۆی ژناندا هەر هەیە و بەردەوامە.

ئێستاکەش روانگەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و دەروونزانیی ئەمرۆیی بە نیسبەت مەسەلەی ژنەوە؛ هەر بەپێی باس و بۆچوونە کلاسیکییەکان —لە ئەفلاتوونەوە بگرە تا دەگاتە رۆسۆ — دەخرێنەڕوو، بۆ وێنە: کاتێک سەبارەت بە جیاوازی دانانی رەگەزی و مافی ژنان چاو لە بڕیارەکانی پایە بەرزترین بەرپرسی دادوەریی (قضایی) وڵاتانی رۆژئاوا دەکەین؛ تێدەگەین کە ئەو مێتۆدە بەڵگەییانەی دادوەران کە بۆتە هۆی دروستبوونی روانگەی دوولایەن و نایەکسان سەربارەت بە مەسەلەی ژنان، لەسەر بنەمای بۆچوونەکانی ئەفلاتوون و ئەرەستۆ داڕێژراون و دادوەرییەکانیان لە ژێر کارتێکەریی بیرۆکەی فەیلەسووفە کلاسیکییەکان دایە.

تاوتوێکردنی تیۆرییەکانی فەیلەسووفانی رابردووی بواری فەلسەفەی سیاسی و شێوەی هەڵسوکەوتیان دەگەڵ مەسەلەی ژن، یارمەتیمان دەدا تێبگەین کە ژنان سەرەڕای ئەوەی مافی دەنگدانیان هەیە هێشتا بە هاووڵاتیی پلە دوو لە قەڵەم دەدرێن.

لە بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا بۆمان دەردەکەوێ کە چ لە جیهانی واقیع و چ لە دنیای تیۆرییە سیاسییەکاندا نایەکسانییەکان بە شێوەی جۆراوجۆر هەن. لە کۆتاییدا سەرنجی خوێنەران بەرەو ئەو خاڵە رادەکێشم کە ئەم کتێبە هەوڵ دەدا تەنیا ئەم بیروبۆچوونانە تاوتوێ بکا کە بانگەشەی نایەکسانیی نێوان پیاو و ژن دەکەن و هیوادارین بەمجۆرە بتوانێ قوتابیانی لقی فەلسەفەی سیاسی هان بدا دەست بکەن بە تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مەسەلەی ژنان.



**پەراوێز**

١- یەکەمین و دووهەمین وتار، لاپەڕەی ١٠١ .

٢- خاتوو مێرێ ویستۆن کرۆفت کە یەکێک بووە لە یەکەمین فەیلەسووفەکان و خوازیارانی دابینبوونی مافی ژنان و راستکردنەوەی زمان، ئاماژەی بەم خاڵە کردووە. هەروەها سەرنج بدرێتە کتێبی ئەلیزابێت لەین بێردسلەی و کتێبی رەگەزایەتی گەڕانەوەیی و شیلارۆبۆتام و کتێبی بەنرخی هۆشیاریی ژنان و دونیای پیاوان (هەڵبەت ئەم کتێبانە هێشتا نەکراون بە کوردی - وەگێڕ).

٣- کارل مارکس یەکەمین نووسراوەکان، لاپەڕە ١٥٤.

# بەشی یەکەم:

## ئەفلاتوون و نەریتی یۆنانیی بێزاری لە ژن

هومێر لە ئیلیادەدا بەدەگمەن قسە لەسەر ژنان دەکا، بەڵام کاتێک ئەویش وەک خەڵکی دیکە دێتەسەر باسی ژنان؛ ئەوان بە هۆکاری داگیرسانی بڵێسەی شەڕەکان و ئێرەیی پێبردن دەزانێ، یا وەک کۆیلە و ئاژەڵ و دەسکەوتەکانی شەڕیان لە قەڵەم دەدا.

نەریتی یۆنانی کۆن وابوو کە وەک منداڵی ساوا هەڵسوکەوتیان دەگەڵ ژنان دەکرد، لەبەر ئەوەی کە ئەوان لە ژیانی خۆیاندا لە گەلێک شت بێبەریی بوون. بۆ وێنە "ژنی سەڵت و رەبەنی یۆنانی؛ بەپێی یاسا مافی ئەوەی نەبوو بە تەنیایی جلوبەرگ بکڕێ. دەبوایە لە ژێر چاودێریی سەرپەرشتی یاسایی خۆیدا جلوبەرگەکانی دابین بکا. هەروەها ژنان ئیزنیان نەبوو بچنە شوێن گەلێک کە "کاروباری شاریی" تێدا فێری خەڵک دەکران، لەبەر ئەوەی ئەم شوێنانە بۆ پیاوان تەرخانکرابوون. بۆ وێنە، ژنان بۆیان نەبوو بچنە نێو ژیمناسیا gymnasia کە بازاڕێکی گشتی بوو. هەروەها بۆ نێو سیمپۆزیا symposia کە دادگایەک بوو. ئەو ژنانەش کە لەلایەن پیاوێکەوە بۆ هاوسەرێتی هەڵدەبژێردران لەبەر بەها و کەسایەتییە واقیعییەکەیان نەبوو بەڵکو بۆ منداڵ خستنەوە، پاراستنی سەروەت و سامان و دەست پێوەگرتن بە ماڵ و پەیڕەوی کردنیان لە پیاوان بوو کە دەیانهێنان.

باوەڕەکانی ئەفلاتوون سەبارەت بەژن سەرەتا بەو مەبەستە خرانە روو کە دەیویست گۆڕەپانێکی نوێ و دژوار لە کولتووری یۆنانیدا بکاتەوە. لەوانەیە یەکێک بپرسێ: باشە فەیلەسووفێک کە پێیوایە رەگەزی ژن لە رۆحێکی چەپەڵ و خراپەکار خولقاوە؛ چۆن خوازیاری داڕشتنی یەکسانیی رۆڵی کۆمەڵایەتیی ژن و پیاو دەبێ؟ چۆن دەکرێ فەیلەسووفێک بێنیتەبەر چاو کە لەلایەکەوە گەلاڵەی



(یۆتۆپیا inside state) بێنێتە گۆڕێ و لە لایەکی دیکەوە باوەڕی وایە کە ژنان بە شێوەی سروشتی و جەوهەری لە پیاوان چەپەڵتر و خراپترن؟

بەر لە وەڵامدانەوە بەم دوو پرسیارە پێویستە سەرێک بە هۆدەی داب و نەریتی یۆنانییەکانی کەونارادا بکەین و بزانین روانگەی ئەوان سەبارەت بە ژن چییە؟ هەر لە سەرەتاوە لە ئەدەبیاتی یۆنان و لە بەرهەمەکانی هەسیۆد Hesiod* (کاروبارەکان، رۆژەکان و رەچەڵەکنامەی خواکان)دا؛ بەگشتی بێزاریی لە ژن بەدی دەکرێ. هەسیۆد پێیوایە کە لە سەرەتای خولقاندا تەنیا پیاوان بوون کە بێ هیچ ژان و ئازارێک لە سەر زەوی دەژیان. [١] دەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم ژن لەسەر زەوی بەناوی پاندۆرا Pandora؛ کە لە راستیدا بڵاوکەرەوەی شەڕ و چارەڕەشی بوو لە سەر زەوی: ئیدی چارەڕەشیی مرۆڤیش دەستیپێکرد. تۆرەمەی ژنان کە سەرچاوەی مەرگ و تێداچوونن لە پاندۆرا کەوتۆتەوە کە رەگەز و نەژادێکی پیس و چەپەڵی هەبوو. ئەوان دەگەڵ پیاوە نەمرەکان هاتنە جیهان.

بەو جۆرە دەگەڵ دەرکەوتنی ژن، گەندەڵی و چارەڕەشی کەوتە نێو وەچەی مرۆڤەوە و بوونی ژن وەک سزایەکی ئەبەدیی لێهات بەسەر پیاوانەوە.

هەسیۆد؛ لە درێژەی وتەکانیدا بە داخ و کەسەرەوە دەڵێ: مخابن؛ بوونی ژن بۆ زاوزێ و مانەوەی تۆرەمە و ماڵداری پێویستە، هەروەها ئامۆژگاریی وەرزێرەکان دەکا لە بیری دابینکردنی نیروئامور (گاسن) دابن بۆ زەوی کێڵان و ژن هێنانیش بۆ کابانێتی[٢]. خوێنەرانی بەرهەمەکانیشی وریادەکاتەوە کە متمانە بە ژنان نەکەن [٣].

ژن لە هۆنراوە حەماسییەکانی هۆمێریشدا هەر بەوشێوەیە وێناکراوە کە هەسیۆد کردبووی.

م. ی. فین. لی، لە کتێبی جیهانی ئۆدیسەدا* دەنووسێ: "هۆمێر بەبێ هیچ هەڵە و کەم و کورییەک تەواوی حەقیقەتەکانی دونیای کەونی سەبارەت بەژن هێناوەتەوە". هۆمێر دەڵێ ژنان هەر بەشێوەی سروشتی بە رەگەزی پلەدوو لە قەڵەم دەدرێن و ئەرکەکانیان لە چوارچێوەی زاوزێ کردن و کابانێتی دایە و

* هەسیۆد (٨٠٠ پ. ز) شاعیری یۆنانی.
* The odyssey's World

بەڕێوەبەرێتیی کۆمەڵایەتی و دەسەڵات لە ئەستۆی پیاوانە [٤]. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەینەوە کە هومێر لە شیعرەکانیدا باس لە خواژن؛ خوداگەلێکی تایبەت (رب النوع) دەکا کە خاوەنی هێز و شان و شکۆن. لێرەدا دەبێ بڵێین مەبەستی ئەو لەم (الهە) و (رب النوع)انە تەنیا رەگەزی مێینە نییە چونکە یۆنانییەکان ئەم ناوانەیان تەنیا بۆ رەگەزی مێینە دەکار نەدەکرد. بۆ وێنە ئەسینا* بەهێزترین خوایە و ئەم هێز و دەسەڵاتە لەبەر لایەنی پیاوبوونەکەی بوو کە هەیبوو هەر بۆیەش دەیانپەرست.[٥] هومێر لە ئۆدیسەدا لایەک لە رۆڵی ژنان دەکاتەوە و کاکڵی وتەکەی ئەوەیە کە، ژنان لە کۆمەڵگادا پێگەی رەگەزی پلە دوویان هەیە.

پێنلۆپ* وێڕای ئەوەیکە باوەڕی بەو حەقیقەتە بوو کە ژنان ژیرن، تەشی رستن و پارچەچنین بە ئەرکی شیاوی ئەوان دەزانێ و زۆر جاران پێشنیار بە تێلێما چۆس Telemachus)ی کوڕی دەکا کە ئەم جۆرە کارانە لە پیاو ناوەشێنەوە و پیاو نابێ بەوکارانە خۆی بێنێتە ئاستی کۆیلەیەک و دەبێ ئەم چەشنە کارانە بەژنان بسپێرێ. ژنە بەگزادەی یۆنانی پێیان وابوو کە خواژنەکانیش (الهە) کاروبارەکانی ناو ماڵیی وەک جلوبەرگ شۆردن؛ چێشت لێنان بۆ میوانان و جێ و بان راخستنیان دەگرتە ئەستۆ. هەر وەک "م. ی. فین. لی"، دەڵێ: ژنان بێبەری بوون لەوەیکە ژیانێکی سەربەرزانەیان هەبێ و ئیزنی خۆرێکخستن و چالاکی نواندنیان لە بوارەکانی ورزشوانیشدا نەبوو [٦]. هەروەها هەمیشە ژنانیان لە پیاوان هەڵداوارد* و بە دەگمەن لە میوانی و رێوڕەسمەکاندا بەشداریان دەکردن. ئەوان لەلایەن باوکیانەوە بە زۆری بەشوو دەدران، تەنانەت دەشفرۆشران.

حەماسەی هۆمێر باس لە جیهانێک دەکا کە لەوێدا پێوەری مەزنێتی و گەورەیی کەسەکان؛ بەو ئەرک و پێگە کۆمەڵایەتییەوە بەستراوەتەوە کە ئەوان

* Athena (الهە) خوای ژیرێتی، شەڕ و چنین. ئەو لە دایکی خۆی نەبوو بەڵکو لە تەپڵی سەری باوکییەوە هاتەدەرێ.

* penelop کەیبانوویەکی وەفادار کە هۆمێر بۆ پاڵەوانی چیرۆکەکەی ئۆدیسە وێنای کردووە.

* هەڵاوادرن: جوێ کردنەوە. لێک جوێ کردنەوە.



لە کۆمەڵگەدا هەیانە. بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە ئەخلاقییە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ نووسراوە کلاسیکییەکان یا لانیکەم بۆ دەستنووسەکانی ئەرەستۆ. بەرزترین وشەی نزا و پاڕانەوە لە کولتووری یۆنانیدا دوو وشەی agathos (باش) و arete (فەزیلەت)ە کە هەردووکیان ئی پیاوانی ئەشرافیی هۆمێرین. دەورگێڕان و خاوەنی ئەم دوو تایبەتمەندییە کەسانێک بوون کە تێکڕای لێوەشاوەیی و لێهاتووییە دەروونییەکان و توانایە دەرەکییەکانیان هەبوو.

بەپێی وتەی "ئەی. دەبیلو. ئێچ. ئەدکنیز A. W. H. Adkins بۆ ئەوەی چاک بیت پێویستە بوێر، بەدەستوبرد، ساماندار و لە شەڕ و ئاشتیدا سەرکەتوو بیت[٧].

دیارە کە تەنیا پیاوێکی ئەشرافی ئەرستۆکرات دەیتوانی خاوەنی تەواوی ئەو مەرجە پێویستانە بێ.

زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگە بەتایبەتی ژنان لەو مەرجە پێویستانە بێبەری بوون؛ لەبەر ئەوەی کە ئەوان خاوەنی هیچ کام لەو پێوەرانە نەبوون کە بۆ مەزنێتی پێویست بوون.

ژنە داوێن پاکەکان arete، بەو ژنانە دەگوتران کە خاوەنی بەژن و باڵایەکی لەبار بوون و لە کاروباری ماڵێ و لە کاری چنیندا بە دەست و برد بوون و لە هەمووی گرینگتر توانایی زگ کردن و زاوزێیان هەبوو.[٨] هەر وەکو ئەدکینز ئاماژەی پێدەکا پێوەرەکانی مەزناهیی (فضیلت)ی ژنان هەر ئەم پێوەرگەلەن کە پیاوان لە پێناو کەلتووری پیاومەزنیدا دەستنیشانیان کردوون. ئەم پێوەرانە بەپێی ئەرکی ژنان و کارکردیان و لە پەیوەندیی دەگەڵ پیاواندایە کە دەبنە خاوەنی واتا و مانای خۆیان. لەبەر ئەوەی ژنانی قەتیسکراو لە چوارچێوەی ماڵدا هیچ هانە (انگیزە) یەکیان نەبووە کە لەبەرامبەر مەزنێتی دەسەڵاتخوازانەی پیاودا کارێک بگرنە ئەستۆ[٩].

هەڵسوکەوتی پاڵەوانە هۆمێرییەکان بەجوانی دەریدەخا، کە تاقە ژنێ؛ بۆ پیاوان کارێکی پێویست و داسەپاو نەبووە. بە واتایەکی دیکە؛ پیاوان مافی ئەویان هەبووە بچنە لای ژنی دیکە و سێکسیان دەگەڵ بکەن. بەڵام ژنان لەو مافە بێبەری بوون و خراپترین تاوان بۆ ئەوان ئەوەبوو کە بە مێردەکانیان وەفادار نەبن و بێ بەڵێن بن.[١٠] هێلێن و لەو خراپتر کلێتێمنەسترا

clytemnaestral لەبەر ئەوە لە شیعرە حەماسییەکانی هۆمێردا هێمای ئاژاوەگێڕی و چەپەڵێن چونکە زیناحیان کردووە. هەروەها بە پێی شیعرەکانی ئەو توانایی ژنان لە بەلاڕێدا بردن و چەواشەکردن، ئەوەندە بووە کە پێنێلۆپی پاک، پەرۆشی ئەوە بووە کە نەکا سێحری؛ سێحربازێکی وەک هێلێن تەلیسمی بکا.

بابەتی سەرەکیی هومێر لە هەسێود وکلیتێم نەسترادا؛ ئاژاوەگێڕی و خیانەتی ژنە و مەبەستیشی ناوزڕاندنی رەگەزی ژنە هەر وەک سەردەمەکانی پێشوو[11]. لەسەردەمی ئەدەبیاتی حەماسییەوە هەتا ئەدەبیاتی کلاسیکی یۆنان پێگە و دۆخی ژنان بەگشتی بەرەو باش بوون نەچووە. بەتایبەت لە ئەدەبیاتی ئەسیناییەکاندا ئەم راستییە بەدی دەکرێ.[12] لە ئەدەبیاتی یۆناندا ئەرکی ژنان زگکردن و ماڵدارییە. بۆ وێنە گەزەنفۆن لە "ئۆیکۆنۆمکوس" دا بۆ موڵکدارێکی ئەسێنیایی هەوڵی وێناکردنی ژنێکی شیاوی داوە. ئەو باسی کچۆڵەیەکی پازدە ساڵانە دەکا کە باوکی داویەتی بە ملکدارێکی ئەسێنی. ئەو کچە تا ئەو جێیەی بۆی دەلوێ، دەبێ بەدەگمەن ببیە و ببینێ و پرسیاربکا، بەگوێرەی پێویست پەروەردەی دەکەن، بۆ ئەوەی کاروباری ماڵ و ماڵدارێتی بگرێتە ئەستۆ.[13]

لە یۆناندا کە دابونەریت ریشەیەکی پتەوی لە هەڵسوکەوتە کۆمەلایەتییەکان و چلۆنایەتیی بوون و سروشتی رەگەزی ژن و پیاودا هەیە هەر لە پێشدا لەلایەن خاوەن (پیاو*)ەوە کار و ئەرکەکان دابەش و دەستنیشان کراون. ڤیکتۆر ئێرێنبێرگ لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا کە سەبارەت بە کۆمەڵگەی یۆنان کردوونی ئەو راستییە پشتڕاست دەکاتەوە کە ژیانی ژن هەر لە پێشدا دیاریکراوە. بۆ وێنە: دەکرێ ئاماژە بەکچ گەلێک بکەین کە تەنیا لە سەر قسە و ویستی باوکیان کە ئەویش تەنیا لایەنی ئابووریی هەبووە– شوویان دەکرد. ئێرێنبێرگ دەڵێ: "کچانی یۆنانی ئێزنی زانست فێربوونیان نەبوو، چونکە ئەوان دەبوو تەنیا فێری هونەری ماڵداری بن. هەر وەکی ئیفیژێنیا Iphigenia هێمای کەسێکە کە نازانێ بنووسێ." ئەو لەو لێکۆڵینەوە سەرنجراکێشانەدا کە لەسەر کۆمێدیاکانی ئاریستۆڤان کردوویەتی؛ دەڵێ: "ئەو چەند کەسایەتییە (ئەکتەرە) ژنەش کە لەم کۆمێدییەدان ؛ رۆڵێکی وا بەرچاویان پێنەدراوە کە بینەران راچڵەکێنن."[14]



ژنان هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە کرابوون لە پیاوان جیابن، هەر بۆیەش مانەوەیان لە چوارچێوەی ماڵێدا بەلاوە دژوار نەبوو. ئەوان لە چوارچێوەی ئەم شوورانەدا جگە لە کاروباری ماڵێ ئەرکی داکەندنی شمەکی مێردەکانیشیان لە ئەستۆ بوو، بایەخ پێدانی پیاوانیش بە ژنان هەر لەم ئاستەدا بوو. ژنان لەبەر سەرکوتی بەردەوام و نەهێشتنیان هیچ کات نەیانتوانی لە باس و بڕیاردانەکانیشدا بەشداربن هەر بۆیەش توانایی گەنگەشە و وتوویژ و تەنانەت بیرکردنەوەشیان لێ زەوت دەکرا.

جۆن ئەدینگتۆن سیمۆن بەکورتی و بەو جۆرە باس لە پێگەی ژنان دەکا لە نێوان کەلتووری ئەشرافی و نێربازیی یۆناندا.

"تەواوی چالاکییەکان لە ئاستی سەرەوەدا، وەک چالاکییە جەستەیی و هزرییەکان و هەموو پەسندانەکان، پێداهەڵگوتنەکان، کەفوکوڵ و شانازییەکان بۆ پیاوان تەرخان کرابوون و بەشێک بوون لە پاوانەکانی پیاوان."[15]

لەسەردەمی هومێردا چالاکیی ژنە ئەسێنییەکان ئێجگار بەرتەسک بوون و ئەویش دەبووە هۆی ئەوەیکە ئەوان لە رووی کەسایەتییەوە لەژێر تەوژمێکی لە رادەبەدەردابن. لە دراما و پەندی پێشینانی یۆناندا گەلێک بەڵگە بۆ ئەو شتانە هەن. بۆ وێنە ئەرەستۆ لە ئاژاکس* دا ئەم رستەیەی سۆفۆکلێس مان* دێنێتەوە بیر کە: "بێدەنگی تاجی سەری ژنە". هەروەها ئەو لە ئاخافتنی "ماڵئاوایی سۆفۆکلیس" دا ئەم جیاوازی و نایەکسانیانە نمایش دەکات کە ئەوکات لە نێوان ژن و پیاودا باو بوون.

لە یۆنانی کۆندا ستایشی هونەری رەوانبێژی، کارێکی باو و سەردەمیانە بوو. ئەم تەکنیکە تەنیا بە مەزناهییەکی پیاوان لە قەڵەم دەدرا و ژنان مافیان بە سەرییەوە نەبوو. بۆ وێنە (سیاسەتڤانی ئەسێنی) پریکلێس لە ئامۆژگارییەکانیدا بۆ ژنان دەڵێ: "مەزناهیی (فضیلت) ژنێتی– کە کەسایەتیی سروشتیی ژن پێک دێنێ– وا هەڵدەگرێ ژنان کەمتر قسە بکەن جا قسەکانیان چاک بن یان خراپ.[17] بابەتێکی گرینگی دیکە کە پێویستە ئاماژەی پێکەین؛ ئاکاری "جنسی"ی پیاوانە. پیاوی یۆنانی کە سەر بە چینی باڵای کۆمەڵگاش بێ بێجگە لە کردەی سێکسی دەگەڵ ژنەکەی خۆی؛ مافی ئەوەشی بووە کە دەگەڵ ژنانی تریش کە

لەڕاستیدا لەشفرۆش بوون، سێکس بکا. هەر لە هەوەڵەوە تا ئێستا جیاوازی و مەزنتری لە نێوان ئەو دوو جۆرە ژنە، واتە ژنی نەجیب و نانەجیب دا، هەر هەبووە. دەکرێ بڵێین پیاوانی ئەمرۆییش کە لە سێکس کردندا ئازادن؛ هەر لەسەر رێوشوێن و سفرەی رەچەڵەکە یۆنانییەکەیانن.

دیمۆستێن (سیاسەتوان و ئاخێوەری یۆنانی ٣٨٤ تا ٣٢٢ی پ. ز) بەو جۆرە باس لە کردەی سێکسی یۆنانییەکان کە تێگەیشتن و لێکدانەوەی خۆیەتی لە سکالاکردن، دەکات: "مانای تاکە ژنی بۆ پیاو ئەوەیە کە چەند منداڵێکی لە ژنەکەی هەبێ بۆ ئەوەی ئەگەر کوڕ بوون بە شانازییەوە لە نێو ماڵ و کەسوکاردا ناویان بێنن و ئەگەر کچیش بوون بیاندەنە دەست مێردەکانیان (بۆ قازانجی ئابووری).

دەبێ گراوییەکان بۆ چێژ وەرگرتن لە جەستەیان راگرین و هاوسەرە کاتییەکانیش* بۆ خزمەتی رۆژانە و تایبەتیی پیاوان. ئەوەیکە نابێ هاوسەرەکان بەرەڵڵا بکرێن لەبەر ئەوەیە کە ئەوان وێڕای ئەوەی منداڵیان دەبێ بۆ پیاوان: زێرەڤان و پارێزەرێکی بە ئەمەگیشن بۆ ماڵ و سامانەکانیان".(١٨) وا باشە لێرەدا ئاماژە بەو وەڵامە بکەین کە کرۆن بەم پرسیارەی داوەتەوە کە لێی دەپرسن: "ئەگەر یەکێک بیهەوێ بووکەکەی بکووژێ چی لێدەکەن؟" وتی: "رێگەی دیکە زۆرن بۆ زەوی کێڵان."(١٩) هەروەها بەڵگە زۆرن کە دەریدەخەن ژنانی چینی بالای کۆمەڵگەی کۆنی یۆنان، رۆڵێکی زۆر لاواز و بێ رەنگیان هەبوو لە ژیان و کۆمەڵگادا. هەڵبەت ئەم رۆڵ و قورسایینە خزیبووە نێو ئەرکەکانی ژن و مێردایەتیشیانەوە بەجۆرێک کە دواتر وەک بابەتگەلێکی رۆمانتیک و ئەڤینداری لە مەسیحییەتدا برەویان پەیداکرد. بەگشتی ژنان لە یۆنانی کۆندا لەلایەن پیاوانەوە کران بە ئامرازێک بۆ زاوزێ کردن و منداڵ خستنەوە. هەتاکو بە هۆی ئەم منداڵانەی دەیانبێ پیاوان لە وەجاخ کوێری رزگار بکەن.

جێی سەرنجە کە بۆچی لەم سەردەمەدا مەسەلەی ئازادیی ژنان دێتە گۆڕێ و بایەخی پێدەدرێ. ڤیکتۆریا بریتاین victoria Britain سەبارەت بەوە دەڵێ:

* "لە دەقە فارسییەکەدا "صیغە" هاتووە کە بەو ژنانە دەگوترێ بە شێوەی کاتی دەبنە هاوسەری کەسێک. وەرگێڕی کوردی.



"سەدەی چوارەم تەشقی سەرکوتی ژنان بوو لە یۆناندا، هەر بۆیەش مەسەلەی ژنان و پێگەی ئەوان هاتە گۆڕێ و بوون بە باسی رۆژانەی ئەسینا. کۆمێدییەکانی ئاریستۆفان* بە ناوەکانی لیسیستراتا Lysistrata و کۆڕی ژنان Ecclesiazusae بەڵگەگەلێکی باشن بۆ ئەم بابەتە و بەڕوونی باسوخواسەکانی ئەو قوناغە دەخەنەڕوو. بە دیتنی ئەم شتانە و بە هێندێ گومانەوە وێدەچێ باوەڕە مێژووییەکانی سوقرات و ئەوانی بەر لەو، سەبارەت بە ژنان لەم قۆناغە پێشڕەوتر بوونە. بۆ وێنە گەزەنفۆن لە نامیلکەی میوانیدا symposium باس لەوە دەکات کە "سروشتی ژن هیچ لە سروشتی پیاو خراپتر و نزمتر نییە؛ ئەگەرچی ئەوەی ژن دەیهەوێ دادپەروەری و دەسەڵاتە."(٢٠)

هەروەها بابەتگەلێک لە وتەکانی ئەفلاتووندا هەن کە پێشاندەری روانگەی سوقراتن سەبارەت بە یەکسانی و نەبوونی جیاوازیی لە رەگەزەکاندا. بە تایبەتی لەم یەکسانیەدا پێداگیراوە لەسەر مەزناهی و توانا مرۆییەکان. ئەفلاتوون بەو شێوەیە پرسیار و وەڵامەکەی سوقرات و مێنونی هێناوەتەوە: "مێنون: گوێ بدەیە با سەرەتا باست لە تواناییەکانی پیاو بۆ بکەم، ئەویش ئەوەیکە بتوانێ کاروباری شارێک بەڕێوەبەرێ و وێڕای ئەوە قازانجی بۆ دۆستەکانی هەبێ و دوژمنەکانی سەرکوت بکا، بێ ئەوەی خەسارێکی وێکەوێ. لە توانایی ئافرەتیش گەردەتهەوێ ئاگاداربیت ئەوەیکە باش بە ماڵێ رابگا و ملکەچی مێردەکەی بێ و..."

سوقرات لە وەڵامیدا دوای ئەوەی نەزیلەی زەرگەتەی بۆ دێنێتەوە دەڵێ: وێڕای ئەوەی زەردەواڵەکان لێک جیاوازن هیچ گومانێک لە زەردەواڵە بوونیاندا نییە، و بەو ئاکامە دەگا کە تەواوی مرۆڤەکان بە قەد یەک تواناییەکی یەکسانیان پێبڕاوە. بەواتایەکی دیکە توانایی و مەزناهی نێوان دوو رەگەزی ژن و پیاو لە چلۆنایەتیدا وەک یەکن کەچی ئەوە ئەرک و مێتۆدی ژنانە کە بە شێوەیەکی نەریتی جیاوازیی خستۆتە نێوان ئەم دوو رەگەزە.

سوقرات پێیوایە کە ژن و پیاو بەمەرجێک توانایی وەک یەکیان دەبێ کە زانا و دادپەروەربن و خاوەنی تایبەتمەندیی و خەسڵەتی هاوبەش بن. ئەگەر ئەوان دەیانهەوێ بە مەزنێتی و پاکی بژین دەبێ هەڵسوکەوتی حورمەتگرتن و رێز

لێنانیان لە ماڵێ و لە کۆمەڵگەدا وەک یەک وابێ (واتە لە دەر و ژوور وەک یەک ڕێز لەیەکتربنێن. وەرگێڕ)، بەکورتی ژن و پیاو خاوەنی توانایییەکی یەکسانن و مەزناهی خەسڵەتێکی مرۆییە و بە پێی ڕەگەز پێناسە ناکرێ.[٢١]

سەرەڕای ئەوەش سوقرات کە لە پرۆتاگۆراسدا دژی نۆرمە باوەکانی سەردەمی خۆی بەنیسبەت مەسەلەی ژنانەوە بوو، بەتاریف کردن لە ژنانی سپارتە و کرێت ئەم دژایەتییەی خۆی دەرخست و ئەوانی بە ئافرەت گەلێک ناو برد کە شانازی بە ئاوەزی کەلتووری خۆیانەوە دەکەن.[٢٢]

ئەم بە بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بەژنان و دانپیانان بەوەی کە تواناییەکانیان لە ئاستی توانایی پیاوان دایە و هەروەها بە تاریف کردنی ژنانی سپارتەوکرێت دەیویست وێڕای ئەوەی فەیلەسووفە نەریتییەکانی هاوچەرخی خۆی تێبگەیەنێ لەوەیکە بۆچوونەکانیان سەربارەت بە جیاوازیدانانی نێوان ڕەگەزەکان هەڵەیە؛ نموونە و پارادایمێکیشی خستە بەردەم داهاتوان. بەڵام سەرەڕای ئەوەش هێندێ وتووێژ و وتەی سوقرات لەبەرهەمەکانی ئەفلاتووندا دەبینرێن کە دەگەڵ ئەم بابەتانەی سەرەوە ناتەبان. واتە لە هێندێ جێگە دا پێشاندەری دژایەتیی سوقراتن دەگەڵ ژن. لەم ڕووەوە پێویستە ئەوەمان لەبەرچاوبێ کە تاڕادەیەک لێک هەڵاواردنی باوەڕەکانی سوقرات لە باوەڕەکانی ئەفلاتوون ئەستەم و دژوارە. لەبەر ئەوەی کە لە نێو وتووێژەکانی ئەفلاتوون دەگەڵ کەسانی دیکەدایە کە باوەڕ و بیروبۆچوونەکانی سوقرات دەردەکەون و لەوانەیە ئەم ناتەبایی و پارادۆکسانە لەوەوە سەرهەڵدەن کە ئەفلاتوون زۆر جاران باوەڕەکانی خۆی بەزاری سوقراتەوە هەڵبەستووە. بە هەرحاڵ ئەم بابەتە هی سوقرات بێ یا نەبێ دەکرێ بە ڕوونی ئاسەواری دژایەتیکردنی ژنان لە نێو باوەڕە ڕادیکاڵەکانی ئەفلاتووندا بەدی بکەین. لەوتووێژەکانی ئەفلاتووندا بەسووک زانین و بەهێندنەگرتنی ژنان، روون و بەرچاوە، تا ئەو جێیەی کە تەنانەت نزیکایەتی لە ژن (سێکس دەگەڵ ژن) بە کردەیەکی قێزەون زانراوە. بەو پێیە و لە ڕێگەی ڕوانگەی ئەفلاتوون و هاوڕێکانییەوە سەبارەت بە ئەڤینداریییەوەیە کە ئەوان بە نێربازیی تاوانبارکراون. کورتی ببڕینەوە سەرەڕای ئەم خاڵە پارادۆکسیکاڵانەی لە وتووێژەکانی ئەفلاتووندا سەبارەت بە ژنانی



کۆمەڵگەی ئەسینا هەن، ئەم باوەڕە زاڵ و گشتییەش هەیە کە ئەفلاتوون بە شێوەی جەوهەری ڕەگەزی ژن لە پیاو بە کەمتر دادەنێ.

لەڕاستیدا لە وتووێژەکانی ئەفلاتووندا هیچ ژنێک وەک بەردەنگ حوزوری نییە لەبەر ئەوەی کەشی زاڵی کۆمەڵگای یۆنان وای هەڵدەگرت کەژن بەدیارەوەنەبێ. ئەوە پاساوێکی لۆژیکی نییە ئەگەر بڵێین هۆی نەبوونی ژن لە نێو وتووێژەکانی ئەفلاتووندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو نکوڵی کردووە لە توانایی و هێزی ئاخێوەریی ئافرەت، بەڵکو لەوانەیە ئەم نائامادەییە ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی ئەو کاتی کۆمەڵگەی یۆنان بێ. لە نامیلکەی میوانیدا هاتووە کە ژنانی ماڵێ (کابانەکان) وێڕای ئەوەی لە ماڵێ بوون، بەڵام لەمیوانداریییەکانی شەوێدا نەبوون. ئەوە خاڵێکە کە ئەفلاتوون لە هەڤپەیڤینە ریالیستییەکەیدا- کە دەگەڵ کۆمەڵگەی هاوچەرخ یەک دەگرێتەوە- ئاماژەی پێ کردووە. بۆ وێنە لە ڕاستیدا دەبوایە کاکڵی ئەم وتووێژانەی نێو نامیلکەی میوانی، لەزمانی ژنە کاهینێک Diotim دوە گوترابایەن، بەڵام بە پێی بەرژەوەندی وانەبووە. وێنەی کەسایەتیی ژن لە بەرهەمەکانی ئەفلاتووندا؛ وێنەی ژنێکی تەشی ڕێس و پارچەچنە. ئەو بەزمانێکی سووکایەتیانەوەو بە هێنانی وشەی "ژن" کە (لەوێدا) واتای کەسێکی بێ دەسەڵات و لاواز و ترسنۆک دەگەیەنێ، ڕووی قسەکانی دەکاتە ژنان. هەڵبەت تەنیا ئەفلاتوون وانەبووە. بەڵکو ئێستاش لە ئاخافتن و هەڤپەیڤینی پیاوانەدا کەڵک لەم وشانە وەردەگیردرێ.[٢٣] بەگشتی دەکرێ بڵێین کە ئەفلاتوون باوەڕەکانی خۆی سەبارەت بە ژنان کە لە سووکایەتی و بەکەمگرتن بەولاوەنییە؛ گەیاندە لایەنگرەکانی، ئەو لە پۆلێن بەندییەکەی خۆیدا ژنانی هێنایە ڕیزی منداڵان، نەخۆشان، لاوازەکان و کەسانی دواکەتوو و ئاژەڵەکانەوە.[٢٤]

بەر لە ڕێنسانس (شۆڕش و گۆڕانی کەلتووری، هونەری و زانستی) و بەر لەوەی ژن وەک پۆلیس و پارێزەر دەرکەوێ ئەو پیاوانەیان قایل دەکرد (کە دەیانویست ئەم ئیشە بەرێوەبەرن) کە بۆ ئەوەی سەرکەون پێویستە لەو ئاکار و خەسڵەتانە (خۆ هەڵکێشان و فیزلێدان، و دوای هەوەس کەوتن، مشتومڕ و ئەخلاق لەرزۆکی) کە تایبەتن بەژنان خۆ ببوێرن چونکە لەسەر ئەم باوەڕە

بوون که ژنان له پیاوان کەمئاقڵترن و لەڕێوە فریوی زێڕ و خشڵ و بەرموور دەخۆن و روو دەکەنە خورافات و خەیاڵات. ئەفلاتوون لە نامیلکەی کۆماردا سەبارەت بەوە دەڵێ: "کەواتە ئەو لاوانەی دەمانهەوێ ببنە پاریزەری کومەڵگاکەمان و وەک پیاوێکی بە توانا رابێن ئیزنیان پێ نادەین لاسایی ژنان بکەنەوە و بکەونە شوێن ئافرەتان کە (بوونەوەرێکی) ئاژاوەگێڕ و چارەڕەش و گرفتارن یا تازییەبارن یا عاشق یا نەخۆش و بەژانەوەن.[٢٥]

روون و دیارە کە لە روانگەی ئەفلاتوونەوە ژنان کە لە ریزی منداڵان، کۆیلە و رەتێندراواندان نموونەیەکی باش نین بۆ پارێزەرانی لاو. ئەو زۆر جاران باسی لە رۆڵی قێزەونی ژن کردووە لە کاروباری سێکسدا و لە کتێبی یاساکاندا یەکێک لەو بەڵگە و هۆیانەی بۆ پێشگرتن لە نێربازی دەیهێنێتەوە ئەوەیە کە: یەکێک لەو دوو پیاوە ناچارە لەوکارەدا خۆی وەک ژن لێ بکا (دەوری قێزەونی ژن بگێڕێ) هەربۆیەش دەپرسێ باشە ئەو کەسەی هەوساری خۆی دەداتە دەست هەوەس و چووکەترین بەرگری ناکا؛ ئایا لەبەرچاوی هەمووان سووک نابێ؟ ئەو لاوەش کە وەک ژنان خۆی دەبەردەستی پیاوان دەنێ؛ ئایا هەموو خەڵک بە چاوی سووک لێی ناڕوانن؟[٢٦] ئەگەر چی ئەفلاتوون کردەی نێربازیی بەباش نەزانیوە، بەڵام هەروەک لە نامیلکەکانی فایدروس و میوانیدا باسی لە ئەڤینداری کردووە؛ پێشاندەری ئەوەیە کە تەواوی فەیلەسووفانی قوتابخانەی ئەفلاتوون تەنانەت بۆ خۆیشی وێڕای پیاوانی چینی سەرووی ئەسینا، نێرباز بوونە و ئەم کارە لە کەلتووری فەیلەسووفانەی ئەوکاتدا شتێکی ئاسایی و باو بووە.

گریگۆڕی ڤلاستۆس سەبارەت بە عەشقبازیی ئەفلاتوون سێ گریمانەی هێناوەتەوە: یەکەم ئەفلاتوون بۆ خۆی نێرباز بووە. دووهەم، ئەو سۆفی و عارفێک بووە و بەم تێڕوانینەوە باوەڕی بە گرۆیی (ئینتما) بۆ هاوڕەگەزی خۆی بووە. سێهەم ئەوەیکە ئەفلاتوون مامۆستا و زانایەکی ئەخلاق بووە کە تێڕوانینێکی تایبەتی سەبارەت بە نێربازیی خستەڕوو.[٢٧] ڤلاستۆس دەڵێ: نێربازبوونی ئەفلاتوون کە بەواتای کردەی (لواط)ە، دەگەڵ وتەکانی یەک ناگرێتەوە. ئەفلاتوون (لواط) ی بەکردەیەک دەزانی کە دەگەڵ سروشتی مرۆڤ ناتەبایە و نە تەنیا داکشانێکە لە رۆحی مرۆڤدا، بەڵکو وەک داکشانێکی



جەستەییش لە قەڵەم دەدرێ. هەروەک دەزانین فەلسەفەی ئەفلاتوون لەسەر ئەو بنەمایە داڕێژراوە کە مرۆڤ لە دووبەشی مەعنەوی (رۆح) و ماددی (جەستە) پێک هاتووە. ئەفلاتوون پێیوایە کە بەشی راستەقینەی بوونی عەشق، واتە بەشە رۆحییەکەی دەبێ زاڵ بێ بەسەربەشی جەستەییەکەیدا. بەواتایەکی دیکە سێکسی نایاسایی (لواط) ی بەکارێکی سووک و ناتەبا بە هەردووک بەشی وجوودیی مرۆڤ (رۆح و جەستە) دەگەڵ رۆحی یاساکان دەزانی: "رەوا نییە پیاوان دەگەڵ کوڕان دەست تێکەڵ بکەن*. نموونەشمان ئاژەڵەکانن کە قەت سواری نێرینەی رەگەزی خۆیان نابن. بەو جۆرە بەو دەرەنجامە دەگەین کە عەشقبازیی پیاوان دەگەڵ کوڕان کردەیەکی ناسروشتییە و هەر شتێک دژی سروشت بێ دەگەڵ رۆحی یاساکانی ئێمە ناتەبایە." ئەفلاتوون جوانپەرستی و عەشقبازیی راستەقینەی بەو عەشقە روحانی و ئاسمانییە دەزانی کە زاڵ بێ بەسەر عەشقی جەستەیی و خاکیدا و لەوانەیە بۆ ئەوەی باشتر لە گریمانەی ئەڤینی ئەفلاتوونی تێبگەین؛ وەک پاک کردنەوەی پاڵنەرە نادڵخوازە مرۆییەکان لێکی دەینەوە. ئەفلاتوون هەروەها بە لێبڕاوەیی کردەی ئەڤینی ژنانیش دەگەڵ یەکتر (هێمۆ سێکسیوالیتە) بەشتێکی خراپ دەزانێ.

ئەوەی لەو نێوەدا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە سوقراتییەکان هیچ ئاماژەیەکیان بەو بابەتە نەکردووە. پاسانیوز pausanius و ئاریستۆفانیش کە بنەمای فەلسەفەکەیان دژایەتییەکی تۆخی دەگەڵ (هێمۆسێکیوالیتە) هەیە کاتێک لەو باسە دەدوێن؛ مەبەستیان عەشقبازیی پیاو دەگەڵ پیاوە لە شوێنی ئەڤینی ئاسمانیی ئافرۆدیت* دا و دڵداری هەردووک رەگەزی ژن و پیاو لەخۆ دەگرن. پاسانێوز عەشقی زەوینی (کە ژنان تێیدا بەشدارن) بەعەشقێک دەزانێ کە هەوەس، کەفوکوڵی رەشۆکیانە و ئاسایی و سێکسی تێدایە و ئەگەر پیاوان خۆ لەو عەشقەبدەن دێنە ئاستی کەسانێکی ئاسایی و رەشۆکی. بەڵام بە بۆچوونی پاسانیوز عەشقی ئاسمانی عەشقێکە، کە بۆ فەیلەسووفان و ژیرەکان و زانایان

* دەست تێکەڵ کردن بەمانای کردەوەی سێکسە.

که لەڕاستیدا پیاوانن سەرچاوەی ئیلهامە و نێربازییش لە فۆرمی ئەم واتایەدا پێشنیار کراوە.

"ئەوینی زەوینی بۆ خۆی سووکە و لە دڵی کەسانی سووکدا هێلانە دەکات... و لە ئاکامی کردەی سێکسی پیاو و ژندا دێتە ئاراوە: بەڵام عەشقی ئاسمانی لە تاقە پیاوێکەوە سەرچاوە دەگرێ و هیچ ژنێک لە دروست بوونیدا نەبووە. هەر بۆیەش تەنیا گرۆیی بۆ کوڕان هەیە و ئەو کەسانەی ئیلهام لەو عەشقە وەردەگرن نەک هەر دڵیان لە کوڕان دەچێ بەڵکو لە جەوهەردا لە ژنان ژیرتر و بەهێزترن. [٢٨]

ئاریستوفان پێیوایە ڕەمزی دوو ڕەهەندیبوونی مرۆڤەکان لەوەدایە کە ئەوان حەزیان لە عەشقبازییە، لەبەر ئەوەی عەشقیان لە خۆیاندا لێ ون بووە و ئەوان هەوڵ دەدەن بیدۆزنەوە. گەیشتن بە عەشق بەدوو شێوەیە: یەکیان بە شێوەیەکی سووک و بێ نرخ، کە پیاوانی سووک و بەڕەڵڵا ئەم ونبوەی خۆیانە لە ژناندا دەدۆزنەوە؛ لە هەمبەر ئەوەدا پیاوانی ژیر و هەڵکەوتوو (ئیلیتەکان) بەشوێن عەشقێکی ئاسمانیدا وێڵن کە جۆرێکی دیکەیە لە عەشق و ڕاستەقینە. ئەم ئەوینە ئاسمانییە تەواو نێرینەیە و پیاوان بە پێی کارامەیی و ئارەزووی خۆیان بە شوێن ئەوەدا وێڵن. لەم ڕووەوە پیاوانی بلیمەت و ئیلیتەکان و زانایانی کۆمەڵگە؛ کە جڵەوی فەرمانڕەواییان بەدەستەوەیە لەم عەشقە ئیلهام وەردەگرن و هۆگری کوڕان دەبن. هاوڕەگەزخوازیی ئەوان واتە عەشقبازیی دەگەڵ ڕەگەزی خۆیان لەبەر ئەوەیە کە ئەو ڕەگەزە نێرینەیە و ئەو پیاوانە لە ژیانی ڕۆژانە و تەنانەت لە عەشقبازییەکەشیاندا سروشتی پیاوانەی خۆیان بخەنەڕوو، هەر بۆیەش وایان پێ باشە کە دەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیان بژین، ئەگەر زەماوەندیش دەکەن و منداڵیان دەبێ تەنیا بەمەبەستی مانەوەی وەچەو تۆرەمەو پاراستنی نەریتی کۆمەڵایەتییانە "بە سانایی دەتوانین لایەنگرانی ئەڤینی ئاسمانی لە خەڵکی دیکە جیا کەینەوە. ئەوانە گرۆییان بۆ ئەو لاوانە هەیە کە ئاسەواری ژیرێتی لە ڕوخساریاندا دیارە و هەرکەسێک دەگەڵ لاوێکی ئەم قۆناغەوە بکەوێتە عەشقبازی، حازرە تەواوی تەمەنی خۆی دەگەڵ ئەودا ڕابوێرێ.[٢٩]



سوقرات لە وتارەکانی خۆیدا جاروبارە دان بە ژیرێتی ژنان دادێنێ، بەڵام هەروا باس لە ئینتما و گرۆیی بۆ عەشقبازیی نێربازییانە دەکا. ئەم هەروەها ئەو عەشقی زەوینییەی کە لە سێکس کردن لەگەڵ ژناندا خۆ دەبینێتەوە و دەبێتە هۆی زاوزێ کردن، بە عەشقێکی جەستەیی و پلە دووی دادەنێ کە مەیلی لە ئافراندن و بەرگرتنی زەین و ڕۆحە.

ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە عەشقبازی دەگەڵ ژنان بۆ پێکهێنانی بنەماڵە پێویستە، بەڵام پێویستە ئەوە لەبیرنەکرێ، کە عەشقبازییەکە دەبێ لەلایەن پیاوانەوە بکرێ، چونکە ئەوە عەشقی پیاوانە کە دەبێتە هۆی خوڵقانی هزر، هونەر، شیعر و یاساکان. بە واتایەکی دیکە ئەو عەشقبازییەی لەلایەن پیاوانەوە بەنیسبەت ژنان دەکرێ! دەتوانێ ببێتە زانست و ڕۆح و جوانی[٣٠].

گریگوری ڤلاستۆس لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە بەکارهێنانی وێنای جەماڵبازی و زایەندخوازی homo sexuality جا لەبەر هەرشتێ بێ دەبێتە هۆی هاوکێش بوونی بۆچوونی هۆمۆسێکسیوالی و مەسەلەی ژنان، کە پاژێکی دانەبڕاوە لەو مەسەلەیە. ئەو لە باسەکەی خۆیدا بەو دەرەنجامە دەگا کە ئایدیای جوانپەرستی کە تەشقی فەلسەفەی عەشقبازییە دەکەوێتە بەرامبەر زایەند خوازی و نێربازییەوە.[٣١] دیارە مەبەستەکەی ڤلاستۆس زۆر ڕوون نییە، ئەگەر مەبەستی ئەو لە جوانپەرستی* جۆرە عەشقبازییەکی ڕۆحی و عارفانەیە ئەوا وەها شتێک لەوتەکانیدا دەرناکەوێ. ئەفلاتوونیش لە بۆچوونی عەشقبازیی جەماڵبازانەی خۆیدا هەر ئەم وێنایەی ڤلاستۆس دێنێتەوە؛ واتە وێنای "بەهەشتی جەماڵبازانە." ئەگەرچی ئەوە وێنایەکی هێمایی و ڕەمزییە، بەڵام ئەفلاتوون لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کردەی لەم چەشنە، کردەیەکی جنسی و فیزیکیی پڕ بایەخە. بۆ وێنە سەرنج بدەنە ئەم بەشەی نامیلکەی میوانیی ئەفلاتوون. ئەوانەی جەستەیان توانایی بەرهەمهێنانی هەیە؛ ژن دێنن و پێیان وایە کە دەتوانن بە هۆی دروست کردنی منداڵەوە خۆشناوی و نەمریی دەستەبەر بکەن. بەڵام

* جوانپەرستی و جەماڵبازی؛ بەو کردەیە دەگوترێ کە پیاو گرۆیی دەبێ بۆ ڕەگەزی خۆی واتە نێرینە تەنیا لەبەر جوانییەکەی و لەم پەیوەندییەدا سێکس کردن وجودی نییە (زایەندخوازیشی پێ دەگوترێ و. ک).

ئەوانەی ڕۆحێکی بەتوانایان هەیە بۆ بەرهەمهێنان و خوڵقاندن (بیرمەندان، نوخبەکان و فەیلەسووفەکان) و خوڵقاندن و زاوزێی ڕۆحییان پێ گەورەترە لە زاوزێی جەستەیی، منداڵ و جگەرگۆشەی ڕۆحی دێننە دونیا. تێدەگەی منداڵی ڕۆحی چییە؟ ئەو کەسانەی خوداکان گەرای زانستگەلێکی وەک شیعر، هونەر و بەڕێوەبەریتی و دەسەڵاتداریتیی خستوەتە مێشکیانەوە؛ ئەگەر باڵق بن (پێ بگەن) و توانایی داهێنان و خولقاندن وەدەست بێنن، لە هەموو شوێنێکدا بە دووی جوانیدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی گەرای خۆیانی پێ بسپێرن، چونکە وەها ڕۆحێک هیچ کات ناتوانێ تێکەڵی چەپەڵی بێ و هەر بۆیەش بەدیتنی بێخەوش و ڕەبەن شاگەشکە دەبن و ئەگەر لەیەکێک لەوانەدا ڕۆحێکی جوان و شیاوێ ڕاهێنان بدۆزنەوە، چێژێکی لەڕادەبەدەر لەم هاوئاهانگییەی نێوان ڕۆح و جەستە وەردەگرن و وەک پەپوولە لە دەوری دەگەڕێن........

بەوشێوەیە دۆستایەتی و ئاواڵێیتی لە نێوانیاندا دروست دەبێ، دۆستایەتی و یەکیەتییەکی زۆر جوانتر و پتەوتر لەو یەکگرتووییەی کە بە هۆی منداڵە جەستەییەکانەوە لە نێوان ژن و پیاودا پێک دێ. جا کێ هەیە وەها منداڵگەلێکی ڕۆحی و مەعنەویی پێ باشتر نەبێ لە ئەولادی جەستەیی."[٣٢] ئەفلاتوون وەک مامۆستایەکی لێوەشاوە وێنا و ویستی زایەندخوازانەی بۆ نوخبەکان و زانایان و بیرمەندەکان (فقها) تێکچنیوە. دۆخ و هەلومەرجی دەسپێکی زایەندخوازی تەنیا ناگەڕێتەوە بۆ کەشی فیکری و کاتیی سەردەمی ئەفلاتوون. ئەو دۆخە لە سەردەمەکانی پێشووشدا کەڵک لێوەرگرتنی وەک یاسایەک (ئایین نامە) ڕەوابووە. بەپێچەوانەی باوەڕی ڤلاستۆس؛ روون و ئاشکرایە کە ئەو، ئەم چەشنە عەشقبازییەی، واتە عەشقبازیی مەعنەوییەی بە ڕێگەیەک زانیوە کە لەوێوە فەیلەسووفەکان بێ ئەوەی توخنی ژن بکەون چێژی خۆیان وەرگرن. دەکرێ هەر لەم روانگەیەوە باوەڕەکانی ئەفلاتوون سەبارەت بە عەشقبازیی پیاوان پێکەوە و عەشقی ڕۆحی و (مەعنەوی) ئاسمانی؛ تاوتوێ بکەین. بەسەرنجدان بە کەلتووری شارستانیانە و ڕۆشنبیرانەی پیاوانی یۆنان وەک: ئەفلاتوون و ئەرەستۆ، لە ڕاستیدا ڕێی تێناچێ* کە ئەوان بتوانن پەیوەندیی

* ڕێی تێناچێ (غیرممک نا ست)



ناڕەوای سێکسییان لە نێواندا بووبێت. ئەگەر هەشبووبێ کارێکی چاوەڕوان نەکراو و سەیرو سەمەرەیە. بەو پێوەر و چەمکە ئەمڕۆییانەی سەبارەت بەجەماڵبازی خراونەتەڕوو، شتێکی سەیرنییە کە ئەفلاتوون لە نامیلکەی فایدرۆس و میوانیدا وەک کارێکی ئەخلاقی، نێربازیی لە جەماڵبازی پێ باشتربووە.[٣٣]

روون و ئاشکرایە کە هەر لە سەردەمی ئەفلاتوونەوە هەتا ئێستاش، هەر لەم روانگەیەوە گەلێک سووکایەتی و بێ حورمەتی بەڕەگەزی مێینە کراوە. لە تیمایۆسدا وتارگەلێکی بە توێکڵ** هەن کە لە پێش وتارەکانی کۆماردا بڵاوکراونەتەوە. ئەفلاتوون لەم وتارانەدا بەو جۆرە لە سەرهەڵدان و سەرچاوەی ڕەچەڵەک و ڕەگەزی مرۆڤ دەدوێ: "خوڵقێنەری جیهان، توخمە پێکهێنەرەکانی ڕۆحی جیهانی تێک هەڵشێلابوو؛ تێکەڵاوییەکی ئەم ماجوونەی بەش بەش کرد و هەر بەشەی خستەسەر هەسارەیەک و ئەو هەسارەیەی بۆ کردە بێشکە و چارەنووس و ڕەگەزێتیی (جنسیت) کۆی جیهانی پێ نیشان دان و دواتر یاسایەکی پێ ڕاگەیاندن کە چارەنووس دیاریی کردووە. ئەو یاسایانە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ بەو شێوەن: سروشتی مرۆڤ لە دوو ڕەگەز پێک هاتووە، یەکەمیان ڕەگەزی مەزنتر بەو تایبەتمەندییانەوە کە دواتر هەرکەس هەیبوایە پێی دەگوترا پیاو، و دووهەمیان، هەوەس و ویست کە تێکەڵاوییەکە لە چێژ و ژان و هەروەها ترس و ئێرەیی و هەرچی لەو چەشنەیە یا ئاکامی ئەم جۆرە شتانە و هەروەها هەرچییەکی پێچەوانەی تایبەتمەندییەکانی پیاوانە. سروشتی ژن ئەم پلەی دووهەمییە وەردەگرێ و ئەگەر لەم ئاستەدا خۆلە خراپە نەبوێرێ؛ هەرجارەی دەچێتە کەوڵی ئاژەڵێکەوە کە لە باری خووخدەوە لە خۆی دەچێ و بەردەوام لە جەستەیەکەوە دەچێتە جەستەیەکی دیکەوە و..."[٣٤] بەواتایەکی دیکە و سادەتر، سروشتی مرۆڤ دووبەشە، بەشی یەکەم ڕەچەڵەک و ڕەگەزی مەزنتر کە بەسەرچاوەی خوڵقان لە قەڵەم دەدرێ و پێی دەڵێن پیاو،[٣٥] ئەوانە کەسانێکن کە لەسەر گۆی زەوی توانیویانە بەسەر هەوەسەکانیاندا زاڵ بن و ژانێکی مەزنانەیان هەبێ و دەشتوانن بگەڕێنەوە بۆ هەسارەکانی چارنووسی

** قسەی بەتوێکڵەوە، واتە؛ قسەیەکی چەند واتایی و پڕ تەوس و توانج. وەرگێڕی کوردی.

خۆیان کە لەوێوە هاتوون. بەڵام ئەو پیاوانەی لەسەر زەوی گیرۆدەی هەوەس و تووڕەیی و ئێرەیی بوونە بەپێی یاسای چارەنووس سزا دەدرێن و ئەم سزایەش ئەوەیە کە یا ببنەژن یاوەک ژن لە دایکبنەوە. بەپێی ئوستوورەی ئەفراندن، مرۆڤ و هەروەک لە "سیپارەی خۆلقاندا" هاتووە ژن لەپیاو هەڵێنجراوە و لە پەراسووی چەپی پیاو دروست کراوە ئەفلاتوون نەک هەر باوەڕی بەم بۆچوونە هەبوو بەڵکو لەسەر ئەم باوەڕەش بوو کە ژن لە جەستەی ئەم پیاوانە هەڵێنجراوە کە لەسەرزەوی تووشی لەرزۆکی و شکست بوون. سزای تێک شکان و لاوازیی پیاوان ئەوەیە ببنە ژن و ئەگەر لەو قۆناغەشدا خۆ لە خراپە هەر نەبوێرن و بەخۆیاندا نەچنەوە بەرەو قۆناغی نزمتر و خوارتر واتە ئاستی ئاژەڵ دادەکشێن و "لەبیچمی ئاژەڵێکدا دێنەوە دونیا کە لە مرۆڤ دەچن، بەڵام خاوەنی خووخدەی شەیتانین". بۆ رۆحێکی نزم و بێ بایەخی وەک ئافرەت تەنیا رێگەی گەڕانەوە بەرەو باشکردنەوە و بەرزکردنەوەی دۆخی نالەباری خۆی؛ ئەوەیە کە هەوڵ بدا لایەنی عەقڵانییەکەی کە لە پیاوەوە سەرچاوە دەگرێ؛ زاڵ بێ بەسەر لایەنی ناعەقڵانییەکەیدا. بەو جۆرە هەروەک دەبینین دەگەڵ دابەشکارییەکی هیرارشیی بەهاکان و چاکەکان و عەقلانییەت رووبەڕووین و لەو نێوەشدا پێگەی ژن کەوتۆتە نێوان مرۆڤ (پیاو) و ئاژەڵەوە.(٣٦) ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکانیدا دەڵێ: "رەگەزی ژن بە هۆی لاوازییە سروشتییەکەی بە شێوەیەکی جەوهەری حەزی لەوەیە کە هەموو کارێک بەنهێنی بەڕێوەبەرێ. جا چونکە ژنان بە هۆی سروشتیانەوە کەمتر لە پیاوان حەزیان لە مەزناهی و چاکەکارییە، ئەگەر بێتو پێشیان بەرەڵڵا بکرێ لە راستیدا نیوەی کۆمەڵگا دەشێوێ هەربۆیەش ئەوان یاسا و رێسایان پێویستە.(٣٧)

ئەفلاتوون جارنەجارێک بەخۆزیا و بریاوە، خۆلقاندنەوەی ئوستوورەی تیمایۆس دێنێتەوە گۆڕێ و هەروەها باس لەڕەوتی سزای پیاو دەکا. بۆ وێنە لەیاساکاندا پێشنیاری کردووە کە ئەو پیاوانەی وا لە ترسان بوونەتە ژن باشتروایە ئەو توێکڵە لە خۆیان دارنن.(٣٨) بە واتایەکی دیکە ئەم بابەت و نووسراوانە کە سەربەکات و شوێنێکی تایبەت نین سەلمێنەری ئەوەن کە ئەفلاتوون بێ لەبەرچاوگرتنی پێگەی کۆمەڵایەتییەکەیان ژنیان لە مەزناهی و



ئاوەزدا بە کەمتر و نزمتر لە پیاو دەزانی. بەشێک لە توێژەرانی زانست کە لەسەر بیرۆکە و باوەڕەکانی ئەفلاتوون لێکۆڵینەوە دەکەن، وایان پێ باشە لە بری وشەی "نزمتر" و "خراوتر" لە بەرهەمەکانی ئەفلاتووندا وشەی "هەتڵە" و "لاڕێ" دانێن و بەو شێوەیە برێک رەفتارەکەی ئەو هاوسەنگر بکەنەوە. بۆ وێنە کۆرن فۆرد دەڵێ: ئەفلاتوون زۆر جاران سەبارەت بەژنان پەیڕەوی شێوەی گشتیی ئاخافتنی ژنانی کردووە و یۆنیسۆن yonison پێیوایە ئەفلاتوون جارنە جارێک باوەڕە پێشڕەوەکانی خۆی لەبیر دەچێتەوە.(٣٩) لەو پەیوەندییەدا پێویستە بگوترێ کە ئەفلاتوون لەو جۆرە کەسانە نەبوو کە بەهاسانی باوەڕەکانی خۆی فەرامۆش بکات بەتایبەت کاتێک ئەو لەسەر مەسەلەیەکی گشتیی وەک ژن دەدوێ. وێڕای ئەوەش دەبێ سەرنج بدرێتە ئەم خاڵە کە زۆر جار جیاوازییەک هەیە لە نێوان هەڵسوکەوتی گشتیی ئەفلاتوون و بیروباوەڕەکانیدا سەبارەت بەژنان کە ئەویش لەژێر کارتێکەریی دژکردەوەکانی کۆمەڵگەی نەریتی یۆناندایە. بۆ وێنە ئەو لە کتێبی کۆمارەکەیدا بۆچوونگەلێکی بنەڕەتیانە (رادیکال)ی سەبارەت بە "ژنانی ولاتپارێز" و "پیاوانی ولاتپارێز"* هێناوەتە ئاراوە کە جیاوازە لە بۆچوونە گشتییەکانی سەبارەت بە ژنان.

* "ژنان و پیاوانی ولاتپارێز" مەبەست ئەو ژن و پیاوانەن کە دەسەلاتیان بەدەستە و پاراستنی ولات و کۆمەڵیان لە ئەستۆیە. (وەرگێڕ)

## بەشی دووەم:

# تاوتوێکردنی مەسەلەی ژن لە ڕوانگەی ئەفلاتوونەوە شاژنە فەیلەسووفەکان و هاوسەرانی تایبەت (خصوصی)

لەڕوانگەی ئەفلاتوونەوە هونەر و ئامانجی سەرەکیی حکوومەت بەختەوەریی چینێکی تایبەتی کۆمەڵگا نییە بەڵکو دوائامانجی دەسەڵات بەختیاریی هەموو چینەکانی کۆمەڵگایە.[١] بەڵام لەو پەیوەندییەدا و بەر لە هەر شتێک پێویستە سەرەتا ئەم وشەیە واتە "بەختیاری" پێناسە بکەین؛ چونکە لەسەر ئەوەی کە ئەو وشەیە لە کوێدا دەبێ کەڵکی لێوەرگیرێ لەوانەیە تووشی لاڕێ بین. ئەگەر بەختیاری بەمانای ئازادیی بیروڕا و لەبەرچاوگرتنی مافی تاکەکەس و یەکسانیی مافی کۆمەڵایەتی بێ؛ پێویستە لەم پەیوەندییەدا بڵێین زۆرمان ماوە بزانین ئەفلاتوون سەبارەت بەمانای بەختیاری چۆنی بیر دەکردەوە. چونکە ئەفلاتوون بەختیاری بە مانای یەکسانی، ئازادی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم نادا و لە راستیدا ئەو چەمکانە بەلای ئەوەوە نایەنە نێو ڕیزی بەهاکانەوە. لە وێنا کردنی دوو شاری ئەفلاتوون واتە یۆتۆپیاو "دووهەمین شار لە ڕووی بەختیارییەوە "سێ بەها هەن کە بریتین لە: یەکسان کردن و ڕێکخستن، لێهاتوویی و کارامەیی، رەوشت چاکی. لەونێوەدا سێهەمین بەها، واتە رەوشت چاکی، کلیلێکە بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی سیاسیی ئەفلاتوون. چونکی ئەو پێی وابوو کە رەوشت چاکی، بەهای جەوهەریی رۆحە و بەو پێیە گرینگترین توخم و هۆکاری سڵامەتییە.

ئەفلاتوون بەختیاریی بە بەرهەمی ئازادیی تاک نەدەزانی. چونکە هەربەپێی وتەکانی خۆی بەختیاری بەبێ یارمەتی وەرگرتن و بەدەستی تاکەکەس وەرناگیردرێ، ئەوە ڕێبەر و فەرمانڕەوایە کە وێڕای ئەوەی پارێزەری رەعیەت و ژێردەستەکانێتی؛ تا ئەو جێیەی سروشتی مرۆیی ئیزنی پێ بدا رەوشت، ئاکار



و کەسێتی خەڵکیش بەرەو چاکە دەبا.[٢] بەو پێیە دوائامانجی ڕێبەر، بەختیاریی تەواوی خەڵک (رعایا) و ژێردەستەکانێتی. لەو پەیوەندییەدا تاقە ڕێگەیەک کە ڕێبەر دەتوانێ پێیدا بگات بەو ئامانجەی، واتە بەختەوەرکردنی خەڵکەکەی خۆی؛ ئەوەیە کە هەمووان هان بدا بۆ فێربوونی ئەو یاسایەی کە لەلایەن ئەوەوە دادەنرێ و بە تەشقی ئاوەز و مەزناهی لە قەڵەم دەدرێ. ڕێبەر لەم قۆناغەدا دەبێ زاڵ بێ بەسەر "لووتبەرزیی خۆیدا"، چونکە خۆپەرستی و فیزلێدانی لە رادەبەدەر گەورەترین هەڵەی مرۆڤە و هەروەها ئەو خۆپەرستییە لە راستیدا لە ناخی هەموو کەسێک دایە و سەرچاوەی تەواوی هەڵەکانە.[٣] بەڵام لە لووتبەرزی خراپتر ئەم رۆحەیە کە حەزی لە خاوەندارێتییە*.[٤] روون و ئاشکرایە ئەرکی سەرشانی سەرۆک و ڕێبەر لەونێوەدا بۆ بەرزکردنەوەی مەزنایەتییەکان (فضیلتها) دوو بەرامبەرە؛ لەبەرئەوەی کە ئەو دەبێ وێڕای ئەوەی زاڵ بێ بەسەر خۆبەزلزانیی خۆیدا، دەبێ بە مەبەستی بەختیاریی رۆح؛ ماڵ و سامانی دونیایە وەلابنێ. کەسێک کە دەیهەوێ مەزن بێ، ناچارە دەبێ هێزی وەلانان و چاوپۆشی کردنی هەبێ لە تەواوی تاسە و هۆگری و حەزەکانی.

گلێن مۆرۆ لەسەر ئەم باوڕەیە کە لە کتێبی کۆمار و یاساکانی ئەفلاتووندا بەڵگەزۆرن کە دەری دەخەن ڕێبەر و سەرۆک بۆ مانەوەی دەسەڵات و دروست بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە دەبێ هەڵسوکەوتێکی گونجاو (نۆڕماڵ)ی هەبێ لەهەمبەر کۆکردنەوە و وەسەرییەکنانی ماڵ و ساماندا[٥]. ئەفلاتوون بابەتی سەرەکیی بەشی هەشتەمی کتێبی کۆماری بۆ مەسەلەی گەندەڵی تەرخانکردووە. ئەو رەوتی داکشانی دەسەڵاتێکی سیاسی لەو گەندەڵییەدا دەبینێ کە لە ئاکامی ماڵ و سامان کۆکردنەوەدا پێک دێ.[٦] هەروەها لە تیۆریی یۆتۆپیاکەیدا ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییانە تاوتوێ دەکا کە بوونەتە هۆی خۆ بەزلزانی و گرۆیی هاووڵاتیان. بۆ وێنە: لەڕوانگەی ئەفلاتوونەوە خاوەندارێتیی تایبەت، هۆکارێکە بۆ بەرژەوەند پەرستی و خۆویستی. بۆیەش دەبێ بەرژەوەندیی تاک لە پێناو بەرژەوەندیی

* ئەفلاتوون پێیوایە مرۆڤ بۆ دەستەبەرکردنی سێ شت دەبێ خۆ ماندووبکا: یەکەم بەرز راگرتنی رۆح، دووهەم: بەرز راگرتنی جەستە، سێهەم: خۆشویستنی ماڵ و سامان.

گشتیدا بتوێتەوە. بەو پێیە لە یۆتۆپیاکەی ئەفلاتووندا نەک هەردەبێ باڵانسی نێوان چینەکان راگیرێ بەڵکو دەبێ بەرژەوەندییەکانیش هاوبەش بن (أشتراک منافع). لە کۆماردا لە زمانی سۆقراتەوە نووسراوە: "ئایا خراپترین شت بۆ کۆمەڵگە ئەو شتە نییە کە کۆمەڵگا لێک بڵاو بکا و تووشی دابەشبوون و چەند بەرەکیی بکا؟ هەروەها ئایا باشترین شت بۆ کۆمەڵگا ئەو شتە نییە کە پاژەکانی پێکەوە گرێبدا و ببێتە هۆی یەکگرتوویی؟" ئەفلاتوون لەو پرسیارەی سوقراتەوە بەو ئاکامە دەگا کە "باشترین کۆمەڵگا، کۆمەڵگایەکی هاوئاهەنگە وەک جەستەی مرۆڤێک (ئۆرگانیزمی جەستە). کاتێک قامکی کەسێک بریندار دەبێ تەواوی گیانی هەست بە ئازاری ئەوزامە دەکا و ئازار دەچێژێ و... ئەو یاسایە هەموو بەشەکانی لەش دەگرێتەوە جا چ ژان و ئازارێک دەگۆڕێ دا بێ چ چێژ و خۆشییەک. کۆمەڵگەی رێکوپێکیش راست وەک لەشی مرۆڤ وایە. هیچ شتێک کۆمەڵگا لە ناو نابا مەگەر ئەوەیکە بەشێک لەخەڵکەکەی شاد و دڵخۆش بن و بەشێکی دیکەی خەمبار.[۷]" بەواتایەکی دیکە یەکگرتوویی و ئۆرگانیزمی کۆمەڵگا کاتێک لێک دەترازێ کە تاقمێک بە ژان و ئازاری خۆیان ئەوانی دیکە بحەسێننەوە. بەرژەوەندیی تاکەکەس ناهێڵێ ئەندامانی کۆمەڵگا یەکسان و یەکگرتووبن. رێگای گەیشتن بە بەرزترین ئاستی یەکبوون ئەوەیە کە تەواوی هاووڵاتیان بە رووداوێک شاد یا خەمبار بن، ئەوەش کاتێک مسۆگەرە کە خاوەنداریێتی و بەرژەوەندیی تاکەکەس نەمێنێ و خاوەنداریێتی هاوبەش بێتەگۆڕێ. لەڕوانگەی ئەفلاتوونەوە باشترین کۆمەڵگا "کۆمەڵگایەکە؛ کە لانی کەمی تەواوی ئەندامەکانی، دەستەواژەی "هی خۆم" و هی ئەوی دیکە" بە تاقانەشتێک و بۆ تاقە واتایەک بەکاری بێنن."[۸] بەوتاوایەکی دیکە ئەو لە یۆتۆپیاکەی خۆیدا هەوڵی داوە خاوەنداریێتی هاوبەش بۆ هەموو چینەکان دابین بکا؛ لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی وەک بنەماڵەیەکی گەورە داناوە. ئەو پێی وابوو مرۆڤەکان لەبەر خۆویستی قازانج پەرستی ئینتمایان بۆ خاوەنداریێتیی تایبەت هەیە و کلیلی چارەسەریی ئەم گرفتە کۆمەڵایەتییە؛ چاوپۆشی کردنی مرۆڤە لە خاوەنداریێتیی تایبەت. بەڵام درۆ زەقەکەی ئەفلاتوون ئەو کاتە دەردەکەوێ کە ئەم قسانەی دەگەڵ ئەو شتانە بەراورد بکەین کە لە یاساکاندا هێناونی. ئەو لە



کتێبی یاساکانا پێچەوانەی قسەکانی خۆی لە کۆماردا هێناوەتەوە و نکۆڵی دەکا لە ئیمکانی لابردنی خاوەنداریێتی لەڕەوتی "دووهەم شار لەڕووی بەختیارییەوە". ئەفلاتوون لە یاساکاندا دەنووسێ: کشتوکاڵ شتێکی هاوبەش نییە، چونکە نەوەی ئێستا بە پەروەردەی ئەمڕۆییەوە هەڵگری ئەوە نییە کێڵگەی هاوبەشی هەبێ.[۹] بۆیەش چونکە هاووڵاتیان کە لە "دووهەم شاری بەختیاری" دا جیکڵدانەی ئەوەیان نییە لەو خاوەنداریێتییە هاوبەشە تێبگەن کە لە یۆتۆپیا (یەکەم شار) دا هەیە پێویستە بخرێنەبەر پەروەردە و راهێنانێکی سیستماتیک و رێکوپێک بۆ ئەوەی ئامادەی تێگەیشتن بن لە ئارمانشار (یۆتۆپیا). لەو نێوەدا تەنیا پارێزەران واتە (تاقمی دەسەڵاتدار)ن کە چونکی پەروەردەکراون، شیاوی ئەوەن لە یۆتۆپیادا بژین و لە خاوەنداریێتیی تایبەت و خۆشییەکانی تر کەڵک وەرگرن".[۱۰] زاڵبوون بەسەر خۆبەزلزانی و خۆویستیدا بۆ ئەوانەی بەرێوەبەری کۆمەڵگا و بەرپرسی دابینکردنی ژیانی خەڵکن زۆر پێویستە و لەو پەیوەندییەدا دەسەڵاتداران تەنیا دەبێ مشوری دابینکردنی ژیانی خەڵک بخۆن و تەواویان بە چاوێک چاو لێکەن و جیاوازییان لە نێو دانەنێن. ئەو لە کۆماردا دەڵێ:

"ئەگەر ئیزنی بوونی ماڵ و پێداویستیی ژیان دەدرێ بە دەسەڵاتداران دەبێ تا ئەو جێیەبێ کە نەبێتە لەمپەر لە بەردەم راپەڕاندنی ئەرکەکانیاندا و وایان لێ نەکا دەستدرێژی بکەنە سەر خەڵک و ئازاریان بدەن."[۱۱] ئەفلاتوون پێیوایە کە "ماڵ و سامان و خاوەنداریێتیی تایبەت؛ بڵێی و نەڵێی دەبێتەوە هۆی پەرش و بڵاوی و کەلێن تێکەوتن لە نێوان خەڵک و دەسەڵاتداران و بەجێی ئەوەی بیانکاتە دۆستی یەکتر لێکیان دەکاتە دوژمن.[۱۲] وێڕای ئەوەش تێکەڵاوبوونی ماڵ و بەرژەوەندیی شەخسیی دەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی، دەبێتە هۆی کاولبوونی یۆتۆپیا.

ئەفلاتوون بەو ئاکامە دەگا کە دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگا دەبێ لە ماڵ و ساماندا شەریک و برابەش بن چونکە بەپێی مەسەلی بەناوبانگی یۆنان "دۆستان هەموو شتێکیان پێکەوەیە."[۱۳] بۆ پێکهێنانی یەکگرتوویی لە شاردا* و پێشگرتن لە

* مەبەستی ئەفلاتوون لە "شار" "دەوڵەتەکان" یا کۆمەڵگە سیاسییەکانن. چونکە یەکەی سیاسیی لەسەردەمی ئەودا شاربووە. (وەرگێڕی فارسی)

دووبەرەکی، خاوەندارێتیی هاوبەشی ژن و منداڵ* دێنێتە گۆڕێ و پێیوایە ئەم جۆرە خاوەندارێتییە دەتوانێ یارمەتیدەری وڵات بێ بۆ گەیشتن بە بەختیاری.

بەواتایەکی روونتر بەپێی بۆچوونی ئەفلاتوون؛ هیچ دەسەڵاتدار یا سەرۆکێک ناتوانێ ژن یا منداڵێک دەسنیشان بکا و بڵێ ئەو ژنە یا ئەو زارۆکە ئی منە. بەڵام تەواوی دەسەڵاتداران دەتوانن ئاماژە بە تەواوی ژن و منداڵە هاوبەشەکانیان بکەن و بڵێن: "ئەو ژنانە و ئەو منداڵانە ژن ومنداڵی ئێمەن." ئەفلاتوون بە راشکاوی دەڵێ: ئامانجی ئەو سیستەمە بەرهەمهێنانی یەکیەتی و یەکگرتوییە لە نێوان دەسەڵاتداراندا؛ چونکە بە دابینکردنی بەرژەوەندی و سۆز و پەیوەندییە هاوبەشەکانی نێوانیانەوەیە کە دەکرێ بەو ئامانجە بگەی. بێ گومان مەبەستی راستەقینەی ئەفلاتوون لەو رێوشوێنەی پێشنیاری دەکا ئەوە بووە کە وەها هەستێکی یەکبوون لە نێوان ئەندامانی چینی دەسەڵاتداردا پێک بێ لێرەدا تەواو ئاشکرایە کە مەسەلەی بەرژەوەندیی هاوبەش کە ئەفلاتوون مەبەستێتی؛ بە تەواو مانا بە واتای لەناوچوونی بنەماڵەیە. ئەم باوەڕە هیچ جیاوازییەک دانانێ لە نێوان دوو بابەتی بەرژەوەندیی هاوبەش و ژنی هاوبەش کە پێویستە بە جیا و سەربەخۆ تاوتوێ بکرێن.

لەبەر ئەوەی کە مەسەلەی یەکەم واتە بەرژەوەندیی هاوبەش پێشەکییەکە بۆ تێداچوونی بنەمای بنەماڵە واتە بابەتی دووهەم. ئیدی روون و ئاشکرایە نەبوونی جیاوازیی نێوان ئەم دووانە یەکەمین بڵێسەی لەناوبردنی بناخەی بنەماڵە دادەگیرسێنێ.(١٤)

لە کتێبی یاساکاندا، لەو شوێنەی ئەفلاتوون باس لە تایبەتمەندییەکانی دامەزراو و ناوەندگەلی نێو یۆتۆپیا دەکا پێگەی ژنانی هێناوەتە ئاستی منداڵان و کەلوپەل و زۆر جاران باسی لە "ژنی هاوبەش؛ منداڵان و کۆیلە و ئاژەڵ" کردووە. وێڕای ئەوەش ئەو کەمتر حەزی لێ بووە یا دەبێ بڵێین هیچ مەیلی نەبووە باس لە مافی تاکەکەسیی ژنان بکا.(١٥) هەروەک وترا، لە پۆلێن بەندیی ئەفلاتووندا ژنان بەشێکی گرینگن لە ماڵ و سامانی پیاوان.(١٦) و لە روانگەی

* ژنی هاوبەش: لێرەدا مەبەست لەوەیە ژن تاقە مێردێکی نەبێ و هاوبەشی چەند کەس بێ. (وەرگێڕی کوردی)



ئەوەوە هەرچەشنە موڵک و ماڵێکی تایبەت، تێکدەر و کاولکەری کومەڵگایە و ئەو مڵک و ماڵە تایبەتە تەنانەت ژنانیش* لەخۆوە دەگرێ. هەر بۆیەش؛ بوونی "ژنی تایبەت بەخۆ" واتە ژنی یەک مێرد؛ دەبێتە هۆی دووبەرەکی و لێکترازان و لە ئاکامدا کاولبوونی کۆمەڵگەی لێدەکەوێتەوە و دوای ئەوەش هەر یاسایەک کە رەوایی بدا بە مڵکدارێتی و باس لە لایەنە باشەکانی بەرژەوەندیی تایبەت (تاک) و تاک ژنی بکات، وەک دوژمنی یەکپارچەیی و یەکگرتوویی وڵات چاوی لێدەکرێ و دەبێتە هۆی لێک دوورکەوتنەوە و کەلێن تێکەوتن لە نێو هاووڵاتیاندا. بۆ وێنە ئەفلاتوون لە کۆماردا دەڵێ: "ئەگەر یاساکان دەگەڵ بوونی ژن و منداڵی هاوبەش تەبا بن دەبێتە هۆی ئەوەیکە وریایی دەسەڵاتداران لەوپەڕی خۆی دابێ و مەترسیی لە ناوچوونی کۆمەڵگا نەمێنێ؛ لەبەر ئەوەی ئەگەر هەر کام لە دەسەڵاتداران شتێکی تایبەت بەموڵکی خۆی بزانێ و هەرچی وەدەستی کەوێ بۆ خۆی پاشقول** بدا و ژن و منداڵی تایبەت بە خۆیشی هەبێ: ئاکامەکەی دەگا بەوەیکە خەم و خۆشییەکانی ئەو لە خەم و خۆشیی هاووڵاتیان جیابێتەوە. ئەفلاتوون سەبارەت بەمە دەڵێ:

"گوتم: (ئەفلاتوون) ئایا ئەگەر دەسەڵاتداران ژن و منداڵیان هاوبەش بن ئەوە نابێتە رێگەیەک بۆ ئەوەی لە خەم و خۆشیی یەکتریشدا شەریک بن؟

گوتی: بۆچی ئەوە هۆکارێکی بنەڕەتییە.

گوتم: پێشتر گوتمان کە بەشداربوون لە خەم و خۆشیی یەکتردا، باشترین شتە بۆ کۆمەڵگا... ئێستاش دەرکەوت کە هاوبەش بوونی ژن و منداڵیش هۆکاری سەرەکی ئەو شتەیە کە بۆ کۆمەڵگا باشترین شتە."(١٧)

ئەفلاتوون هەروەها لە کتێبی یاساکاندا بیروباوەڕی ئەسینییەکان سەبارەت بە مڵکداری و خاوەندارێتیی تایبەتیی ئافرەت بەشتێکی بێ بنەما دەزانێ و دەنووسێ: باشترین رێکخراوی کۆمەڵایەتی و کامڵترین حکوومەتەکان ئەوانەن کە نەک هەر مڵک و ماڵەکانیان بەڵکو ژن و منداڵیش لە نێوانیاندا بەشی هەمووان

* واتە؛ ژنانیش نابێ ژنی یەک مێرد بن و تایبەت بە کەسێک بن. (وەرگێڕی. کوردی)

**پاشقول دان: واتە هەڵگرتن و گێڕانەوەی شتی باش کە لەڕاستیدا هی کەسێکی دیکەیە. بەفێڵ و گزەماڵی خەڵک خواردن. (وەرگێڕی کوردی).

بن و خاوەندارێتیی تایبەت لەهەر چەشن و هەر چۆنێک بێ لە ناوبچێ و داب و نەریتی ئێمەی (ئەسینی) ئاوایە کە ماڵ و سامانەکەمان لە ژوورێکدا کۆدەکەینەوە و ژنان دەکەین بە زێرەڤان و چاودێریان.[١٨]

ئەفلاتوون پێیی وابوو کە زەماوەندکردن و رۆڵی نەریتیی ژنان و لە پەنا ئەوەشدا یاساکانی زەماوەند و تایبەتی بوونی خاوەندرێتیی ژنان، دەبێتە هۆی ئێرەیی و قین و تووڕەیی لە نێو هاووڵاتیاندا و دووبەرەکییان دەخاتە نێوان. هەربۆیەش؛ هاوبەش بوونی ژنان نەک هەر ناهێڵێ دوژمنایەتی و ناتەبایی بکەوێتە نێو کۆمەڵگا بەڵکو ئاسوودەیی و بەختەوەریش بۆ کۆمەڵگا دەستەبەر دەکا. ئەو لە کتێبی هەشتەمی کۆمار و لە لێکۆڵینەوەیەک لە دوای یەکەکانیدا فۆرم و شێوەکانی داکشان و گەندەڵ بوونی حکوومەتەکانی تاوتوێ کردووە. ئەو لەم تاوتوێکردنانەدا بەو ئاکامە گەیشتووە کە داکشان و تێداچوونی حکوومەتەکان پەیوەندیی هەبووە بە خاوەندارێتیی تایبەتی ژنەوە (واتە هەبوونی ژنی تایبەت).[١٩] بەواتایەکی دیکە؛ ئەفلاتوون پێیوایە کاتێک کە دەسەڵاتداران خەریکی کۆکردنەوەی ملّک و ماڵ و زێڕ و زیو و هێنانی ژنی تایبەت بەخۆیان بن؛ رەوایی دەسەڵات و وڵاتپارێزی لەدەست دەدەن و بەوجۆرە داکشان و گەندەلیی وڵات دەست پێدەکا.

ئەفلاتوون لە شوێنێکی دیکەدا باس لە کوڕێک دەکا کە دەبوایە خەسڵەت و تایبەتمەندییە دەروونییەکانی پیاوێکی هەبێ. دەڵێ ئەو منداڵە لە ئاکامی ململانێی پاژەکانی رۆح- دا (کە دابەشبوون بەسەر بەشی مەزن- نێوەنج و خوارەوە) گەشە دەکاو هەڵدەدا. لەلایەکەوە دایک و قەرەواشەکان کە بەدەوریوەن ژینگەیەکی گەندڵی بۆ دروست دەکەن و لەلایەکی دیکەوە باوک لە هەولی ئەوەدایە بەشی ئاوەزمەندیی رۆحی ببزوێنێ و دەراو خۆش بکا بۆ بزواندن و هاندانی وارسکەکانی بە مەبەستی وەخەبەر هێنانی ورە و تووڕەییەکەی. ئەو کوڕە لە نێوان ئامۆژگاریی لەرزۆک و نزمی ژنانەدا کە لە دایکی و قەرەواشەکانی فێربووە و هەروەها ئامۆژگاریی و نسحەتی ژیرانەی باوکیدا رێگەیەکی "نێوەنج" هەڵدەبژێرێ و جڵەوی خۆی دەداتە دەست پاژی نێوەنجی رۆحی خۆی و دەبێتە کابرایەکی لووتبەرز، دەسەڵاتخواز و گەندەڵ. ئەفلاتوون



لە کۆماردا، لە زمانی سۆقراتەوە لە وتوویژ دەگەڵ ئادیانتۆس دەنووسێ: "لەلایەک دایکی سکاڵا (لەلای کوڕەکە)ی دەکا کە مێردەکەی پلەوپایەی حکوومی و دەوڵەتیی نییە، بۆیە ژنان بە چاوی سووک لێی دەڕوانن. لەلایەکی دیکەشەوە بە هۆی ئەوەیکە مێردەکەی نەپلەوپایەی هەیە و نەماڵ و سامان، ئەوا بەردەوام (دایک) لە گوێی کوڕەکەی دەخوێنێ کە باوکێکی بێ دەسەڵات و دەستەوستانی هەیە و بەو جۆرە گوێچکەی دەئاخنێ لە پرتە و بۆڵە و سکاڵای ژنانە."[٢٠] بەواتایەکی دی ئەگەر بوو بە پیاوێکی خۆبەزلزان و (رەوشتنزم) و گەندەڵ؛ یەکەم هۆکارە لەبەر ئەوەی بە ئامۆژگارییە ژنانەییەکانی خۆی ئەو رێگەیەی پێشان داوە. بەڵام ئەگەر ئەم کوڕە بە جۆرێکی دیکە و لە بنەماڵەیەکی دیکەدا گەورەبوایە و لە شێواز و مێتۆدێکی دیکە بۆ فێربوون و پەروەردە کەڵکی وەرگرتبایە؛ نەدەکەوتە نێو گەندەڵییەوە کە ئەوەیش هۆی نەبوونی هاوبەشییە لە ماڵ و ژن و منداڵدا. لێرەدا بۆ تێگەیشتن لەو هاوبەشێیەی ژن و ماڵ و سامانە؛ دەبێ ئەو خاڵە لەبەر چاو بگرین کە ئەفلاتوون لەسەری پێداگر بوو بۆ ئەوەی پێکهاتەی بنەماڵەیی چینەکانی سەرەوەی ئاسینا بناسین. هەروەکی پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد ئەوکات ژنانی ئاسینی بەشێک بوون لەملّک و ماڵی پیاوان و لە ریزی ملّک و سامانەکاندا واتە لەریزی کۆیلە و ماڵات و ئاژڵەکاندابوون."[٢١] ئەو توێژەرانەی لە ژیانی ئەوکاتی یۆنانیان کۆڵیوەتەوە لەسەر ئەو باوەڕەن کە پەیوەندی و هەڵسوکەوتێکی ئاسایی لە نێوان ژن و مێرد دا نەبووە. ئەم پەیوەندییانە چ لەبیروڕاگۆڕینەوەدا و چ لە کردەی سێکسدا، بەوجۆرە نەبووە کە ئێمەبیری لێدەکەینەوە بۆ وێنە لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمدا لە ئەسینا ناوەندێکی وەک بنەماڵە لە گۆڕێدا نەبووە و هەر بۆیەش "زەماوەندی فەرمی"ش لە نێو هاووڵاتیاندا نەبووە. ئەگەر لە نووسراوە یۆنانییەکاندا باس لە بنەماڵە ناکرێ یا بەدەگمەن ئاماژەی پێدەکرێ هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمی بنەماڵە.[٢٢] هەروەها دەبێ ئەوە بزانین کە لەو کاتەدا جۆرێک پێکەوە ژیانی دوو رەگەزێتیی (نەنێر نەمێو)ی باو بووە. بەواتایەکی دیکە جەماڵبازیی*

---

* جەماڵبازی: تەنیا خۆشویستنی هاوەڕگەزە بە شێوەیەکی خۆشویستنی ئیستاتیکی و هیچ کردەیەکی سێکسی دەگەڵ نییە. "وەگێڕ"

(نێرخوازیی) ئاوەزمەندانە لە نێو پیاوماقوولانی کۆمەڵگادا کە ئەفلاتوونیش یەکێک بووە لە ئەوان باو بووە و بە چاولێکەری لەوە؛ ئەم جەماڵبازییە لە چینەکانی خوارەوەدا دەبوو بە نێربازی."[٢٣] روون و ئاشکرایە کاتێک سەنتەری بنەماڵە هیچ پێگەیەکی نەبوو لە نێو چینەکانی سەرەوە و ئیلیتەکانی یۆناندا، ئیدی پەرش و بڵاوی و بێ سەرەوبەرەیی لە کۆمەڵگادا دوو ئەوەندە دەبوو. سەنتەری بنەماڵە بە واتای "ئەو کەسانەی پێکەوە دەژین" لەو دواییانەدا و ئەویش بە شێوەی ڕێژەیی لە نێو هۆز و خێڵەکاندا سەری هەڵداو وردە وردە بوو بە وەفاداری بەشار (وڵات). بەواتایەکی دیکە، ڕۆڵی بنەماڵە کە سەرەتا؛ سەربە هۆز و عەشیرەتە سەربەخۆکان بوو جێی خۆیدا بەوڵات. بۆ وێنە ئانتیگۆنێ- ئەو کیژەی دەگەڵ باوکە کوێرەکەی چووە ئاتیکا و هەتا باوکی مرد خزمەتی کرد- نموونەی ئەم جۆرە وەفادارییە پارادۆکسیکاڵ و ناتەبایە بوو. چونکە روون نییە کە خزمەتکارییەکەی ئانتیگۆنێ بە پێی دابونەریتی بنەماڵەیی بووە یا بەپێی یاسا دەوڵەتییەکان بووە؟

لە کتێبی یاساکاندا باس لەوە دەکرێ کە ڕادە و ئاستی ئەو سزایانەی کە لەلایەن دادگاکانەوە دیاری دەکران، زیاتر بوون لەوەندە سزایەی کە بنەماڵەی کوژراوێک دەسنیشانیان دەکرد.[٢٤] هەروەها هەر لەو کتێبەدا دەیخوێنینەوە کە بەڕێوەچوونی دادپەروەری (عەدالەت) سەرووترە لە ئەرکی باوک و عەولادی (منداڵی)، چونکە لە لیدوانێکدا کە ئۆتیفرۆن دەگەڵ سوقرات دەیکا، سکاڵایەک لە دژی باوکی دەداتە دادگا لەبەر ئەوەی کۆیلەیەکی کوشتووە.[٢٥] دەبێ سەرنج بدرێتە ئەم خاڵە، کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمدا لە یۆنان، وێڕای ئەوەی ئەندامانی بنەماڵە یەکتریان خۆشویستووە و سۆزیان بۆ یەکتر بووە؛ بەڵام بەجێگەیاندنی ئەرک بەکارێکی گرینگ لە قەڵەم دراوە. ئەم ئەرک بەجێگەیاندنانە؛ ئەو کارە دەروونیانە بوون کە بەجوانی پیشاندەری وەفاداریی ئەندامانی بنەماڵە بە یاساکانی وڵات بوون. ئەو توێژەرانەی بێزارییان دەربڕیوە بە نیسبەت ئەو بیرو بۆ چوونەی ئەفلاتوون کە پێی وابوو دەبێ سەنتەری بنەماڵە تێکدرێ و زەماوەندێکی کاتی بۆ زاوزێی باشتر (نەژادی ڕەسەن) جێگەی بگرێتەوە؛ تووشی هەڵەیەکی گەورە بوون. چونکە ئەوان بە جوانی ئاگاداری چۆنێتی چوارچێوەی بنەماڵە و ژیانی ئاسینییەکانی ئەوکات نین.



بۆ نموونە؛ سی ئێف گروپ C. F. Grube دژی یاسای هاوسەری سیارواتە زەماوەندی کاتییە بۆ بەرپرسانی وڵات (دەسەڵاتداران) و بە کارێکی "ناشیرینی دەزانێ کە دەبێتە هۆی برینداربوونی هەستی مرۆیی" و "بە تەواوی نکوڵی دەکا لە تۆخمی عەشق و خۆشەویستیی ئەو دوو کەسەی ژیانی هاوبەشیان پێکهێناوە". وێدەچێ گروپ لە بیری چووبێ کە لەوکاتدا سەنتەر و چوارچێوەی بنەماڵە جێگەی دەربڕینی هەستی گەرمی مرۆیی نەبووە. خوێندنەوەیەکی سادەی نامیلکەی میوانی و بەراودکردنی ئەو کەسانەی عەشق و خۆشەویستیی خۆیان بەنیسبەت ژنان و ئەندامانی بنەماڵە دەردەبڕی دەگەڵ ئەوانەی بە شێوەی مەعنەوی (جەماڵبازی) کوڕانی گەنجیان خۆش دەویست (ئەڤینی فەیلەسووفانە و ئاوەزمەندانە) بە جوانی دەریدەخا کە ئەفلاتوون و لایەنگرەکانی تێکچوونی چوارچێوەی بنەماڵەیان وەک ئاستەنگێکی ژیانی تایبەتی (خصوصی) بەلاوە گرینگ نەبوو.

کلۆد لیڤی شتراوس لەسەر ئەم باوەڕەیە کە چوارچێوە و سەنتەری بنەماڵە بە شێوەی "سروشتی" هەر هەیە و ئەفلاتوون بۆ پێکهێنانی یۆتۆپیاکەی بە پێویستی دەزانێ کاولی بکا.[٢٧] ئەو بۆ سەلماندنی ئیدعاکەی خۆی بەڵگە لە چەند لاپەڕەیەکی کۆمار دێنێتەوە کە مرۆڤەکان هەر بە شێوەیەکی سروشتی حەزیان لێ بووە بنەماڵە و ژن و منداڵی خۆیان هەبێ. بەڵام دەبێ بگوترێ کە شتراوس نەک هەر بێخەبەر بووە لە دۆخی چوارچێوەی بنەماڵەیی سەردەمی ئەفلاتوون بەڵکو تەنانەت ئەو بەڵگانەی بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیشی دەیانهێنێتەوە تەواو نین. بەتایبەتی نارەزایەتی و دژایەتیکردنی ئەو بە نیسبەت ئەوەی کە کۆنترۆڵکردنی ئاکاری "جەماڵبازانە" لەلایەن ئەفلاتوونەوە بەمانای "سەرکەوتنی وارسکە و ویستە جنسییەکانە" و نیشاندەری نکوڵی کردنە لە تەواوی وارسکە جنسییەکانی نێربازانەی ئەوکات.

خوێنەرانی بەرهەمەکانی ئەفلاتوون زۆر وێدەچێ سەرنجیان دابێتە ئەو خاڵەی کە: لە یۆتۆپیادا ئەو ئاستەنگانەی بۆ هەڵسوکەوتی نێربازانە دانراون گەلێک زیاترن لەو بەربەست و ئاستەنگانەی بۆ وێران کردنی بنەمای بنەماڵە و نیزیکایەتیی جەماڵبازانە لە گۆڕێدان. توێژەرگەلێکی وەک: گروپ، تیلوێر و لیڤی

شتراوس؛ کە پێیان وایە سەنتەری بنەماڵە وێران ناکرێ؛ لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە نکوڵی دەکەن لە تێوریی کاملبۆونی نەژادی مرۆڤ دەکەن و بە کارێکی نەکردەی (محاڵ) دەزانن بۆ سروشتی مرۆڤ[٢٨]. جێی خۆیەتی ئەم توێژەرانە سەرنج بدەنە پێگەی ژن لە یۆنانی کۆندا. لەوکات دا ئەوە پیاوان بوون کە بۆ دامرکاندنەوەی حەز و چێژی سێکسیی خۆیان ژنیان هەڵدەبژارد و ژنان بێبەری بوون لە مافی هەڵبژاردنی هاوسەر و هاوخەوی خۆیان. بەواتایەکی دیکە ژنی یۆنانی بە هیچ شێوەیەک ئیزنی ئەوەی نەبوو مێردی خۆی هەڵبژێرێ؛ لەبەر ئەوەی؛ ئەوە پیاو بوو کە نەک هەر مافی سێکس کردن و بڕیاری منداڵ دروست کردنی هەبوو، بەڵکو بۆ کۆنترۆڵ کردنی ژنەکەشی دەستی تەواو ئاوەڵابوو. هەروەک چۆن باوکی کچەکەش لەوەپێش ئەو مافەی هەبوو. سێکس کردن دەگەڵ کەسێکی بێجگە لە مێردەکەی خۆی، بۆ ژن دەبوو بە تاوانێکی گەورە و نەبەخشراو؛ چونکە لە باوەڕی کەلتووری یۆنانیدا ژن دەبوو تەواو لەبەردەستی مێردەکەی خۆی دابێ. بەڵام لەلایەکی دیکەوە ئەگەر پیاوێکی خێزاندار نزیکایەتیی ژنێکی دیکەی کردبایە یا جەماڵباز یا منداڵباز بوایە، کارەکەی پاساو هەڵگر و ئاسایی بوو. بەواتایەکی دیکە؛ هەڵەی ژن لەوەدا کە پیاوێکی دیکە چووەتە پاڵی دەبوو بە پینەی سەرشانی و جێگەی لێ خۆش بوون نەبوو. بەڵام پیاو مافی ئەوەی هەبوو بۆ دامرکاندنەوەی ئاوری هەوەس و چێژی جنسی خۆی چیی حەزی لێبوو بیکا. ئەم پێوەرە دوو لایەنە لە وشەی زیناح کاردا (adultery) بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو خۆ دەنوێنێ. ئەم وشەیە کە لە راستیدا وشەیەکی گریکییە بە کردەیەکی سێکسی دەگوترێ کە ژنێکی بە مێرد دەگەڵ کابرایەکی بێجگە لە مێردەکەی دەیکا. لە یۆنانی کەوندا ئەگەر ژنێک مێردەکەی مردبایە؛ ئیتر هیچ ماف و دەسەڵاتێکی بەسەر ژیان و لەشی خۆیەوە نەدەما. چونکە لەرێوە دەکەوتە ژێردەسەڵات و سەرپەرشتیی باوک و سەرپەرشتیارەکەی و ئەوە ئەم سەرپەرشتیارانە بوون کە بڕیاریان دەدا لەسەر شووکردنەوەی ئافرەتەکە. لەوکاتدا شوکردنی کاتی (مسیار) جێگرەوەیەک بوو بۆ زەماوەندی فەرمی و هەمیشەیی. هاووڵاتییەک دەیتوانی خوشک یا کچەکەی خۆی بەشوو بدات جا ئەگەر دەرەنجام و ئاکامی ئەم کارە بە لەشفرۆشیش



گەیشتبایە نەدەبووە هۆی لۆمەکرانی خاوەنەکەی کە پیاوێک بوو.[٢٩] ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە ژنانی چینەکانی سەرەوەی کومەڵگای یۆنان لە بارودۆخێکی کەلتووری کۆمەڵایەتیی لەباردا دەژیان؛ ناتەبایە دەگەڵ سیستەمی زەماوەندی ئەفلاتوونی و خستنەڕووی "تیۆریی پێداویستییەکانی سروشتی مرۆڤ."

بێگومان زۆر شت لەسەر "رەگەزی ژن" دەگوترێن کە هەمووی لەڕابردووی دووری مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرن. لەڕاستیدا؛ ژیانی "جنسی"ی ژنان لە رەوتی زەماندا هەر هاتووە و بەرتەسکتر کراوەتەوە و بەردەوام ئاستەنگە جنسییەکانی ژنان و هەستی پڕ لە خرۆش و کەفوکوڵی ئەوان گرێ دراوتەوە بەمەسەلەی ئەخلاقییەوە. ئەو شتەی لەو نێوەدا دەبێ سەرنجی بدرێتێ ئەوەیە کە بۆچی تەنیا "ئیحساساتی پڕ کەفوکوڵی مرۆڤ" و "سروشتی مرۆڤ" کە بەبێ هیچ ئاستەنگ و بەرتەسکییەک پیاوانیش لەخۆدەگرێ بەڵام کاتێک هەر ئەم تایبەتمەندییانە بۆ ژنیش دێنە پێشێ دەچنە خانەی مەسەلە ئەخلاقییەکانەوە و دەبێ کۆنترۆڵ و بەرتەسک بکرێنەوە؟ چ شتێک گروب، تیلوێر و لیڤی شتراوسی پەرۆش و نیگەران کردووە؟ ئایا بۆ ئەم توێژەرانە ئەوە جێی پەرۆش بوون و نیگەرانی نییە کە یۆنانییەکان وێڕای ئەوانیش خەڵکی وڵاتانی دیکەش تەنیا بە مەبەستی زاوزێ کردن ژن راگرن و بەردەوام ژیانیان بخەنە ژێر چاوەدێرییەوە؟ ئایا ئەوە جێی نیگەرانی و پەرۆش بوون نییە کە ئەفلاتوون لایەنگرەکانی بێنێتە سەر ئەوەی کە ژیانی جنسیی (سێکس) پیاوان و ژنانی دەسەڵاتدار دەبێ بۆ زاوزێ کردن و نەژادی مەزنتر لەکۆمەڵگادا، بخرێنە ژێر چاوەدێرییەوە؟

هەروەک ستانلی دیامۆند stanley Diamond لە وتاری رۆشنگەریی خۆیدا ئەوە پشت راست دەکاتەوە کە: ئاکار ناسیی ئەفلاتوون بەنیسبەت دەزگای بنەماڵەوە و هەروەها تیۆرییەکەی سەبارەت بە کاولکردنی ئەم دەزگایە و ئەوەیکە "وڵاتپارێزان و دەسەڵاتدارن واباشە لە هەر پەیوەندی و هانەیەکببوێرن کە بەنیسبەت پاراستنی دەسەڵاتەوە کەمتەرخەمیان دەکا (وەک پێکهێنانی ژیانی هاوبەش)، لەبەر ئەوەیە کە ئەفلاتوون کاروباری حکوومەتی دەخاتە پێش هەموو کارێکی دیکەوە و لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە حکوومەت و ژیانی بنەماڵەیی دوو

شتی پێک ناکۆک و لێکدژن و پێویستە بەمەبەستی وەفاداریی تەواو و بێ خەوشی بەرپرسان بۆ دەسەڵات، دەزگای بنەماڵە لێکهەڵوەشێتەوە.[٣٢] گرینگ ئەوەیە کە بزانین ڕێگەچارەی شۆڕشگێڕانەی ئەفلاتوون سەبارەت بەناتەباییەکان و لەناوبردنی ئاڵقە سەرەتاییەکانی خزمایەتی هەروا بە ئاسانی مەیسەر نەدەبوو، بەڵام بووە هۆی ئەوەی کە ئەم باوەڕە تەشەنە بکاتە نێوچینی دەسەڵاتدارەوە. لەڕاستیدا وێنا کردنی بنەماڵەیەک لە نێو دەسەڵاتدا و پێکهێنانی چینی دەسەڵاتدار تەنیا کارێکی رواڵەتی (تەشریفاتی) نەبوو بەڵکو لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە.[٣٣] لە کتێبی کۆماردا هاتووە: "ئەوان (ئەندامانی شاندی دەسەڵاتدار) نەک هەر یەکتر بە خزمی خۆیان دەزانن، بەڵکو چاویان بە هەرکەسێک دەکەوێ پێیان وایە برا، خوشک، باوک، دایک یان نەوەی خۆیان دەبینن. گاڵتە جاڕ ئەوەیە کە یەکێک بەخزمی خۆیان بزانن، بەڵام بەکردەوە مافی خزمایەتییەکەی لەبەرچاو نەگرن."[٣٤] تەنیا ترس و شەرم لە یەکتر دەبێتەوە هۆی ئەوەی بەبێ ئیزنی سەرۆک هیچ کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر ئەوی دیکە. شەرم لەوەیکە نەکا سووکایەتی بکرێ بەوکەسانەی ئەویان بووە (دایک و باوک). ترسیش لەوەی ئەگەر بێتو زوڵم لە یەکێک بکا لەوانەیە ئەوانەی خۆیان بەکوڕ، برا، یان باوکی ئەو کەسە دەزانن بەدەنگییەوە بێن و لەسەری بکەنەوە. بەوپێیە شەڕ و تێکهەڵچوون لە نێوان بنەماڵەی تاقمی دەسەڵاتدار (چاودێر) دا نایەتە پێشێ. سەرکەوتنی وڵاتێکیش لە شەڕدا بۆیە مسۆگەر دەبێ کە ئەوان خۆیان بە ئەندامی یەک بنەماڵە و وڵات دەزانن و لە فەرمانی فەرماندەرەکەیان خۆنادزنەوە.[٣٥] هەر وەکی گریگۆری ڤێلاستۆس وتوویەتی: "کۆمەڵگای ئایدیالیی ئەفلاتوون لە کۆماردا، کۆمەڵگەیەکی سیاسییە و بە عەشقی برایانەوە بەڕێوە دەچێ.[٣٦]

ئامانج و مەبەست لە تاوتوێکردنی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە روونی کەینەوە کە تێگەیشتنی بنەڕەتی (رادیکاڵ) لەچەمکی رۆڵی ژنان، بووەتە هۆی ئەوەیکە ئەفلاتوون تیۆریی گۆڕانی بیچمی (فۆرم) چینی چاودێر (دەسەڵاتدار) وەک بنەماڵەیەک بێنێتە گۆڕێ. جان جاک رۆسۆ وێڕای ئەوەی پێی وانەبوو ئەم دوو مەسەلەیە واتە لێک هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵە و پێکهێنانی دەرفەتی



یەکسان بۆ ژنان پەیوەندییان پێکەوەیە؛ بە راوێژێکی تاڵەوە دەڵێ: "من لێم روونە کە ئەفلاتوون ئەرکی یەکسانی بۆ ژن و پیاو دیاری کردووە." بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەسەڵاتداران لە سیستەمی حکوومەتیی ئەفلاتووندا وەک بنەماڵەیەک دەناسێندرێن؛ رۆسۆ دەڵێ: "بەڵام ئەفلاتوون نازانێ چ لە مەسەلەی ژن بکا. ئەو بەناچاری مەسەلەی بنەماڵەیی کردۆتە کێشەی پیاوان."[٣٧] جا بەراستی هەر وەک رۆسۆش تێگەیوە؛ ئەگەر ئێمە بێنین لە بری وشەی "پیاوان" وشەی "خەڵک" دابنێین، لە زۆربەی رەوشە گرینگەکاندا بۆمان دەردەکەوێ کە بەلای ئەفلاتوونەوە مەبەست لە خەڵک تەنیا پیاوانن. ئەو توێژەرانەی لەو دوو بابەتە لێکدژە گەیشتوون کە لە کتێبی پێنجەمی ئەفلاتووندا خراونەتەڕوو؛ واتە یەکسانیی ژنان و پیاوان و لێک هەڵوەشانەوە و تێکچوونی سەنتەری بنەماڵە؛ ئیتر قبووڵی ئەوەیان نەکردووە کە ئەم دوو بابەتە پەیوەندییان پێکەوە هەیە. هێندێکیان باسیان لە نەبوونی پەیوەندیی و لێک گرێدراویی ئەم دوو بابەتە کردووە، لە حاڵێکدا کەسانێکی دیکە دەڵێن لەوانەیە پەیوەندییەکی هۆکاریی (سببی) لە نێوانیاندا هەبێ. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا ئەوان بێ ئەوەی بزانن و بێ هیچ بەڵگەیەک و بە شێوەیەکی دەمارگرژانە و چەقبەستووانە داکۆکی لە تیۆریی ئازادبوونی ژن دەکەن بە مەرجی تێکچوونی دەزگای بنەماڵەوە. هەروەکی رۆسۆ گوتی: روون و ئاشکرایە و بەڵگە زۆرن لەسەر ئەوەی ئەم دوو بابەتە دژبەری و پاردۆکسیان لە نێودا هەیە. لە کۆمەڵگەی ئایدیالیی ئەفلاتونیدا، سامان و موڵکی تایبەتی و زەماوەند بۆ دەسەڵاتەداران نییە، بەو پێیەو بەسەرنجدان بە ژیانی هاوبەشییان: رۆڵی بنەماڵە و ماڵداریێتیی نەریتی فەشەل دێنێ. هەروەها لەوکاتەوە کە زاوزێکردن کۆنترۆڵ دەکرێ و بەرنامەی گەشە و پەروەردەی منداڵان بە شێوەی هاوبەش دێتەگۆڕێ؛ ئیدی رێژەی زگپڕبوون دێتەخوارێ و دایک ئەو دەورە نەریتییەی خۆی لەدەست دەدا؛ لەبەر ئەوی لە یۆتۆپیادا رۆڵی هەر کەسێک بەپێی ئەو ئەرکە پێناسە دەکرێ کە لە ئەستۆیەتی و ژیانی رۆژانە، ئیش، خوێندەواری و فێربوونی پیشەی پێویست تەنیا دەبێ بۆ کۆمەڵگا و دابینکردنی پێداویستییەکانی بێ.[٣٩] ئەگەر ژنی دەسەڵاتدار پەیوەندی گرتن بە پیاوێکەوە وەک مێرد و منداڵبوون و هەروەها ماڵداریێتی لێ قەدەغە کراوە لەبەر

ئەوەیە کە ئەفلاتوون جێگرەوەیەکی (ئالتر ئەلتەرناتیڤ) بۆی نییە مەگەر ئەوەی کە قبووڵی بکا ژنانیش مافێکیان هەیە. بەواتایەکی دیکە ئەگەر قبووڵی بکا کە ژنانیش لە چینی دەسەڵاتدارن ناچاردەبێ بەوە قایل بێ کە ژنانیش دەبێ بەشداری کاروباری حکوومەتی بن. لێرەدایە کە ئەفلاتوون ناچار دەبێ کە ئەو تاقمە لەلایەنگرەکانی بێنێتە سەر ئەوەی کە لەسەر ئەو باوەڕەن؛ ژن توانایی جێبەجێ کردنی کارگەلی جۆراوجۆریان نییە.

روون و ئاشکرایە کە، کەشی گشتیی ئەوکات دەگەڵ بیروباوەڕی ئەفلاتوون نەبووە و بێگۆمان ئەو لە باس و خواستەکانیدا بە شوێن وەڵامێکەوە بووە بۆ لایەنگرانی بۆچوونی سوقرات کە لەسەر ئەو باوەڕە بوون سروشتی ژن کەمتر نییە لە سروشتی پیاو و پیاوان و ژنان لە جەوهەری خۆیاندا یەکسانن. لە بەشی سێهەمدا بەربڵاوتر قسەدەکەین لەسەر ئەوەی کە ئەفلاتوون لەبەشی پێنجەمی کۆماردا سەبارەت بە سروشتی ژن گوتوویەتی. بەڵام پێویستە بەوشێوەیەی خوارەوە خاڵەگرینگەکانی ئەو بەشە کورت کەینەوە.

سوقرات ئەوە بیر دەخاتەوە کە ئەو و گلاوکێن لە مشتومڕەکانی رابردوویاندا هاتوونەتە سەر ئەوەی کە لە کۆمەڵگادا هەرکەسەی دەبێ ئەرکێک بگرێتە ئەستۆ کە دەگەڵ سروشتی یەکبگرێتەوە و هیچ کەس ئیدعای ئەوەناکا کە بە شێوەیەکی سروشتی جیاوازی نییە لە نێوان ژن و پیاو دا. گلاوکێن لە وەڵامدا دەڵێ: "دیارە جیاوازییان پێکەوە هەیە."

سوقرات لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: "لەبەر ئەوەی جەوهەرە و سروشتی یەکیان، لە سروشتی ئەویدی جیایە؛ دەبێ ئەو کارو ئەرکەی دەخرێتە ئەستۆی یەکێکیان جیاوازبێ لە ئەرکی ئەویدی."

لەو کاتەدا گلاوکێن بە سوقرات دەڵێ: "ئەگەر وایە ئەوەی گوتت ژن و پیاو دەبێ لەکار و ئەرک وەئەستۆ گرتندا بەرامبەر و یەکسان بن وانییە و دەگەڵ قسەکەی پێشووتان یەکناگرنەوە، چونکە ئێوە گوتتان جیاوازییەکی قووڵ لە نێوانیاندا نییە." سوقرات دەیهەوێ وەڵامی بداتەوە، دەڵێ: کاتێک باس لە یەکسانی و جیاوازیی سروشتەکان دەکەین دەبێ سەرەتا روونی کەینەوە مەبەستمان لەو وشانە؛ چ چەمک و واتایەکە و مەبەستمان چییە لە سروشتە



جیاوازکان و ئەرکی جیاواز."[٤٠] ئەو لەسەری دەڕوا: "لەوانەیە پرسیارەکەمان ئاوا بکەین کە ئایا کابرایەکی سەربێ تووک (طاس) و پیاوێکی قژن سروشتێکیان هەیە؟ یاسروشتی یەکێکیان پێچەوانەی سروشتی ئەوی دیکەیە؟ ئەگەر بەشی دووهەم قبووڵ کەین پێویستە نەهێڵین کەچەڵەکان پینەچێتی بکەن لەبەرئەوەی قژنەکان خەریکی ئەوئیشەن یا بە پێچەوانەوە. دیارە ئەوە کارێکی گەوجانەیە، چونکە کاتێک باس لە یەکسانی و جیاوازی دەکەین، مەبەستمان یەکسانی و جیاوازی بەمانا رەهاکەی نییە بەڵکو مەبەستمان تەنیا یەکسانی و جیاوازیی تواناییەکانە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان. بەو پێیە ئەگەر جیاوازیی نێوان ژن و پیاو لە توانایی بەڕێوەبردنی کار یا تەکنیک گەلی دیاریکراودا بێ؛ دیارە لەو حاڵەتەدا دەبێ کەسانی هاوڕەگەز کارێک بگرنە ئەستۆ کە تەنیا بە رەگەزی خۆیان جێبەجێ دەبێ. ئەگەریش دەرکەوێ کە جیاوازیی نێوان دوو رەگەزەکە لەوەدایە کە پیاو "گەرا" دانێ و ژن "بزێ" لەو حاڵەتەدا ناتوانین لە باری کار و ئەرکەوە باوەڕمان بە جیاوازیی نێوان ژن و پیاو هەبێ. بەڵکو لەسەر ئەم باوەڕە سوور دەبین کە چاودێران (دەسەڵاتداران)ی کۆمەڵگەی ئێمە و ژنەکانیان دەبێ ئەرکی یەکسانیان لە ئەستۆبێ."

دیارە سوقرات لێرەدا ئەرکی سەلماندنی ئەم مەسەلەیە دەخاتە ئەستۆی ئەوانەی کە بانگەشەی بۆدەکەن. سوقرات لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ کە ئەوە خووخدە و تایبەتمەندییە دەروونییەکانی تاکن کە ئەو هێزەی پێدەبەخشن ئەرکێکی تایبەت وەئەستۆ بگرێ و هەردووک رەگەز واتە پیاو و ژن؛ لە تەواوی پیشە و هونەرە جۆراوجۆرەکانیاندا پشت بە سروشت و توانا تاکەکەسییەکانی خۆیان ببەستن. بەپێی ئەو رایە کە ژنان بە شێوەی گشتی توانایی جێبەجێ کردنی کارەکانی پیاویان نییە بەتایبەت کارە جەستەییەکان؛ بەڵام بە شێوەی تاک دەتوانن ئەو کارانە بکەن کە وڵات پێویستیی پێیانە وەک دەسەڵاتدارێتی و فەیلەسووف بوون. تەنیا شتێکی کە تاک بەرەو کارە دانسقەکان رکێش دەکا؛ ئەو شتەیە کە ئەم تاکە لێوەشاوەیی و تواناییەکی تایبەتی بۆ ئەم کارە دانسقەیە هەبێ و روون و ئاشکرایە کە ئەم لێوەشاوەییە تایبەتە پەیوەندیی نییە بە رەگەزی تاکەکانەوە. ئەو باسانە کە لە یەکەم نیگادا سادە دیاری دەکەن لە نێوان

فەیلەسووفانی سیاسیدا کە سەرنج دەدەنە رۆڵی ژن لەکۆمەڵگادا- شتێکی ناوازە و ریزپەڕن. ئەفلاتوون لەو جێیەدا کە بۆچوونی بوێرانەی خۆی سەبارەت بە نەبوونی جیاوازیی لە خوڵقانی ژن و پیاودا دەخاتەڕوو لەبەر ئەوەیە کە یەکەم: پێویستیی یەکییەتی و یەکگرتوویی نێوان تاقمی دەسەڵاتدار بخاتەڕوو، دووهەم ئەوەیکە بتوانێ خاوەندارێتیی تایبەت و دەزگای بنەماڵە و ئەرکی زەماوەندکردن و رۆڵی دایکێتی لە کۆمەڵگای ئایدیالی خۆیدا لەناوبەرێ؛ چونکە بە دابەزینی دەوری نەریتیی ژن؛ پاراستن و حاواندنەوەی منداڵان بەوڕادەیەی لە ئەستۆی ئەوە، دەخرێتە سەر ئەستۆی پیاویش."(٤١)

ئەفلاتوون لە کۆتاییدا بەو ئاکامە دەگا کە ژنان بە شێوەی کۆمەڵایەتی و دەستەیی؛ تواناییان لە پیاوان کەمترە، بەڵام دەکرێ ئەوان بە شێوەی تاک و لەزۆربەی ئەرک و کارەکاندا بۆ وێنە ئەرکی دەسەڵاتدارێتی؛ بێنە ریزی پیاوانەوە و ناوی "شابانووی فەیلەسووف" یان لەسەر داندرێ. ئەفلاتوون لەو پەیوەندییەدا وتووێژی گلاوکێن و سوقراتی لە کتێبی کۆماردا ئاوا هێناوەتەوە:

گلاوکێن: "سوقرات! وەک پەیکەرەتاشتێکی شارەزا؛ وێنایەکی جوانت لە پیاوانی دەسەڵاتدار خستەڕوو."

سوقرات: "لە ژنانی دەسەڵاتداریش؛ گلاوکێنی خۆشەویست! پێت وانەبێ ئەوەی گوتم تایبەتە بۆ پیاوان ئەو ئافرەتانەش کە سروشت و توانایی پێویستیان هەیە، شیاوی ئەوەن ئەم پلە و پێگەیەیان پێ بدرێ."(٤٢).

لێرەدا دەمانەوێ تۆمەتێک بخەینە بەرباس کە بۆ ئەفلاتوون هەڵبەستراوە. لیڤی شتراوس و ئالانبلۆم پێیان وایە باس و لێدوانێ ئەفلاتوون لەمەڕ ژنانەوە بەستراوەتەوە بە چۆنێتی بەکارهێنانی دەستەواژەگەلی وەک "جیا لە" یا "بێ لەبەر چاو گرتنی" لەش و بەتایبەت "بێ لەبەر چاوگرتنی جیاوازیی نێوان دوو رەگەز و بەسەرنجدان بە چۆنێتی خوڵقانیان."(٤٣) بەکورتی؛ ئەو رەخنە توندانەی لەلایەن توێژەرانی زانستەوە هاتوونەوە سەر پارادۆکس و دژوارییەکانی ئەفلاتوون؛ لە پەراوێزی ئەم وتارەدا خستومانەتە بەرباس. لێرەدا تەنیا پێویستە ئەوە بیر بخەینەوە کە ئیدعاکەی لیڤی شتراوس و بلۆم راست نین، چونکە ئەفلاتوون بە هۆشیارییەوە پەنجە لە سەر جیاوازییەکانی نێوان  ئەو دوو



رەگەزە دادەنێ. ئەویش لەبەر ئەوەیکە زگپڕی و شیردان بەمنداڵ جیاوازیگەلێکی زۆر روون و سروشتین و کەس نکوڵیان لێ ناکا. هەڵەی ئەم توێژەرانە لەوەدایە کە وادەنوێنن ئەفلاتوون بە شێوەیەکی عەقڵانی باس لەو جیاوازییانە ناکا بەڵکو بەپێی رۆڵی ژنان و زگپڕبوونیان؛ لەو جیاوازیگەلە دەدوێ. روون و ئاشکرایە کە مەسەلەی ژینناسیانەی ژنان جیاوازە لە مەسەلە نەریتی، پەیمانی و هەستەوەرییەکان و گرینگی و بایەخی بابەتی ئاکارناسیی ژنان یەکێکە لەو بابەتگەلەی کە لەمێژووی هزری مرۆڤایەتیدا و لە یۆنانی کەون و لە کتێبی کۆماری ئەفلاتوونیشدا خراوەتە بەرباس و لێدوان. بۆ وێنە ئەفلاتوون لە زمانی سوقراتەوە و لە نێوئاخنی لێدوانەکانی خۆیدا و بە تایبەتی سەبارەت بە پلانگەلی پەروردەیی و فێرکاریی گونجاو بۆ ژنان بەردەوام ئەم دوو بابەتە لە هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵەدا دەبینێ. ئەو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سەرەتا دەبێ دۆخ و چۆنێتی خاوەندارێتی و کەڵک وەرگرتنی بەجێ لە ژنان و منداڵان لە کۆمەڵگەدا روون بکرێتەوە و دواتر یاسایان بۆ دانێن(٤٤). بەڵام لەلایەکیشەوە دەگەڵ دەسنیشانکردنی بارودۆخی ژنان و قبووڵکردنی رۆڵی پەروەردەکردنیان، ئەوجار مەسەلەی ئازادیی ژنانی چاودێر و پارێزەر (ئەو ژنانەی لە پلەی دەسەڵاتدان و پەیوەندییان بە پیاوانەوەیە) دێتەگۆڕێ و لە لێدوانەکانی ئەفلاتووندا ئەو بابەتە بایەخێکی تایبەتی هەیە و دەچینە سەری. ئەفلاتوون لە سەرەتای کتێبی پێنجەمی کۆمارەکەیدا بە هۆی ئەوەی کە «ئادیماتوس»، «گلاوکێن» و «ترازیما خوس» تێی دەخوڕن؛ دێ لە زمانی سوقراتەوە بۆچوونەکەی خۆی زیاتر شی دەکاتەوە کە بەڵێ: "ژن و منداڵ دەبێ لە نێو هاوڕێیاندا هاوبەش بن" (واتە هەمووان بەشیان بە ژن و منداڵەکانەوە هەبێ). ئەوان سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێ بەوپەڕی وردبینییەوە ئەم بابەتە تاوتوێ بکرێ. ئەفلاتوون پاساوی بۆ دێنێتەوە کە پیاوانی دەسەڵاتدار (چاودێر) ژن و منداڵیان هاوبەشن و ژن و منداڵ بەشێکن لە ماڵ و سامانەکەیان. ئەو سەرەتا قسەکانی خۆی دەخاتەوە بیر قوتابییەکانی کە دەیگوت: ئیلیتە"دەسەڵاتدارەکان ئەرک گەلێکیان لە ئەستۆیە بۆ ئەوەی مێگەلی مرۆڤەکان بپارێزن" و دوایش لە درێژەی وتارەکەیدا ئاماژە بەوە دەکا کە راهێنان و

پەروەردەی ژنان دەبێ دەگەڵ ئەم مەبەستە واتە "پێکهێنانی چینی دەسەڵاتداری بژاردە) یەک بگرێتەوە. بەو پێیە هەبوونی مافی یەکسانیی پەروەردە بۆ ژنان و پیاوان دەبێتە پێویستییەک، چونکە بە وتەی ئەفلاتوون؛ ئەگەر بمانهەوێ ژن ببێتە دەسەڵاتدار و پارێزەرێکی* باش دەبێ ئەویش لەو مافە پەروەردەییانە بەشدار بکەین کە بۆ پیاوان بە پێویستمان زانیون." دواتر ئەفلاتوون باسەکە دەکێشێ بەرەو زاوزێ کردن و پەروەردەکردنی منداڵان و بە جوانی دەتوانێ رۆڵی نەریتیی ژنان لە بنەماڵە هەڵاوێرێ؛ چونکە ئەو ناچار دەبێ بەکردەوە گەڵاڵەیەک بەڕێوەبەرێ کە ژنان تێیدا بتوانن لە دەرەوەی ژینگە و کەشی نەریتیی خۆیاندا کەڵکیان لێوەرگرن.

بەکورتە چاوخشاندنێک بەکتێبی یاساکاندا؛ بۆمان دەردەکەوێ کە ئەفلاتوون بەجوانی ئاگاداری مەترسییەکانی ئازادیی ژنان و دەربازکردنیان لە حاڵەتی نەریتی و بەرتەسکی ماڵەوە بوو، ئەگەر هیچ شتێکیان لەجێگەی دانەنرێ. بۆ وێنە ئەفلاتوون لە باوەڕی خۆی پاشگەز نابێتەوە سەبارەت بە ژنانی ئیسپارتییەوە و دەڵێ: "یاسا دانەران (پیاوان) دەبێ یاسایەک داڕێژن کە لە ژنان گەڕێ بە بێ سەرەوبەرەیی بە زێڕوزیو و جوانکارییەوە بژین[٤٥]. دوو بابەتی دیکەی کە بووە هۆی ئەوەیکە ئەفلاتوون ئازادیی ژن لە هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵەدا بەدی بکا یا بەپێچەوانەوە، بریتیین لە:

١ـ ئەو هیچ ئاماژەیەک بە سووک بوونی ژنانی پارێزەر ناکا. ئەو ژنانە پەیوەندییان بەچینی دەسەڵاتدار و پیاوانی نوخبە (ئیلیت)ەوە هەیە و چینی دەسەڵاتداریش، بەپێچەوانەی خەڵکی دیکە، نابێ کێڵگە، ماڵ و سامان و ژنی تایبەت (خصوصی) یان هەبێ چونکە ئەگەر وابێ توانایی پاراستن و دەسەڵاتدارێتییان لە دەست دەدەن و وەک بازرگانیان لێدێ. بەواتایەکی دیکە ئەفلاتوون بە دوو پێوەری جیاواز مەسەلەی ژنان تاوتوێ دەکات: یەکیان؛ پێوەرێک بۆ ژنانی چینی دەسەڵاتدار و پێوەرێکیش بۆ ژنانی چینەکانی

* پارێزەر و چاودێر لێرەدا بەمانای وڵاتپارێز و ئەو کەسەی ئاگاداری لە وڵات دەکەن هاتووە و جیاوازە دەگەڵ پارێزەرێکی ماف لە دادگاکانی ئێستادا. لە یۆنانی کۆندا دەسەڵاتداران خۆیان بە پارێزەری گیان و ماڵی خەڵک دەزانی. (وەرگێڕ)



خوارەوەی کۆمەڵگا. لە پەیوەندی دەگەڵ ئەوەدایە کە چەمکگەلی ماڵدارێتی، وەرزێری، ملکداری و کۆیلەداری لە نێو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگادا مانا وەردەگرن؛ لە حاڵێکدا ئەوە بەشی دەسەڵاتدار و چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگا ناگرێتەوە[٤٦]. وێڕای ئەوەش هیچ گومانێک نییە لەوەدا کە یەکێک لە ئامانج و مەبەستەکانی ئەفلاتوون لە رێکخستنی پێشەزانان (صنعتگران) و خاوەن ئامێرەکان کە لە چینەکانی خواروی کۆمەڵگا پێکهاتبوون ئەوەبوو کە ئەوپەڕی کەڵک و بەرژەوەندییان لێ هەڵکرێنێ. بەو جۆرە ئەو ئاکامەی لە بەشی یەکەمی مەسەلەکە وەری دەگرین ئەوەیە کە باسەکەی ئەفلاتوون لە کتێبی پێنجەمی کۆماردا زیاتر ژنانی بەتوانا، پەروەردەکراو و هاوپەیوەند دەگەڵ پیاوانی دەسەڵاتدار لە خۆ دەگرێ و ئەو ژنانەی کە خاوەنی دەزگای بنەماڵە نین و بە شێوەی هاوبەش لە خزمەت و بەردەستی چینی پیاوانی بژاردە (نخبە)، یا ئەفلاتوون گوتەنی؛ لە بەردەستی پارێزەران دان. لە لایەکی دیکەوە دەزگای بنەماڵە دەپارێزرێ بۆ ژنانی چینی خواروی کۆمەڵگا وەک هاوسەرانی تایبەتی و دایکان کە خراونەتە ریزی کۆیلە، ماڵ و سامان و ئاژەڵەکانەوە ئیدی ئەوانە خاوەنی هیچ مافێکی یەکسان و وەکیەک نین.

٢- هەروەکی دەبینین و بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی وا ئەفلاتوون لەمەڕ "دووهەمین شار لە رووی بەختیاری"یەوە سەبارەت بەژنان کردوویەتی و هەروەها ئەو بابەتەی کە لە کتێبی یاساکاندا سەبارەت بە ژنان هێناوێتی واتە "تێڕوانینێکی دوولایەنە بە پێوەرگەلی دووچەشنە". بەگشتی هەموان پشت راست کردنەوەی گریمانەکانی ئێمەن. بە واتایەکی دیکە؛ ئاکامی باوەڕی پتەوی ئەفلاتوون لەمەڕ تواناییەکانی رەگەزی مێینە و دامەزراندنەوەی سەرلەنوێی دەزگای بنەماڵە و زیندووکردنەوەی خاوەندارێتیی تایبەت لە پێکهاتەی کۆمەڵایەیتدا بووەتە هۆی ئەوەیکە تووشی پارادۆکس و دژوازی بێت. بۆ وێنە ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ژنان نیوەی کۆمەڵن و خاوەنی گەلێک تواناییین و ئەوە گەوجێتییە کە پیاوان کەڵک لە تواناکانیان وەرنەگرن. ئەفلاتوون بەڕاشکاوی لە یاساکاندا دەڵێ: ژنان دەبوایە شانبەشانی پیاوان فێری خوێندن و زانست و پیشە ببوایەن؛ بۆ ئەوەی کۆمەڵگا بتوانێ کەڵک لە تواناکانیان

وەرگرێ. وتارەکانی ئەفلاتوون پێشاندەری ئەوەن کە ئەو بۆچوونە بنەڕەتی و ڕادیکاڵییەکانی خۆی سەبارەت بەژنان لە کتێبی پێنجەمی کۆماردا هێناوەتە بەرباس و لە کتێبی یاساکاندا ئەو بۆچوونانەی تاوتوێ کردووە کە کەمتر لایەنی وەهمی و یۆتۆپیانەیان هەیە. ئەو لە کۆتاییەکانی کتێبی کۆماردا باس لە کۆمەڵگەیەکی ئایدیال دەکا و پێیوایە " ئەم کۆمەڵگەیە نموونەیەکی یەزدانییە کە لە ئاسماندا دایانمەزراندووە بەو مەبەستەی کە ئەوانەی حەقیقەتبینن چاوی تێوەبڕن و بەچاولێکەریی ئەو؛ وڵاتەکەی خۆیان ئاوەدانتر کەن". بەڵام لە یاساکاندا "بەکۆمەڵگەیەک قایل بووە کە خاوەنی ڕێکخراوێکی سیاسییە و لەڕووی بەختیارییەوە لە پلەی دووهەمدایە." لەبەر ئەوەی دەگەڵ واقیع زیاتر یەک دەگرێتەوە.[٤٧] لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە ئەم وتوویژ و لێدوانانەی ئەفلاتوون کە لە یاساکاندا هاتوون؛ لەڕاستیدا زیاتر "دابونەریتی" یۆنانییەکان بووە و خاڵە گرینگەکەی ئەوەیەکە ئەفلاتوون لەوێداگرینگی داوە بە مەسەلەی ژنان و بە شێوەیەکی گشتی هێناویێتە گۆڕێ. بەواتایەکی تر لە یاساکاندا؛ وەک دایک و هاوسەرگەلێکی تایبەتی باس لە ئافرەتان کراوە کە تەنیا ئەرکی پەروەردەی منداڵانیان لە ئەستۆیە. بەڵام ئەم لێدوانانەی لە کۆماردا سەبارەت بە ژنان کراون؛ هەر وەکی باسی لێوەکراوە، بنەڕەتی ترن. ئەفلاتوون لە یاساکاندا دەریدەخا کە ژن و پیاو لە بواری توانایی و فێربوونی زانستەوە خاوەنی تواناییی کردەیی و سروشتیی وەک یەکن و بۆ سەلماندنی قسەکانیشی ئاماژە بەژنانی "سارومات[١]" دەکا کە شان بە شانی پیاوان دەچوونە شەڕێ. لەولاشەوە؛ ڕەخنە دەگرێ لە بیروبۆچوونی ئاسینییەکان کە ژنانیان بە کەمتوانا و بێ هێز دەزانی. ئەو لەم بارەیەوە دەنووسێ "یاسادانەرانی کۆمەڵگای ئێمە لەوەدا کە ژنان ناچارناکەن لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا یارمەتیی پیاوان بدەن؛ تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبن. چونکە ئەم نەریتەی ئێستە دەبێتە هۆی ئەوەی نیوەی هێزی کۆمەڵگا بەفیڕۆبچێ، لە حاڵێکدا ئەگەر ژن و پیاو شانبەشانی یەکتر تەواوی کارەکان ڕاپەڕێنن بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانەکانی کۆمەڵگا دووهێندە دەبێ.[٤٨] ئەم بۆچوونەی ئەفلاتوون کە لە کۆماردا هاتووە، تەواو دەگەڵ ئەوەی

(١) گەلێک کە لە قەراغ دەریای ڕەش دەژین.



لە یاساکاندا هاتووە ناتەبایە. بۆ تێگەیشتن لە دژبەریی نێوان وتارەکانی ئەفلاتوون سەبارەت بەمەسەلەی ژنان و ئەو جیاوازییە بەرچاوەی سەبارەت بە مافی شاریڤانی (هاووڵاتی) خستویەتەڕوو، پێویستە مەسەلەی ژن زیاتر شی بکرێتەوە.

ئەفلاتوون لە باری بەختەوەرییەوە کۆمەڵگاکان بەسەر سێ پلەی یەکەم و دووهەم و سێهەم دا؛ دابەش دەکا بۆ هەرکامێکیشیان پێوەرگەلێکی پارادۆکسیکاڵ و دژواز دەخاتەڕوو.

کۆمەڵگای پلەیەک؛ کۆمەڵگایەکە؛ خاوەندارێتیی تایبەتی تێدا نییە و ژن و منداڵ بەشی هەمووانن (هاوبەشن).

ئەم کۆمەڵگایە لە ڕوانگەی ئەفلاتوونەوە هەرهەمان کۆمەڵگای ئایدیال و یۆتۆپیاکەیە. ئەو سەبارەت بە کۆمەڵگای پلەدوو؛ باس لە کۆمەڵگایەک دەکا کە تێیدا زەوی و کێڵگەکان بەسەر خەڵکدا بەشکراون و کشتوکاڵ گشتی نییە و خاوەندارێتیی تایبەت لە گۆڕێدانییە[٤٩]. هەر وەکی دەبینین، لە نێوبڕی قسەکانیدا بە دژوازوێژی (تناقض گویی) درێژە بە بابەتەکەی دەدا. ئەم دژوازوێژییانە لە کتێبی یاساکان و کۆماردا زۆر زەقن و بەجوانی لێک هەڵداوێردرێن. ئەولە شوێنێکدا باس لە هەڵوەشاندنەوەی دەزگای بنەماڵەو زەماوەند و نەبوونی خاوەندارێتی تایبەت دەکاو لە جێیەکی دیکەدا دێتەسەر ئەو بابەتە کە بەمەبەستی پاراستنی ماڵ و سامان و مانەوەی تۆرەمەی مرۆڤ؛ پێویستە پیاوان خاوەندارێتیی گشتی هەڵوەشێننەوە و ژنی سەربەخۆیان هەبێ. ئەفلاتوون جارنەجارێکیش پاساو بۆ ئەم دژوازییانە دێنێتەوە. بۆ وێنە ئەو سەبارەت بە کۆمەڵگای پلە یەک، کە کۆمەڵگەی خوایان و منداڵەکانیان و دەسەڵاتدارانە؛ دەڵێ کە هاوڕێکان لەو کۆمەڵگەیەدا بەشیان بەسەر تەواوی ئەو شتانەوەیە کە هەیانە؛ نەک هەر تەواوی ماڵ و سامان بەڵکو ژن و منداڵیش بەشی هەمووانیان پێوەیە." بەڵام ئەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە کۆمەڵگای پلە دوو کە لە هاووڵاتیانی پلە دوو پێکهاتووە؛ مافی ئەوەی نییە کەڵک لە ماڵ و سامانی گشتی وەرگرێ و بەشی پێوەی نییە. هەر بۆیەش واباشترە خاوەندارێتیی لە نێویاندا هەبێ[٥٠].

روون و ئاشکرایە کە مسۆگەر نەگەیشتن بە کۆمەڵگای ئایدیالی، کە هەمان کۆمەڵگە پلە یەکەم و هاوبەشەکەیە؛ بۆتە هۆی ئەوەیکە ژنان لە زەین و بیروبۆچوونی یۆنانییەکاندا وەک ماڵ و سامان چاویان لێ بکرێ و بخرێنەریزی منداڵانەوە و وەک ئامرازێک کە تایبەت لە دەستی پیاودایە کەڵکیان لێوەرگیرێ. ئەفلاتوون گەلێ جاران لە کتێبی یاساکاندا؛ بنەماڵەی بە دەزگای سەرەکیی کۆمەڵگازانیوە و نووسیویێتی: "حکوومەت لەیەکگرتنی بنەماڵەکان پێکدێ نەک لە کۆی هاوولاتیانی سەربەخۆ و پەرش و بڵاو". هەروەها دەتوانین گەلێک خاڵ دەستنیشان بکەین سەبارەت بە یاسا دارشتن بۆ چوارچێوەی بنەماڵە لە کۆمەڵگەی ئایدیالیی ئەفلاتوونیدا[٥١]. لەبەر ئەوەی ئەو بە تێروتەسەلی لە کاروباری ئاڵۆزو پچاوپێچی وەک؛ ژن هێنان (زەماوەندکردن)، یاساکانی میرات، رۆڵی لێبڕاوانەی کۆمەڵگا لە بەشوێنداچوونی یاسایی و قەزایی و دادوەری؛ کۆڵیوەتەوە.[٥٢] بۆ وێنە یاساکانی زەماوەندکردن یەکەمین یاسایەک بوون کە پێگەی ژنی پێ دیاری دەکرا. لە کتێبی کۆماری ئەفلاتووندا دوو سیستەم بۆ زەماوەندکردن خراوەتەڕوو: یەکیان سیستەمی زەماوەندکردنی کاتی (مسیار) کە لەو سیستەمەدا هیچ کام لە ژن و مێرد؛ مافی هەڵبژاردنی رەگەزی بەرامبەریان بۆ هاوسەرێتی نییە؛ چونکە ئەوە بەشی دەسەلاتدارە کە مافی هەڵبژاردنی هەیە و دەبێ ئەوەشمان لەبەرچاو بێ کە بارودۆخی پیاوان جیاوازە لە دۆخی ژنان. دووهەمین سیستەم؛ زەماوەندکردنی هەمیشەییە کە پیاو مافی ئەوەی هەیە ژنێک بۆ هاوسەرێتیی خۆی هەڵبژێرێ. لە هەردوو سیستەمەکەدا ژن تەنیا وەک ئامرازێک و وەک ماڵ و موڵکی پیاو سەیری دەکرێ؛ واتە ئەوە پیاوانن کە بڕیاردەدەن زەماوەند بکەن، تا بەو شێوەیە ژنەکانیان باشترین منداڵیان بۆیان ببێ. بەواتایەکی دیکە ژن دەدرێ بە پیاو."[٥٣] ژنان مافی هەڵبژاردنی مێردیان نییە و ئەگەر "ئەوان بیانهەوێ مێردبکەن یەکەمجار دەبێ ئیزن لە باوکیان (پیاو) وەرگرن و ئەگەر باوک لەگۆڕێدا نەبوو لە باپیرە و ئەگەر ئەویش نەبوو لە پلەی سێهەمدا بە قایل بوونی براکان دەبێ کارەکە سەربگرێ."

ئەوە پیاوانن کە ژیانی ژنان کۆنترۆڵ دەکەن و ئەو چاودێری و کۆنترۆڵ کردنە تاقەت پڕووکێنە بۆ ژنان بووەتە نەریت و یاسا.



ئەفلاتوون پێی وابوو کە پیاو دەبێ لە چینی خۆی ژن هەڵبژێرێ و ئەگەر بێت و "یاساگەلێکی تایبەت دانرێ کە بەپێی ئەو یاسایانە دەستڕۆیشتوان بتوانن دەگەڵ دەوڵەمەندان زەماوەندنەکەن و پیاوانی دەستڕۆیشتو کچی بنەماڵە دەست ڕۆیشتوەکان نەخوازن؛ ئیدی نەک هەرگەپچاڕییە، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەیکە کەسانێک لە یاسا بێزاربن".[٥٤] پێگەو دۆخی ژنان کە بە زەماوەندکردن دەستنیشان دەکرا پەیوەندییەکی نزیکی بەو حەقیقەتەوە هەبوو کە ئەوان بەشیان بەسەر مڵک و ماڵی خۆیانەوە نەبوو. بۆ وێنە ئەگەر کچێک برای نەبوایە کە میراتگری باوکی بێ؛ ئەو کچە وەک ئامرازێک لەلایەن باوکییەوە دەدرا بە پیاوێک کە ئەو پیاوە هەم دەبوو بەزاوا و هەم بەکوڕ و میراتگری باوکی کچە.[٥٥] ئەفلاتوون بە هۆکار و بەڵگە هێنانەوە؛ بەڕوونی پێگەی ژن لە نێو سیستەمی هاوسەرێتی و لە پەیوەندی دەگەڵ ماڵ و سامان و میرات و یاساکاندا نیشان دەدات.

بۆ وێنە ئەگەر پیاوێک خاوەن مڵک و ماڵە؛ لەسەری فەرزە ژنێک بێنێ، کە نەک هەر مڵک و ماڵەکەی بۆ بپارێزێ بەڵکو دڵنیابێ لەوەی کە "کەرەسە و ئامرازێکی میراتگریی «رەوا» شی هەیە. تەنانەت ئەو ژنانەش کە وەک هاوسەری تایبەت هەڵدەبژێردران وەک "تاکێک" خاوەنی شوناس نەبوون. بەڵکو وەک ئامرازێک کەڵکیان لێوەردەگیرا. ژنان مافی ئەوەیان نەبوو ماڵ و سامانی (منقول) ی خۆیان بەمیرات بەرن؛ چونکە ئەگەر وەها مافێکیان پێدرابایە لە کۆمەڵگادا وەک تاکێک دەناسران[٥٦]. ئەوەش پێچەوانەی نەریت و یاسا کۆمەلایەتییەکان بوو. بنچینەی پێکهاتەیی ئەو کۆمەڵگایەی ئەفلاتوون دەیخاتەڕوو؛ بەپێی لێدوانە گشتییەکەی، پێشاندەری دوو پێوەری لێک جیاوازی ئاکارییە لەسەر ژنان و پیاوان. لە لێدوانە گشتییەکەی ئەودا ئەم نایەکسانیی مافی هاوولاتییە زۆرزەق و بەرچاوە. هەروەکی پێشتر باسی لێوەکرا، رەوشی کاڵا لە وتارەکانی ئەفلاتووندا جۆرێک وێناکراوە کە ژنان بێ ئەملا و ئەولا دەکەونە ریزی کاڵا و کەلوپەلەوە. هەڵبەت کاڵایەک کە لە هەموو کاڵایەکی دیکە پێویست تر و گرینگترە. ئەم تێڕوانینە بۆ نەبوونی یەکسانیی مافی هاوولاتیی ژنان لە "کۆمەڵگەی پلە دووی ئەفلاتوونیدا" بڕێک باشتر بوو. بەڵام ئەوە بە هیچ

جۆرێک بەواتای یەکسانیی مافی ژنان و پیاوان نییە. گلێنمۆرۆ پێیوایە کە: "بێ گومان ئەفلاتوون ویستوویەتی لەژێرسێبەری یاسادا پێگەیەکی یەکسان بۆ ژنان دەستەبەر بکا؛ ئەگەرچی هەرگیز سەری نەگرت."[٥٧] ئەو لەو پەیوەندییەدا نموونەیەک دێنێتەوە و دەڵێ: پێشنیاری یاسای تەلاق بەپێچەوانەی یاسای زەماوندکردن هەنگاوێک بوو کە بە شێوەی سەرنجراکێش دەیتوانی ژنان بەرەو مافی یەکسان رێنوێنی بکا؛ کارێک کە تا ئەوکات لە کۆمەڵگەی ئەسینادا باونەبووە. هەروەها بارودۆخی یاساکانی تاوان (جەنایی) و سزای یەکسان بۆ بۆ ئەوانەی ژنەکانی خۆیان بریندار دەکرد یا دەیانکوشتن، جا بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەگەزی سکالاکەر و سکالا لێکراو.[٥٨] دەکرێ سەبارەت بەسێکسی نارەوا- زەق ترینی ئەو یاسایانە بەدی بکەین کە بکەرەکانی ئەم تاوانە وەکیەک سزادەدرێن. بۆ وێنە لە یاساکاندا هاتووە: "ئەگەر ژن و مێردێک لە کاتی دیاریکراوی یاساییدا منداڵیان بووبێ، یا ئەوەیکە پیاوێک دەگەڵ ژنێکی دیکە یاژنێک دەگەڵ ژنێکی دیکە یا ژنێک دەگەڵ پیاوێکی دیکە دەست تێکەڵ بکا هەرهەمان سزای بۆ لەبەرچاو دەگیردرێ[٥٩] دیارە کە ئەم یاسایانە بۆ کۆمەڵگەیەک داڕێژراون کە لەسەر بنەمای یەک ژنی" دامەزراوە و بۆ کۆمەڵگای فرەژنی شتێکی نائاساییە.

وێڕای تەواوی ئەوانە، لە روانگەی ئەسینایییەکانەوە؛ ژن بەگشتی وەک کەسانێکی کرچ و کاڵ (نابالّق) و زەعیفەگەلێک وان کە پێویستیان بە سەرپەرشتیارێکی وەک پیاو هەیە. ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکانیشدا ئەم روانگەیەی خستۆتە روو. بۆ وێنە ژنان بێجگە لەوەی مافی خاوەندارێتیان نەبوو، مافی ئەوەشیان نەبوو کە بەر لە تەمەنی چل ساڵی لە دادگادا وەک شایەتحاڵ شایەتی بدەن. ئەفلاتوون راشکاوانەتر دەڵێ: "هەر ژنێک کە ئازادبێ (کۆیلە نەبێ) و مێردی نەبێ، تەمەنیشی لە چل ساڵ بۆ سەرێ بێت مافی ئەوەی هەیە وەک شایەتحاڵ بێتە دادگا و هەروەها دەشتوانێ لە دژی کەسانی دیکە سکالا تۆمار بکا. بەڵام ئەگەر مێردەکەی زیندووبێ تەنیا مافی ئەوەی هەیە کە شایەتی بدا بۆ سکالای کەسانی تر، بێ ئەوەی خۆی مافی سکالاکردنی هەبێ.[٦٠] لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ژنان بەگشتی و ژنە بەمێردەکان بە تایبەتی لە



چوارچێوەیەکی داخراوی تەسک و توند دا بوون. نکوڵی کردن لە مافی شاریڤانیی ژنان و توانایی و وزەکانیان بوو بە دەستپێکی ئەوەی دواتر لە "کاروباری دەوڵەتی" و لە دەسەلاتدا بەشدار بکرێن. هەڵبەت دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە ئەو ژنانە؛ ژنانی چینی پارێزەر (دەسەلاتدار)ن کە بە شێوەیەک لە شێوەکان دەگەڵ پیاوانی چینی بژاردە (نخبە)دا لە پەیوەندی دان و لە کاروباری حکوومەتی و پاراستندا بەشداری دەکەن، ئەویش بە پێی ئەو هەلومەرج و وردەکارییانەی لە هیچ کوێی کۆماردا ئاماژەیان پێ نەکراوە. تەنیا شوێنێکی کە تێیدا ئاماژە بە هەلومەرجی بەشداری ژنان لە دەسەلاتدا کراوە لە کۆتایی باسەکەی سوقرات دایە کە لەسەر زانستی فەیلەسووفانەیە و بەو باسەش وێدەچێ هەر ئەو لێدوانانە بێ کە ئایدیای بوێرانەی ئەفلاتوونیان لێکەوتەوە و ئەوی ناچارکرد دان بەوە دابنێ "کە دەبێ لە کەش و هەلومەرجێکی یەکساندا هەمووان بەشیان بە تەواوی شتەکانەوە هەبێ و ئەو ئافرەتانەش کە سروشت و توانای پێویستیان هەیە، شیاوی دەسەلاتکردنن."[٦١] لەو پەیوەندییەدا دەبێ ئاماژە بکەینەوە بەوەی ژنان بۆ بەدەستەوە گرتنی پلەکانی سەرەوەی دەسەلاتدارێتی مافی هەڤرکی و پێشبڕکێیان پێ نەدەدرا. بۆ وێنە لە یاساکاندا بە شێوەیەکی یەکسان پێشنیاری کار و بارێکی تایبەتی وک (کاهینی) لە پەرستگەکاندا دەکا بۆ ژنان و پیاوان.[٦٢]

بەوپێیە لەڕاستیدا ئەو کارەی بەژنان ئەسپێردراوە هەر ماڵداری و منداڵ بەخێوکردن بوو. لە جێیەکیشدا ئەگەر باسی سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بۆ ژنان دێتە گۆڕێ بەو مانایەیەکە ژنان دەبێ فێری زانستگەلێکی گشتگیر بن سەبارەت بە ماڵداری و پەروەردەی منداڵان. بەواتایەکی دیکە، ئەو کارانەی لە پلەکانی بالای کۆمەڵگەدان؛ کاروبارێک نین کە ژنان دەستیان پێی رابگا. بەوجۆرەیە کە ماڵداری و بەخێوکردن و پەروەردەی منداڵ بە شێوەیەکی نەریتی خراوەتە ئەستۆی ژنان. وتوویژی ئەسینی (ئەفلاتوون) دەگەڵ کۆلینیاس لە کتێبی یاساکاندا سەبارەت بەو باسە؛ بەم جۆرەیە:

کۆلینیاس: زۆر چاکە. بەڕای تۆ یاسا چۆناوچۆن سەقامگیر دەکرێ؟

ئەسینی: لە بیرتە گوتم لە وڵاتی ئێمەدا ئەنجوومەنێک پێکدێ لە دە کەس لە بەتەمەنترین یاساپارێزان و ئەو کەسانەی باشترین خەڵاتی چاکە (فضیلت) یان

وەرگرتووە (ڕاوێژکارانی حکوومەتی) و لەو پیاوانەی بۆ تاوتوێکردنی دابونەریت و یاسای وڵاتان بەجیهاندا گەڕاون و پاش گەڕانەوەیان بۆ وڵات؛ لەلایەن ئەندامانی ئەنجوومەنەوە تاقی دەکرێنەوە و ئەگەر شیاو بوون بە ئەندامەتی وەریاندەگرن.

کۆلینیاس: هەموو ئەو وتانەم لە بیرن.

ئەسینی: دەزانی بۆچی دیسان ئەو باسەم هێناوە گۆڕێ؟ بەڕای من ئەو ئەنجوومەنە کە ئەنجوومەنی پارێزەرانی یاسایە؛ باڵانسی کۆمەڵگە و دەوڵەتە و ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی دروست و ڕێکوپێک بەڕێوەبچێ؛ یاساکەمان لە هەموو خەسار و بەڵایەک دەپارێزێ.(٦٣)

لەوتووێژەکەی ئەفلاتووندا بەو ئاکامەدەگەین کە لە کۆمار و لە یاساکاندا هیچ باسێک لەوە نەکراوە کە ژنان دەتوانن کاروبارێکی گرینگی پلەکانی باڵای حکوومەتی، سەرۆکایەتی، دادوەری کردن و پلەی زانای ئایینی، بگرنە ئەستۆ؛ چونکە ئەو کارانە کاروبارێکن کە تایبەتن بە فەیلەسووفەکان(ئیلیتەکان) کە پیاوانن. لە سیستەمی پەروەردەیی ئەفلاتوونیشدا ئەوە مامۆستای "پیاوە" کە مافی پەروەردە و فێرکردنی منداڵان و لاوانی هەیە. مامۆستایەتی کردن یەکێک بوو لە گرینگترین کارەکان و کاروباری پەروەردە و فێرکردن لە ئەستۆی باشترین و لێوەشاوەترین پیاوەکان بوو؛ چونکە ئەوان بە شێوەی یاسایی بە باوکی منداڵەکان لە قەڵەم دەدران.(٦٤) هەروەها لە تەواوی ئەم وتووێژانەدا کە لەسەر ئەو ئەرک و کاروبارانە دەکرێن و لە باری بەختیارییەوە لە پلەی دووهەمدان؛ گشتیان ئەو کارانەن کە تایبەت بە پیاوانن و ئەگەر باسێکیش لە ژنان کراوە؛ مەبەست لەو ژنانەیە کە مەرجە پێویستەکانیان هەیە. بەگشتی ئەرک و کاروبارەکانی ئاستی سەرەوە بۆ پیاوان تەرخانکراون. لە هیچ شوێنێکی وتووێژەکانی ئەفلاتووندا نەهاتووە ژنان بتوانن لە کاروباری سیاسیی شارو کۆمەڵگا و تەنانەت لە کۆڕوکۆبوونەوەکانیشدا بەشداربن.(٦٥) لەو پێ جێیەی ژنان ئەو مەرجانەیان هەیە ئەو کاتانەیە کە "سروشت" مەرجە پێویستەکانی وەک توانایی و ئاوەزی تێدا خوڵقاندون بۆ ئەوەی بتوانن کاروبارە دەوڵەتییەکان لە ئاستی خوارەوەدا بگرنە ئەستۆ. هەڵبەت لەو پەیوەندییەشدا تەمەن وەک



مەرجێکی پێویست دیاریکراوە بەجۆرێک کە ئەوان هەتا تەمەنی چل ساڵی مافی بەشداربوون لە کارە حکوومییەکانیاندا نییە. لە حاڵێکدا مەرجی تەمەن بۆ پیاوان بێ هیچ مەرجێکی تایبەت سی ساڵانە.(٦٦)

ڕوون و ئاشکرایە کە ئەفلاتوون سەبارەت بە ژیرێتی و توانای ژنان و پیاوان پێوەرگەلێکی دوو لایەنی هەیە، چونکە وێڕای ئەو هەمووە مشتومڕە پڕ لە گەنگەشەیەی لە یاساکاندا و لەسەر بوونی ڕێکوپێکی و دسیپلین کردوویەتی، بەلای ئەوەوە ناڕێکی و بێ دسیپلینی ئەوەیە کە ژنان بێنە سەر سفرەی نان خواردنی پیاوان. نموونەیەکی دیکە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە ئەو لە باسی ڕێوڕەسمی ناشتن و بەخاک سپاردندا؛ هاووڵاتیان پۆلین بەندی دەکا و لێکیان هەڵداوێرێ، بۆ ئەوەی پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان دیاربێ. لەم پۆلێن بەندییەدا ژنان لە لیستەی هاووڵاتییان دەرهاوێژراون.(٦٧)

ئەفلاتوون کاتێک باسی وردەکارییەکانی یەکسانیی مافی کۆمەڵایەتیی هاووڵاتیان دەکا تووشی دژوازیی گوتنێکی زەق دەبێ؛ بۆ وێنە ئەو بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی پێشووی خۆی کەپێی وابوو: "ژنان و پیاوان دەبێ وێڕای یەک و شان بە شانی یەکتر پەروەردە بکرێن و لەمەشق و ڕاهێنانەکاندا بەشداربن و سواری و ژیمناستیک تایبەت نین بە پیاوان."(٦٨) کاتێک دێتە سەر وردەکارییەکانی یەکسانیی ماف، کوڕان لە کچان هەڵداوێرێ و مافی بەشداریکردن لە فێرکاری و ڕاهێنانەکانی وەک؛ ڕاکردن و سواری، تەنیا بەو کچانە دەدا کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی شوکردن.(٦٩) بە واتایەکی دیکە؛ ئەو ژنانەی تەمەنیان لە بیست ساڵی بەرەوژوورە و زۆربەیان مێردیان کردووە.

بەگشتی مافی دەرکەوتن و ڕۆڵ گێڕانیان لە کۆمەڵگا دا پێنادرێ. مەرجی بەشداریکردنی کچانی خوار تەمەنی بیست ساڵانیش لە مەشقی سواری و ڕاکردنیشدا ئەوەیە کە دەبێ لە پێشدا کوڕان بەزۆر لەو مەشق و کێبڕکێیانەدا بەشداری بکەن و ئەگەر نەیکەن لۆمە و سەرکۆنە دەکرێن، بەڵام کچان نەک هەر زۆریان لەسەر نییە بەڵکو هانیش دەدرێن کە لەو فێرکاری و مەشق و ڕاهێنانانەدا بەشداری نەکەن.(٧٠) هەروەها پیاوان لە بیست ساڵییەوە هەتا شێست ساڵی فەرزە لە سەریان کە لە کاروباری نیزامیدا بەشداری بکەن و بچنە شەڕێ.

بەڵام ژنان وەها فەرزێکیان لەسەر نییە و ئەگەر بەشداریکردنیشیان لە کاروباری نیزامیدا بە پێویست زانرا دەتوانن پاش جێبەجێکردنی ئەرکی دایکایەتی و هەتا تەمەنی ٥٠ ساڵی بیانخەنە بەرکاروبارێک کە پیاوان بە پێی هێز و توانای جەستەییان بۆیان دیاری دەکەن.[٧١]

بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەفلاتوون کە پێیوایە ئەو ژنانەی کە "لە کۆمەڵگای بەختەوەریی پلە دوودا" لە هەموو شتێکدا دەگەڵ پیاوان یەکسان و بەرامبەرن؛ لەڕاستیدا بۆچوونێکی هەڵەیە و درۆیەکی زەقە. چونکە ژنان، هاوسەری تایبەتیی (خصوصی) پیاوانن و هەربۆیەش دەبوو بەسێ هۆی گشتی بەشداری و رۆڵی کۆمەڵایەتییان کەم کەنەوە: "یەکەم ئەوەیکە لەبەرئەوەی ژنان بەکردەوە قۆناغێکی زگپڕی و منداڵ بەخێوکردنیان هەیە، ناچارن لە ماڵێدا بمێننەوە و ئەرکی دایکانەیان جێبەجێ بکەن. هەڵبەت ئەم رەوشە ژنانی پارێزەر ناگرێتەوە. چونکە هاوسەرێتیی ئەوان کاتییە و بەپێی فەرمانی یاسادانەر پێک دێ و زاوزێ کردنیان تەواو لە ژێرچاودێری و کۆنترۆڵ دایە. هەر وەک لە کۆماردا هاتووە، ئەو ژنانەی وەک هاووڵاتیی پلە دوو لە قەڵەم دەدرێن، لەبەر ئەوەی زاوزێ کردنیان لە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵدا نییە و موڵکی پیاوانن، دەبێ خەریکی ماڵداری و پاراستنی موڵکی پیاوان بن. لە کتێبی یاساکاندا هاتووە کە کاروباری دۆزی شار و کۆمەڵگا ئەو ژنانە لە خۆوە ناگرێ کە هاوسەری هەمیشەیی پیاوانن، لەبەر ئەوەی کردەی سێکسی ئەم ژنانە و زاوزێ کردنیان لە ژێرکۆنترۆڵ و چاودێری دا نییە و هەروەها لەبەر ئەوەش کە موڵکی تایبەتیی پیاوانن؛ هەر بۆیەش لە کۆمەڵگادا هیچ رۆڵ و ئەرکێکیان پێ ناسپێردرێ. دووهەم ئەوەیکە پێداچوونەوە بەیاساکانی خاوەندارێتیی تایبەتدا بووە هۆی ئەوەی کە ژنان وەک کابان (ماڵدار) بەرپرسی کاروباری رابواردن و خۆشگوزەرانیی پیاوانیش بن. لە کتێبی یاساکاندا ئەم مەسەلەیە بەڕوونی شی کراوەتەوە؛ واتە دایکانی هاووڵاتیی پلەدوو، ئەرکی خزمەتی مێرد و بەخێوکردنی منداڵیان لە ئەستۆیە و ئەرک و بەرپرسیارەتی ئەوان دەگەڵ ئەرکی دایکانی پارێزەر بەراوردناکرێن کە بەشی هەموو پیاوانی چینی دەسەڵاتدارن و هەرناشزانن کێ باوکی منداڵەکانیانە[٧٢]. سێهەم ئەوەیکە ئەفلاتوون بە شێوەیەکی



سەیر ئەو ژنانە کە "هاوسەری تایبەتین" (خصوصی) بە بەشێک لە موڵکی پیاوان دادەنێ و بەهاوشانی ئەو ژنانەیان نازانێ کە پارێزەرن و رۆڵ و ئەرکی نەریتییان لە ئەستۆ نییە[٧٣].

ئەفلاتوون لە دوا ئاکامی باسەکەیدا دەڵێ: "هیچ یاسایەک بۆ رەگەزی ژن دانەنراوە و یاسا دانەران زۆر بێ جێ لێیان خۆش بوون: چونکە بەیاسایەکی دیار و دەسنیشان کراو دەروەستیان نەکردوون. ئەگەر ژنان کە بەپێی سروشتی خۆیان کەمتر حەزیان لە فەزیلەتە: بەرەڵڵا و ئازادبن و هیچ بەربەستێکیان لە پێش نەبێ، لە راستیدا کۆمەڵگا تووشی گەندەڵی و بێ سەرەوبەرەیی دێ."[٧٤]

ئەفلاتوون گەرەکی بوو لە دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەیدا و لە حکوومەتە ئایدیالەکەیدا یاساگەلێک دانێ کە پیاوان بەگشتی و ژنان بە شێوەی تایبەت، لەخۆ بگرێ. ئەو لە پێداچوونەوە و چاوپێداخشاندنەوەکانی بە رەوشی ژناندا؛ هەوڵی داوە ئەوان بگەڕێنێتەوە سەر ئەوپێگە و رۆڵە نەریتییەی لە رابردوودا بوویانە، هەڵبەت ئەم گەڕانەوەیە دەبوایە ئەمجارەیان بە شێوەی فەرمی و یاسایی جێبەجێ کرابایە.

## بەشی سێیەم:

# تاوتوێکردنی مەسەلەی ژن لە روانگەی ئەفلاتوونەوە (٢)
# سروشتی ژن و پێگە کۆمەڵایەتییەکەی

لە بەشەکانی پێشوودا لە روانگەی ئەفلاتوونەوە مەسەلەی ژنانمان لە "کۆمەڵگایەکدا کە لە رووی بەختیارییەوە پلە دوو" یە؛ تاوتوێ کرد و هەروەها بەشێک لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی "کۆمەڵگای جۆری یەکەم" و دەزگای بنەماڵەمان خستە بەرباس. ئێستا پێویستە بچینە سەر چۆنێتی لێکدانەوەی ئەفلاتوون سەبارەت بە سروشتی ژن و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی و لەو پەیوەندییەدا سەرەتا دەبێ ئەو پرسیارە بکەین کە ئایا ئەفلاتوون وەکیەک روانیوێتە سروشتی پیاو و ژن یا سروشتی ئەم دوو رەگەزە لەیەکتر جیاواز دادەنێ؟ دووهەم ئەوەی کە، ئایا ئەو دەرەنجامەی ئەفلاتوون سەبارەت بە سروشت و توانایی ژن پێی گەیشتووە هۆکاری لۆژیکی هەیە یا لە سەفسەتە زیاتر نییە؟ و دواجار ئەوەیکە ئایا دەکرێ لەو رۆڵ و دەورە جۆراوجۆرانەی ئەفلاتوون لە کتێبی کۆمار و یاساکاندا خستوویەتە بەردەم ژنان؛ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە؟

ئەفلاتوون پێیوایە واتای وشەی "سروشت" (nature) چەمکێکی گرینگ و بنچینەییە و ئەستەمە سووک و سادە تێی بگەین؛ چونکە ئەوە وشەیەکی دیکە دێنێتە گۆڕێ بەناوی physis* کەواتایەکی دیکەی "سروشتە". ئەم دوو وشەیە واتە nature و physis چ وەک کردار کەڵکیان لێوەرگیرێ چ وەک ئاوەڵناو لە دەزگای هزریی ئەفلاتووندا بۆ تێگەیشتن لە تایبەتمەندییە جەوهەری و ژینگەییەکان* و پەیوەندیی ئەوانە بە یەکەوە دەورێکی گرینگ دەگێڕن. چونکە ئەم دوو تایبەتمەندییە دەبنە هۆی پێکهاتن و بیچم گرتنی کەسایەتیی مرۆڤ.

---

* physis دیاردەیەکی سروشتییە کە هۆکاری یەکەم و سەرەکییە بۆ گۆڕان یا مانەوەی شتەکان.
* (مەبەست لە تایبەتمەندیی ژینگەیی؛ ئەو تواناییانەن کە مرۆڤ لە ژینگە وەریاندەگرێ و فێریان دەبێ وە. ک)



ئەفلاتوون لە فایدرۆسدا دەڵێ: دەستنیشان کردن و تێگەیشتن لە سروشتی شتەکان؛ بێ ئەوەی بزانی بۆچی دەبن و (کارکرد)یان چییە؛ کارێکی سادە و ساکارنییە. ئەوم لەسەر ئەو باوەڕەیە کە بەڕێوەبردنی کارێک بێ لەبەرچاو گرتنی ئەوەی بزانی لە چ پرۆسەیەکدا دەکار دەکرێن و بۆچی پێویستن (کردار و پەرچەکرداری شتەکان بۆیەک) وەکو ئاکاری کەسێکی کوێر وایە. ئەفلاتوون لە وتووێژ دەگەڵ فایدرۆسدا سەبارەت بە سروشت لە زمانی سوقراتەوە دەڵێ:

ئەفلاتوون: پێموایە توێژینەوەمان سەبارەت بە سروشتی هەر شتێک بەو جۆرەبێ کە شی دەکەمەوە سەرەتا دەبێ زانیاری لەسەر ئەوشتە کۆ کەینەوە کە دەمانەوێ، ئەوجار بە خەڵکیش بڵێین کە یەک جۆرە یا جۆراوجۆر. ئەگەر زانیمان یەک جۆرە؛ دەبێ جوان لێی ورد بینەوە و بزانین چ وزە و تواناییەکی هەیە و کاریگەریی لە سەر چ شتێک هەیە و کامانەشت لەسەری کاریگەر و شوێندانەر دەبن. بەڵام ئەگەر زانیمان چەند شنە فروچە (جۆراوجۆرە) دەبێ جۆرەکانی ناوبەرین و هەر جۆرەی بە جیا تاوتوێ بکەین؛ هەروەک چۆن ئەو جۆرە تاقانەکەمان تاوتوێ کرد؛ بۆ ئەوەی بزانین هەرکام لەوانە لەسەر چ شتێک شوێندانەر دەبن و کامانە شت لەسەریان شوێندانەردەبن.

فایدرۆس: هەر لێکۆڵینەوەیەک بەمجۆرە نەبێ وەک رێگەرۆیشتنی کوێرێک وا دەبێ کە بیهەوێ بە دەستەکوتە بەڕێدا بڕوا.[١]

بەواتایەکی تر بەڕای ئەفلاتوون رووکەش و رواڵەتی شتەکان جەوهەرە و سروشتی راستەقینەیان بە روونی و تەواوی ناخاتەڕوو. هەروەک چۆن کوێرێک ناتوانێ بە دەست رێخشاندن لە جەوهەرەی شتەکان تێبگات. دیارە بەر لە تێگەیشتن و ناسینی شتەکان دەبێ سەرنج بدرێتە ئەو ژینگەیەی ئەو شتەی تێدا دروست بووە. ئەو کارەش بێ تێگەیشتن لە کردار و پەرچەکرداری شتەکان بەنیسبەت یەکتر مسۆگەر نابێ. دواتر هەروەک دەیبینین ئەفلاتوون لەکاتی تاوتوێکردنی مەسەلەی ژناندا ئەم تیۆرییە پشتگوێ دەخا و بایەخێکی ئەوتۆی پێنادا. بەڵام لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە کام هۆکار سروشتی مرۆڤ دەخوڵقێنێ؟ ئایا ئەم هۆکارە شوێندانەرە؛ هۆکارێکی جەوهەری (فطری)یە یا ژینگەیی (فێربوون)؟ ئایا بەوباوەڕ و نەریتگەلەی بەمیرات پێمان گەییون دەتوانین

سروشتی مرۆڤ دروست بکەین یا بەو سیستەمە پەروەردەییەی یۆنانییە کۆنەکان پێیان باش بووە؟ لە حاڵێکدا تیۆگنیز Theognis لە شیعرەکانیدا جەخت لەسەر نەگۆڕبوونی جەوهەرە دەکاتەوە و رای وایە کە پەروەردە هیچ کات ناتوانێ گەمژەیەک ژیر بکات و ناجسنێک بکات بە پیاوێکی چاک.[٢] بەڵام زۆربەی شرۆڤەکارانی بیروڕاکانی ئەفلاتوون یەکدەنگن لەسەر ئەوەیکە ئەفلاتوون پێی وابووە کە بە فێرکردن و پەروەردەی باش دەکرێ کەسایەتیی مرۆڤ بیچم بدرێ و پتەوبکرێ. چونکە ئەو لە کۆمار و یاساکاندا ئەوەندەی لەسەر سیاسەت رۆییوە ئەوەندەش قسەی لەسەر پەروەردە و بارهێنان کردووە.[٣] ئەو شتەی دەبێ لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێ بەکارهێنانی وشەی physisە لە کەلتووری یۆناندا. ئەو وشەیە بە دووجۆر دەکار کراوە؛ واتە هەم بە مانای تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان (سروشتی) و هەم بەواتای تایبەتمەندییە ژینگەییەکان. بەواتایەکی دی؛ ئەم وشەیە لە لایەکەوە دەکرێ بابەتێکی جەوهەری بێ و لەلایەکیشەوە دەکرێ وەک بابەتێکی پێکهاتەیی و وەرگیراو لەقەڵەم بدرێ[٤]. هەر ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەیکە خوێنەر نەتوانێ سووک و سادە لە کاربردی وشەی "سروشت" تێبگا، تەنانەت لە هێندێ شوێن وشەیەکی چەواشەکاریش بێ؛ چونکە ئەفلاتوون جارنەجارێک وشەی "سروشتی" و "بەشێوەی سروشتی"ی بە واتای "جەوهەری"و "بە شێوەی جەوهەری" دەکار کردووە. بۆ وێنە دەڵێ: "خەڵک پێیان وایە کە سروشت دەستی راست و چەپی هەرکام بۆ کارێک خوڵقاندووە. بەڵام جیاوازییش دانانێن لە نێوان لاقەکان و ئەندامەکانی دیکەدا. هەربۆیەش بەوجۆرە نیوەی دەستەکانمان بە هۆی ناتێگەیشتوویی دایکان و پەرستارەکانمانەوە نوقستان دەبن لە حاڵێکدا سروشت ئەو دوو ئەندامەی وەک یەک خوڵقاندووە (لایەنی جەوهەری) و ئێمە بۆ خۆمان لەبەر ئەوەی هەرکامیان بە شێوەیەک دەخەینەگەڕ و بەپێی عادەت؛ دەبێتە هۆی ئەوەی جیاوازی بکەوێتە نێوانیان."[٥]

بەکورتی ئەفلاتوون لە هێندێ شوێندا دەڵێ سروشت روون و دیارە کە بەواتای پەروەردە و عادەت هاتووە و مانای «جەوهەری» ناگەیەنێ. نموونەیەکی دیکە لەم بابەتە ئەو یاسایانەیە کە ئەو بۆ ئەسپ سواریی کچان و



ژنان داینـاوە، بەڵام لە سەریان فەرزناکا بەڕێوەی بەرن. ئەو دەڵێ: "بەشداریکردنی کچان و ژنان لە سواری بەمەرجێک راهاتبن و پەروەردەکرابن ئیرادێکی نییە، چونکە پەروەردە و بارهێنان لەواندا دەبێتە عادەت و وەک سروشت وەها ئیزنێکیان دەداتێ."(٦) لێرەدا دەبینین کە ئەفلاتوون ئەو شتانەی بە پەروەردە و راهێنان بوونەتە عادەت؛ وەک واقعێک لێیان دەڕوانێ کە دژایەتیان دەگەڵ سروشت نییە. ئەو لە شوێنێکی دیکەش لە وتەیەکیدا دەڵێ: "ئەوکاتەی کۆمەڵگا کەوتە سەر رێی راست و رۆژبەرۆژ گەشەی کرد و باشتر بوو، ئیدی ئەو بارهێنان و پەروەردەیەی کە پێشبینیمان کردووە بۆی؛ دەبێتە هۆی ئەوەیکە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە منداڵەکانیان بەسروشتێکی چاک و پاکەوە لە دایک بن و ئەو منداڵانەش لە ژێر تیریژی ئەو پەروەردەو بارهێنانەدا گەورەبن."[٧] ئەم وتەیە بەڕوونی ئەوە دەردەخا کە "سروشت"ی هەرتاکێک دەگەڵ خۆی دێتە جیهان، یان لانی کەم دەکرێ بڵێین بەشێک لە سروشتی هەر کەسێک لەو ژینگەیەدا بیچم دەگرێ کە ئەوی تێدا دەژی. هەر بۆیە ناتوانین تەواوی ئەو شتانەی ئەفلاتوون سەبارەت بە سروشتی کەسێک دەیانڵێ وەک جەوهەرە و تایبەتمەندییە زاتی و جەوهەرییەکانی ئەو کەسەیان لە قەڵەم دەین. بەڵام لە هێندێ بیروڕای ئەفلاتووندا ئەو شتانە یەک دەگرنەوە و بەیەک واتادێن. بۆ وێنە ئەو لە کۆماردا دەڵێ: "ئێمە هەرکاممان خاوەنی سروشتێکین تەواو لە سروشتی ئەوانیتر جیاوازە کە بە شێوەیەکی سروشتی دەگەڵ سروشتی ئەوی دیکە لێکجیان.[٨] لێرەدا جوان دیارە کە مەبەستی ئەفلاتوون لە سروشتی کەسێک هەرهەمان جەوهەرە یان زاتی ئەو کەسەیە. چونکە لە درێژەی قسەکانیدا هۆی جیاوازیی نێوان دارتاشێک و ئاسنگەرێک لە توانا زاتی و جەوهەرییەکانیاندا دەبینێ و ئەم تایبەتمەندییە جەوهەری و زاتییە (خوێنی) لە پێکهاتەی کەسایەتیی تاکەکانیدا بەشتێکی گرینگ دەزانێ. دەبێ ئەوەشمان لەبیربێ کە ئەفلاتوون پەروەردە فەرامۆش ناکا و لەم بارەیەوە دەڵێ: "هەر مرۆڤێکی خراپ بە هۆی ئەوەی خراپیان بارهێناوە خراپ دەرچووە؛ چونکە مرۆڤەکان لە خراپە خۆ دەبوێرن؛ لەم رووەوە ئەوی خراپە بە پێچەوانەی ویستی خۆی تووشی خراپە بووە."[٩] ئەفلاتوون جارنەجارێک بەڕاشکاوی تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان

دەخاتە پاڵ پەروەردە و بارهێنان. بۆ وێنە؛ ئەو لە وتووێژێکدا سەبارەت بەوەیکە کەسێک چۆن دەتوانێ ببێتە ئاخێوەرێکی باش؛ لە زمانی سوقراتەوە بە فایدرۆس دەڵێ: "رێگەی شارەزایی و کارامەیی لە ئاخافتندا وەک رێگەی بەتوانا بوون لە هونەرەکانی دیکەدایە؛ واتە ئەگەر توانایی جەوهەری (فطری)ت بۆ ئاخێوەری هەبێ و لە خۆ بارهێنان و پەروەردە کردندا کەمتەرخەمی نەکەی، دڵنیابە دەتوانی لەو هونەرەدا کارامەبیت. بەڵام هەرچەندەی یەکێک لەو دوو مەرجانە کەموکوڕییان هەبێ توانایی لێهاتوویی تۆش لە ئاخێوەریدا کەموکوڕیی دەبێ.[١٠] لێرەدا بە راشکاوی باس لەوە کراوە کە ئەگەرچی هەبوونی توانایی پێویستە، بەڵام بە تەنیا توانایی بەس نییە. هەروەکی پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، لە کتێبی یاساکاندا هاتووە کە: "یەکەمین کارێک کە دەبێ بکرێ ئەوەیە کە زەوییەکان و ماڵەکان دابەشکرێن بەسەر ئەندامانی کۆمەڵگادا. بەڵام لەبەر ئەوەیکە خەڵکی ئێستا بە گوێرەی پێویست پەروەردە نەکراون بۆیە نابێ کشتوکاڵ هاوبەش بێ."[١١] لەو نێوەدا چەند بیرمەندێکیش نکۆڵیان لە گرینگێتی "سروشتی" "جەوهەرە" و هۆکارە "شوێنگە"ییەکان کردووە. بەڵام گرینگ ئەوەیە کە لە هەڵسەنگاندنی بابەتەکاندا سەرنجێکی زۆر بدرێتە ئەو پێداگرییانەی ئەفلاتوون کە لە وتووێژەکانیدا سەبارەت بە بایەخ و گرینگیی پەروەردە و شوێنگە و کاریگەریی ئەم دووانە لەسەریەک؛ کردوویەتی. نکوڵی ناکرێ لەوەیکە ئەفلاتوون لەسەر پەروەردەی منداڵ لە سەرەتای ژیاندا زۆر پێداگریی کردووە و بە روونی لە زمانی سوقراتەوە لە کتێبی کۆماردا باس لە شوێن وەرگرتنی منداڵ دەکا و دەنووسێ: "دەزانی ئەگەر سەرەتای ژیان لەسەر رۆح داخرێ؛ بە چەقبەستوویی دەمێنێتەوە"[١٢]. هەربۆیەش ئەفلاتوون زۆر جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەیکە بەردەوام حەکایەت بۆ منداڵان و پارێزەرانی لاو (دەسەڵاتدارنی داهاتوو) بگێڕدرێتەوە، چونکە بەڕای ئەو حەکایەت گێڕانەوە بۆ منداڵان کارێکە کە بەر لە پەروەردەی جەستەییان دەست پێدەکات. لەکتێبی یاساکاندا هاتووە کە تەواوی ئەو "کایە" گەلەی منداڵان و لاوان دەیکەن؛ بۆ ئەوەیە کە "رۆحیان بیچم" بگرێ و هەروەها (منداڵ لە تەمەنێکدا بیروباوەڕەکانی دەپشکوێن کە رۆحێکی ناسکی هەیە و لە هەڕەتی گەشەکردن دایە لەبەر ئەوەی پاش ئەوەیکە زەینی منداڵ



فۆرمی وەرگرت ئیدی گۆڕین یا سڕینەوەی بیروباوەڕ لێی؛ کارێکی گەلێک ئەستەم و دژوارە."[١٣] مرۆڤ ئەو رێگەی وا بە منداڵی فێری بووە، تا ئاخری تەمەنی هەر پێیدا دەڕوا؛ چونکە هەرشتەی بەردەوام شتی وەک خۆی لێدەکەوێتەوە. هەر بۆیەش ئێزنی هەموو جۆرە کایە و کارێک نادرێ بە منداڵان و پارێزەرانی لاو. نابێ ئیزن بە پارێزەرانی گەنج بدرێ کە خەریکی هەموو جۆرە کارێک بن، تەنانەت لە کایە کردنیشدا. چونکە بۆ داهاتووی ئەوان شتێکی خراپ و بێ جێیە."[١٤] و ئەفلاتوون لەو پەیوندییەدا و بۆ باشتر تێگەیشتن لە شتەکە؛ نموونەی ئەو پیشەسازە دێنێتەوە کە هەر لە منداڵییەوە کارامەیی و دەست رەنگینیی فێربووە.

ئەفلاتوون لە زمانی سوقراتەوە وریامان دەکاتەوە کە پەروەردەی رۆحی و جەستەیی دەبێتە هۆی ئەوەیکە لەلایەکەوە تواناییەکانی لاوان لە بواری زانست و هزرەوە بپشکوێن و لەلایەکی دیکەوە ورەیان بەرزتر و قایمتر بێ. ئەوانەی کە تەنیا بە جەستەیان رادەگەن؛ کەسانێکی تووڕە و تۆسن و بێ بەزەییان لێ دەکەوێتەوە و ئەوکەسانەش کە تەنیا خەریکی پەروەردەی رۆحیانن؛ دەبنە کەسانێکی بێ ورە و داهێزاو، هەر بۆیەش دەبێ رۆح و جەستە وێکڕا پەروەردە بکرێن و راهێنرێن[١٥]. بەوپێیە دەسەڵاتداران و پارێزەران هەر لە پێشدا دەستنیشان کراون؛ لەبەر ئەوەی کە ئەوانەی وا خاوەنی دوو خەسڵەتی دلۆڤانی و توندوتیژین و دەگەڵ دۆستان دلۆڤانن و لە بەرامبەر دوژمناندا توندوتیژ؛ شیاوی ئەوەن ببنە ئەندامی چینی دەسەڵاتدار و پارێزەر.[١٦] بەپێی ئەم موتالایانەی لەسەر باوەڕەکانی ئەفلاتوون کراون ئەو بەم کەسانە قایل نییە وا هەڵگری توانایی و ئەم دوو خەسڵەتەن؛ بەڵکو مەرجێکی دیکەش دێنێتە گۆڕێ ئەویش "بایەخ پێدانی تایبەتە" بەم کەسانە. ئەفلاتوون ئەرک و بەرپرسیارەتییەکی قورس و دژوار بۆ چینی دەسەڵاتدار دەسنیشان دەکا. یەکێک لەو ئەرکانە ئەوەیە کە، ئەگەر منداڵی یەکێک لە پارێزەران بێ مایە بێ؛ بیهنتە چینێکی خوارتر و ئەگەر لە نێو چینەکانی خوارەوەدا منداڵێکی بەتواناتر و لێوەشاوەتریان دیتەوە، پێویستە بیگەیەننە چینی پارێزەران. ئەم مەسەلەیە پێچەوانەی رای تویژەرانی ئەفلاتوونییە کە سوورن لەسەر ئەوەی لێوەشاوەیی و توانایی

بەشتێکی جەوهەری و زاتی لە قەڵەم دەن و ئێمەشی پێ قایل بکەن. ئەفلاتوون لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە ئەندامانی کۆمەڵگا لە ژێر تیریژی پەروەردە و فێرکردنی دروست و گرینگی پێدانی تایبەتدا دەتوانن ببن بە کەسانێکی لێوەشاوە.[17] بۆ وێنە "ئایدیای ئەفلاتوونی" و تیۆریی ئەشکەوت، سەلمێنەری شوێن دانان و کاریگەرێتی پەروەردە و فێرکردنە لەسەر سروشتی مرۆڤ؛ چونکە نموونەی ئەشکەوتی و ئەفلاتوون ئەو کەلێنە گەورەیە وەدەردەخا کە لە نێوان ئەوانە دایە کە پەروەردەکراون و ئەوانەی لە پەروەردە و فێرکردن بێبەری بوونە. دیارە ئەم وێنەیە؛ وێنەیەک نییە جیاواز بێ لە رەگەزی مرۆڤ، بەڵکو وێنەی سروشتی مرۆڤە پەروەردە نەکراوەکانە کە قۆناغەکانی پەروەردە و فێرکردن تێپەڕدەکەن بۆ ئەوەی بە مەعریفەبگەن.[18] ئەفلاتوون لە وێنای ئەشکەوتەکەدا رەوش و دۆخی ئەو مرۆڤانە شی دەکاتەوە کە لە رووی پەروەردەو بە هۆی نەبوونی فێرکردن و پەروەردەوە لە جیهانێکی جیاوازدا دەژین.

لە کتێبی یاساکاندا زۆر پێداگری کراوە لەسەر مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن و پانتاییەکەی هەراوتر کراوەتەوە؛ چونکە بێجگە لە پەروەردەی پارێزەرانی دەوڵەتی و داڕشتنی یاساگەلی فێرکردن و پەروەردەیی؛ تەنانەت سەرنج و بایەخ بە چۆنێتیی خواردنەوە لە نێو میوانییەکانیشدا دراوە؛ تا ئەوەیکە دەڵێی ئەفلاتوون نکوڵی دەکا لە بۆچوونەکانی خۆی لەسەر توانایی جەوهەریی مرۆڤ. سەرەڕای تەواوی ئەو شتانە ئەفلاتوون کتوپڕ سەبارەت بە هاووڵاتیانی نێو کۆمەڵگای پلەدووی بەختیاریی دەڵێ: "ئێمەی مرۆڤ بەدەست خواکانەوە وەک بووکەڵەگەلێک واین کە تۆسقاڵێکمان حەقیقەت پێگەیوە". ئەم وتەیە بەڕای گلێن مۆرۆ؛ یاسادانەریی ئەفلاتوون بەگشتی و رەوشی یاساکانی پەروەردە و فێرکردن بە تایبەتی دەخاتە مەترسییەوە؛ چونکە "ئەوانەی پەروەردەکردنیان لە ئەستۆی ئێمە بوو و ئێمە یاسامان بۆ دادەنان، دەبێ بزانن و بڕواش بکەن کە خواکان و خاوەنگەلی ئاسمانان لە کاتی خۆیدا رێگەی راستیان پێشان دەدەن.[19] بەکورتی ئەفلاتوون کە وەک ئەسینایییەک لە کتێبی یەکەمی کۆماردا خەریکی ئاخافتن و فێرکردنە دەڵێ: "ئەو پیاوانە چاک و بە کەڵکن کە باش راهاتبن و



جوان فێرکرابێن." ئەو لە درێژەی لێدوانەکانیدا پلەی دەوڵەتیی چاودێری و بەڕێوەبەرێتی پەروەردە و فێرکردن بە گرینگترین و بەرزترین پلەی حکوومەتی لەقەڵەم دەدا. چونکە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە منداڵ لەوکاتەوە وا لەزگی دایکی دایە و دواتریش لە سەردەمی منداڵید، دەبێ لە ژێر چاودێریی ئەم بەرپرسە دەوڵەتییە (دایرەی پەروەردە) دابێت و ئەگەر کەسێک شیاوی فێرکردن و پەروەردە نییە و بۆ خۆی خراپ بارهاتبێ نابێ بۆ بەدەستەوەگرتنی ئەم کارە گرینگە بە شورای شار (هەیئەتی دەسەڵات) بناسێندرێ.[20] ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکاندا راشکاوانە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و یاسا ئایدیالییەکانی خۆی لە فۆرمی پەروەردە و فێرکردندا دەخاتەڕوو. لەسەر ئەم باوەڕەش سوورە کە "مرۆڤ بوونەوەرێکی کەوی و دەستەمۆیە؛ ئەگەر توانایییە سروشتییەکانی بە پەروەردەیەکی دروست بپشکوێن؛ لە چاکەکاری و فەزیلەت و فەزیلەت و دلۆڤانیدا دەگاتە جێیەک کەهیچ بوونەوەرێک تۆزی نەشکێنێ. بەڵام ئەگەر لە ژێر کاریگەرێتیی پەروەردەیەکی خراپدا بێ؛ دەبێتە دڕندەترین گیانلەبەر. هەر بۆیەش یاسا دانەر نابێ لە پەروەردەی لاواندا کەمتەرخەم بێ و بەشتێکی لاوەکی بزانێ.[21]

## ئەفسانەی کانزاکان

هێندێک لە لێکۆڵەران پێیان وایە تیۆریی "ئەفسانەی کانزاکان"ی ئەفلاتوون، واتە پۆلێنبەندیی مرۆڤەکان بەپێی بنچینە نەژادییەکەیان کە پێی وابوو دەسەڵاتداران لە رەگەزی ئاڵتون، یاریدەدەران لە رەگەزی زیو، جووتیاران و پیشەزانان لە رەگەزی ئاسن و برینجەن پێشاندەری ئەوەیە کە ئەفلاتوون لە فۆرمی هێمایی ئەم کانزایانەدا ویستویەتی لە سروشتی مرۆڤ بدوێ.[22] بەڵام ئەوەیکە ئەم لێکۆڵەرانە تاوتوێیان نەکردووە ئەوەیە کە ئەم تێوەرییە یەکێکە لە "درۆپێویستەکانی" "پیسۆدوس" کە بووەتە ئەفسانە و ئەفلاتوونیش گومانی هەیە لەوەدا کە بتوانێ خەڵک بێنێتە سەر ئەوەی کە باوەڕ بەشتی وابکەن. ئەم درۆیە وەک هەلومەرجێک وایە کە ئەو بۆ ئوستورەی دڵخوازی خۆی پێکی هێناوە. واتە ئەگەرچی ئەم درۆیە لە فانتازیا هەڵقوڵیوە؛ تیشک دەخاتە سەر حەقیقەتێک کە

خودی ئەفلاتوون بڕوای پێ کردبوو، ئەو حەقیقەتەش هەرهەمان پۆلین بەندیی مرۆڤەکانە بە پێی جەوهەرە و زاتیان. بۆ تێگەیشتن لەو مەسەلەیە باشتروایە وتووێژی ئەفلاتوون و گلاوکین بە تەواوی بێنینەوە:

ئەفلاتوون: دەزانی نەک هەرخواکان بەڵکو ئادەمیزادیش لە درۆی راستەقینە و (پێویست) بێزارن؛ هەڵبەت ئەگەر بکرێ وەها ناوێکی (پێویست) لەسەردانێی؟

گلاوکێن: تێنەگەیشتم.

ئەفلاتوون: مەبەستم ئەوەیە هیچ کەس لە ناخی خۆیدا سەبارەت بەوشتەی لەدڵیدایە درۆ دەگەڵ خۆی ناکا، بەڵکو لەوە دەترسێ کە دەگەڵ خۆی درۆبکا.

گلاوکێن: دیسان لەمەبەستت نەگەیشتم.

ئەفلاتوون: دەکرێ ئەو جۆرە بێخەبەر مانەوەیە لە حەقیقەت؛ واتە ئەو حاڵەتەی کە بەڕاستی ناخی مرۆڤ لە حەقیقەت بێ خەبەر بێت؛ بە درۆیەکی راستەقینە ناوبەرین و ئەوەش هەر ئەو دەستەواژەیە کە پێشتر هێنامەوە. درۆی (مەسڵەحەتی) لاسایی و وێنەیەکە لەوشتەی لە ناخی مرۆڤ دایە و ئەم درۆیە هێندێ جاران بۆ لۆمە و سەرکۆنە کردن نابێ، دیارە ئەوەش ئەوکاتەیە کە وەک مەرهەمێک قازانجی بۆ مرۆڤایەتی هەبێ[٢٣].

لەم وتووێژەدا ئەفلاتوون دەراو بۆ ئەوە خۆش دەکا* بۆ ئەوەی بۆچوونەکەی خۆی سەبارەت بەپلە بەندیی (هیرارشی) پلەوپایەکانی مرۆڤ بسەلمێنێ، چونکە بنچینەی ئەم درۆیە لە سەر ئەم کۆڵەکەیە دامەزراوە کە جیاوازیی رەچەڵەک و رەگەزیی هاووڵاتیان بەوان نیشان بدا. ئەفلاتوون لەسەر ئەم باوەڕەیە کە پەروەردە و راهێنانەکانیان وەک خەوێک لەقەڵەم دەن و فەرامۆشیان کەن چونکی ئەوان هەر لە ئەزەلەوە بە دەستی خواگەلێکی جۆراوجۆر خوڵقاون کە لە باری چلونایەتییەوە جیاواز و نایەکسانن. هێندێکیان جەوهەرێکی بێ خەوشیان هەیە وەک زێڕ بەشێکیان لە کانزا بێ بایەخترن وەک زیو. ئەوانەش کە کانزاکانیان زۆر بێ نرخترە لە جەوهەرێکی وەک ئاسن خوڵقاون. بەو جۆرە؛ ئەو جیاوازییەی کە لە نێو هاووڵاتیاندا هەیە حەقیقەتگەلێکی سەلمێنراون کە هەم لە جەوهەرە و هەم لە سروشتیاندا هەیە و هەم لە

* دەراوخۆش کردن= زەمینە سازیی



جیاوازیی ئەو سیستەمە پەروەردەیی و فێرکردنەی کە بۆیان تەرخان دەکرێ. روون و ئاشکرایە کە ئەم پروپاگەندە بێ بنەما و درێژدادڕییانەی ئەفلاتوون هەر بۆ ئەوەیە کە ویست و هانەی یەکسانی خوازیی مرۆڤەکان تووشی ئاستەنگ بێن و گەورەیی سروشتی و جەوهەریی دەسەڵاتخوازانی پیاو بخاتەڕوو. بەداخەوە ئەو "درۆ زەقە"بە درێژایی مێژووی جیهان هەربووە و بەردەوام مافی ژنانی پێ شێل کردووە. روون و ئاشکرایە کە باس و لێدوانەکەی ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماردا لەسەر ئەوەیکە پیاوانی پارێزەر (دەسەڵاتداران) و ژنانی پارێزەر (ئەو ژنانەی دەگەڵ دەسەڵاتداران لە پەیوەندیدان) سروشتێکی یەکسانیان هەیە، باسێکی سەیر و چاوەڕواننەکراوە. هەروەها سەبارەت بەگرینگێتی شوێنگەی راهێنان و پەروەردە، کە ئەفلاتوون بەردەوام جەختی لەسەر کردۆتەوە و لێبراوانە و راشکاوانە لەسەریان قسەی کردووە، وادەردەکەوێ کە سەردەمی ئەفلاتوون مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن لە نێوان ژن وپیاودا جیاوازییەکی قووڵی هەبووە و ئەو بۆی ئەوەی نەلواوە کە بەراورد و هەڵسەنگاندنێکی خراپ و نیگەتیڤ لە توانایی و وزەی ژنانی دەسەڵاتدار بخاتەڕوو. لەولایەنەوە کە سروشتی مرۆڤ لەوانەبوو لەڕێگە عادەتە جۆراوجۆرەکانەوە (وەک؛ عادەت و دابونەریتەکان) چەواشەبێ، بێجگە لە پەروەردەی ژنان رێگەیەکی دیکەیان شک نەدەبرد و ئەوەش دەبووە هۆی دەرکەوتنی ئاستی توانایی سروشتی و جەوهەریی ژنان لەبەراورد دەگەڵ تواناییەکانی پیاواندا. هەنووکەش مرۆڤەکان لە باری فێربوونی زانستەوە دەگەڵ ئەو مرۆڤانە بەراورد دەکرێن کە هیچ کەرەسە و ئامرازێکی فێربوونی زانستییان لەبەر دەستدا نەبووە، هەروەک چۆن لە یۆنانی کۆنیشدا دانیشتوانی نێو ئەشکەوت دەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە جیهانی حەقیقەت تێگەیشتبوون بەراورد دەکران. بۆ وێنە ژنانی ئەسینی لەوکاتدا وەک دانیشتوانی ئەشکەوت لە قەڵەم دەدران کە بێ ئەوەی دەستیان بە رووناکایی پێویست رابگا؛ ناچاربوون بۆ سڕینەوەی سێبەرە بزۆکەکانی سەر دیوار. تەمەنی خۆیان لە نێو تابووت و ئەشکەوتدا تێپەڕکەن. دیارە کە لەو کۆمەڵگەی ئەفلاتوونی تێدا دەژیا، ژنان لەسەر شوێن و پێگەی راستەقینەی خۆیان نەبوون و جیاوازییەکی هێجگار زۆریان هەبوو دەگەڵ هاووڵاتیانی پیاوی ئەسینی و

ئەوانەی لە دەوڵەتی ئایدیالی ئەفلاتوونیدا باسیان کرابوو. بۆ وێنە ئەفلاتوون لە کۆماردا ئەوەمان بیردەخاتەوە کە "ئەگەر دەتانەوێ کورەکانتان بوێربن دەبێ نەهێڵن گوێیان لە شیعر و چیرۆکی هەڵخەڵەتێنەر و چەواشەکار بێت."[٢٤] ئەو پرسیارەی لەو پەیوەندییەدا دێتەگۆرێ ئەوەیەکە: ئایا ئەو بۆ کچانیش هەر ئەم پلان و گەلاڵەیە پێشنیار دەکا؟ ئایا شیعر و چیرۆکگەلێکیش بۆ ژنان هەبوونە کە ئەوان هەڵنەخەڵەتێنێ؟ ئەفلاتوون ئەوەی پشت راست کردۆتەوە کە ئەو کەسەی دیلی نەزانینە؛ ناچارە دەبێ باوەر بەوشتە بکا وا خەڵک سەبارەت بەو دەیڵێن بەلام ئەفلاتوون بە ئانقەست نەیویستووە دان بەو حەقیقەتە دابنێ کە ئەو نەهێشتنە پێی دەڵێن "مێشک شۆردنەوە" و ئەوەش بابەتی سەرەکیی نووسراوەکانی هەسیۆد و پریکێسە لەسەر ژنانی یۆنان.[٢٥]

## ژینگەخوازی و یەکسانی لە پەروەردە و فێرکردندا

لێرەدا دێینەسەر تێوریی ژینگەیی و یەکسانیی پەروەردە و فێرکردنی دوو رەگەز کە ئەفلاتوون باسی لێکردوون و پێشتر ئاماژەمان پێکردووە. لەو پەیوەندییەدا پێویستە بە راشکاوی بڵێین کە ئەفلاتوون بە تەواوەتی ئەم بۆچوونەی خستۆتە ژێر پێ، چونکە بە کورتە چاوخشاندنەوەیەک بە بیر و باوەرەکانیدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم یەکسانییە بەرای ئەو، قەت مسۆگەرنابێ بۆ وێنە لە وتووێژی ئەفلاتوون و گلاوکیندا هاتووە:

ئەفلاتوون: ئێمە لە نێو سەگەلی مرانەمەردا چ ئەرکێکمان خستۆتە ئەستۆی دێڵە سەگ؟ کوا ئێمە لەسەر ئەو باوەرەین کە ئەوان دەبێ هەر ئەو ئەرکانە راپەرێنن کە لە ئەستۆی گۆڵە سەگەکانە؟ و دەبێ شانبەشانی ئەوان وریای رانەمەر بن؟ یا لەسەر ئەو باوەرین کە دێڵەکان بە هۆی ترەکین و تووتک بەخێوکردن ناتوانن کاریتربکەن و دەبێ لە ماڵێ بمێننەوە و راو و مێگەل پاراستن بە گۆڵەکان بسپێرن؟

گلاوکێن:" دەبێ هەردووکیان لە پارستنی رانەمەردا هاوکاری و یاریدەی یەکتر بکەن، بەلام چونکە دێڵەکان لە گۆڵەکان لاوازتر و کەم هێزترن؛ دەبێ برێک چاوت بەسەریانەوە بێ.



ئەفلاتوون ئایا دەکرێ چاوەروانیت لەگیانلەبەرێک هەبێ ئەرکی گیانلەبەرێکی دیکە بگرێتە ئەستۆ، بەسەرنجدان بەوەیکە یەکیان پەروەردە کراوبێ و ئەویتر لەو پەروەردەیە بێبەری کرابێ؟"[٢٦]

ئەفلاتوون دیهەوێ لەو پرسیار و وەڵامانە بەوئاکامە بگا کە بەگشتی سروشتی مرۆڤ و تایبەتمەندییە رەگەزییەکەیان لێک جیاوازە و ئەگەر کەس یا کەسانێکم بە شێوەی تایبەت لەبەرچاوبێ لەوانەیە ئاکامەکە بە شێوەی دیکەبێ. بۆ وێنە پیاوان بە شێوەی سروشتی تواناییان لە ژنان زیاترە، بەلام ئافرەتگەلێکیش هەن کە "لە زۆر بوارەوە لە پیاوان بەهێزتر و بەتواناترن."[٢٧] بەواتایەکی دیکە ئەفلاتوون هەول هەولی ئەوەیەتی نیشان بدا کە لەبەرێوەبردنی کاروباردا جیاوازییەک لە نێو ژن و پیاودا نییە. چونکە بە ئاشکرا بە گلاوکێن دەڵێ: هاورێ گیان، هیچ کار و پیشەیەکی کۆمەلایەتی تایبەت بەرەگەزی ژن یا پیاو دانەنراوە؛ توانایی ژن و پیاو لە راپەراندنی کاروبار و بەرێوەبردنی پیشە و تەکنیکەکاندا یەکسانە و لەوەدا جیاوازییەکیان لە نێودا نییە" و دواجار، بە "بەلام" ێک باس لە کەمتوانایی ژنان دەکا و دەڵێ: "هەڵبەت ژنان لەهەموو کارێکدا لە پیاوان لاوازترن.[٢٨] هەروەکی دەبینین ئەفلاتوون شێوازێکی ئالۆز و پێچەڵپێچ لە تێۆرییەکەیدا دەخاتەروو بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانێ بەمجۆرە لە ئاستێکی بەربلاو و لە کاروباری پەروەردەییدا کەڵک لە تواناییەکانی کەسانی جۆراوجۆر وەرگرێ. بەلام ئەو بۆچی نایهەوێ دان بەو حەقیقەتە دابنێ کە تواناییەکانی ژنان بە هۆی ئەم دۆخە کۆمەلایەتییەی بە درێژایی مێژوو بە سەریاندا سەپاوە بەر تەسک بوونەتەوە یا ئەوەیکە لە ناوچوون. سوقرات بەردەوام لە سووکایەتی کردن بە ژنان خۆی پاراستووە بۆیەش بە شێوەیەکی نەرم و نیانتر هێرشی کردوونەتە سەر[٢٩]. و لەم پەیوەندییەدا ئەفلاتوون سوور بوو لە سەر ئەوەی بە پێی باوەرەکانی خۆی سوقراتیش وەک کەسێک بناسێنێ کە دژبەری ژنانی پارێزەر و یەکسان بوونیانە دەگەڵ پیاوان. کریستاین پیەرس christine pierce واتێگەیشتووە کە ئەو هەوڵێداوە ئارەزووەکانی ئەو کەسانە دابین بکا کە لە ژن بێزارن و هەروەها وابنوێنێ کە یەکسانیی ئەم دوو رەگەزە؛ باری لۆژیکیشی هەیە.[٣٠] هەروەک باسکرا ئەفلاتوون لەو دژوازوێژییانەی خۆیدا بەگشتی؛

بەدەگمەن حەزی لێ بووە ئاوڕ لە بابەتە سەرەکییەکە واتە یەکسانیی ژنان بداتەوە. ئەوشتە بە جوانی لە کتێبی کۆماردا بەدی دەکرێ کە ئەفلاتوون بەوە قایل ببوو کە ئەگەر ژنان پەروەردە بکرێن دەتوانن بێنە ریزی پیاوانەوە و لەو ئاستە دا بن. ئەو لەولاوەتر و لە درێژەی ئەم دژوازوێژییانە لە کتێبی کۆماردا، ئاماژە بەو حەقایەتە کۆنانە دەکا کە تێیاندا باس لەو ژنانە کراوە کەشانبەشانی پیاوان چالاکییان نواندووە و دەڵێ: حەقایەتە کۆنەکان راستیی باوەڕی ئێمە دەسەلمێنن و دەزانین لە نێو ئەو گەلانەدا کە لە قەراخ دەریای رەش دەژین و "ساروت" یان پێدەڵێن؛ هەزاران ژنیان تێدایە کە نەک سوارچاکن؛ بەڵکو وەک پیاوان دەتوانن تیرهاوێژی بکەن و چەکوچۆڵیش بەکارهێنن. جا چونکە توانایی بەڕێوەبردنی ئەم جۆرە کارانەیان هەیە من بە دڵنیاییەوە پێموایە رەوشی هەنووکەی کۆمەڵگای ئێمە ناعەقڵانییە؛ بە تایبەت سەبارەت بەوەیکە دەڵێن پیاو و ژن ناتوانن شان بە شانی یەکتر کار بکەن و لە هێز و وزەی خۆیان کەڵک وەرگرن.[٣١] لێرەدا وادێتە بەرچاو کە ئەفلاتوون باوەڕێکی پتەوی بەهێز و توانای رەگەزی مێینە هەیە. بەڵام کاتێک دەگاتە کتێبی پێنجەمی کۆمار؛ باسێکی چەواشەکارانە لە زمانی سوقراتەوە دێنێتە گۆڕێ. ئەم دڕدۆنگی و دوو لایەنە قسەکردنەی ئەفلاتوون شتێکی سەیر و سەمەرە نییە، لەبەر ئەوەیکە ئێمە لە کتێبی یاساکاندا پەنجەمان لەسەر هێندێ وتووێژ دانا کە دژی ئەو ئیدعا و بانگەشانەن وا لە کتێبی کۆماریدا هاتوون و نکوڵیان لێدەکا. بەڵام پێویستە ئەو خاڵەمان لە بیر بێ کە جەختکردنەوەی ئەفڵاتوون لەسەر پێویستیی پەروەردە و فێرکردن  بۆ پێشکەوتن و گەشەی توانا جەوهەرییەکانی ژن و هەروەها پرسیارێک سەبارەت بە جیاوازیی نێوان ئەوان و پیاوان، بە شێوەیەکی خوازەیی (هێمایی) و زۆر شارەزایانە بووە. بۆ وێنە ئەو باوەڕی وایە "هەر ئەوەندەی منداڵان تەمەنی شەشساڵیان تێپەڕاند دەبێ کوڕان و کچان لێک هەڵاوێردرێن و کوڕان دەگەڵ کوڕان و کچانیش دەگەڵ کچان بخرێنەبەر پەروەردە و فێرکردن. کوڕان دەبێ فێری سوارچاکی، تیرهاوێژی؛ رمبازێن و شەڕە قۆچەقانی (قەپانچەلە) بن و کچانیش ئەگەر بە گوێرەی پێویست توانایی و هێزیان بوو؛ ئەوا فێری بەکارهێنانی کردنی چەکوچۆڵ و کەرەسەی شەڕێ بن. لەو



پەیوەندییەدا هەنووکە بیروڕای هەڵە زۆرن کە زۆربەیان لە نەزانیی گشتییەوە سەرچاوە دەگرن." بەڵام کاتێک پرسیار لە ئەفلاتوون دەکرێ کە مەبەستی چییە لە بیروڕای هەڵە؟ ئەو کە هەتا ئێستاش هیچ شتێکی سەبارەت بە بەکارهێنانی دەست و لاق نەگوتووە لە هەڤپەیڤینێکی دوور و درێژدا وەڵامدەداتەوە و دەڵێ: ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە پێیوایە هەرکام لە دەستی راست و چەپ بۆ کارێکی تایبەت خوڵقاون، چونکە هەردووکیان سروشت خوڵقاندوونی و ئەوە ئێمەین بە هۆی ئەوەیکە هەر کامیان بە شێوەیەک بەکاردێنین و وایان رادەهێنین کە لێک جیاوازبن."[٣٢]

گلێن مۆرۆ کە لە هەموو کەس باشتر یاساکانی تاوتوێ کردووە؛ لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەفلاتوون بەڕاستی بەسەر قسەکانی خۆیدا زاڵ بووە و زانیوێتی باس لە چ شتێک دەکا. مۆرۆ دەڵێ: ئەوە بەراوردێکی حاشا هەڵنەگرە کە بۆ وێنە؛ کاتێک دەوڵەتێک گرینگی و بایەخ نادا بە پەروەردە و بارهێنانی ژنان؛ وەک پیاوک وایە کە تەنیا لە دەستی راستی خۆی کەڵک وەردەگرێ. بەدڵنیایی ئەفلاتوون بەو ئاکامە گەیشتبوو کە باشترین شێواز و میتۆد بۆ خستنەڕووی بۆچوونە قورس و ئاڵۆزەکانی خۆی ئەوەیە کە بیانکاتە وتووێژ بۆ ئەوەی کەمتر دەگەڵ یەکتر ناتەبا بن[٣٣]. چونکە بەپێی گریمانەی ئەفلاتوون کە پێیوایە دەستە راستەکان نیوەی کۆمەڵگان و دەستە چەپەکان نیوەکەی دیکە، ئیتر روون و ئاشکرایە کە بۆ ئەوەی کۆمەڵگا نۆرماڵ  و کامڵ بێ توانایی هێزی هەر دووک دەستەکە پێویستن. دیارە تواناییەکان بە شێوەیەکی سروشتی لێک جیاوازنین بەڵکو لەوەدایەکە پەروەردە و فێرکردن بۆ پیاوان (دەستەڕاستەکان) هەیە، بەڵام ژنان (دەستەچەپەکان) لێی بێبەریی کراون. بەوجۆرە هەروەکی گوترا ئەفلاتوون لە پێشنیارێکی نایەکسانیدا دەڵێ: ئەگەر کچان توانایی پێویستیان هەبوو دەبێ فێری بەکارهێنانی کەرەسەی شەڕ (چەکوچۆڵ) بن، بەڵام فێرکردنی ئەو شتە بۆ کوڕان کە بە شێوەیەکی جەوهەری تواناییان هەیە، لەسەرەتی دایە.

گلێن مۆرۆ رای وایە کە ئەو باسەی ئەفلاتوون، سەبارەت بە دەستەکان خستوویەتەڕوو؛ پەیوەندیی بەمەسەلەی ژنان و پیاوانەوە هەیە و چەند بەڵگەی پتەویش بۆ قسەکەی دێنێتەوە، یەکەم: ئەفلاتوون لە پێشدا نەک هەر هیچ

ئاماژەیەکی بە مەسەلەی دەستەکان نەکردبوو؛ بەڵکو ئەو لە سەرانسەری ئەو وردەلێدوانانەی لەسەر پاڵەوانان و راهێنانە سەربازییەکانیان کردوویەتی هیچ ئاماژەیەک بەو مەسەلەیە ناکا. هەڵبەت بەگشتی وێدەچێ کە مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن یەکێک لەو مەسەلەو واقیعیانە بووە کە ئەفلاتوون حەزی لێیان بووە. بەو جیاوازییەوە کە پەروەردە و بارهێنانی ژنان بەلای ئەفلاتوونەوە ئەگەر بێ بایەخیش نەبووبێ لانیکەم زۆر گرینگ نەبووە.

دووهەم: راهێنانی دەست و شان و باهۆ لە کاروباری سەربازی و بەرەکانی شەڕدا شتێکی گرینگە، بەڵام لە هێندێ کاری وەک ژەنینی ئامێری مۆسیقادا گرینگێتی خۆیان لە دەست دەدەن.[٣٤] هەر وەک ئەفلاتوون لە وتەیەکی هێمایی symbolism دا دەڵێ: دەبێ ئاگامان لەوەبێ کە پیاوان وا راهێنرابن و پەروەردە کرابن کە لە کاتی هروژم بردندا بتوانن بە باشترین شێوە لە هەردووک دەستیان کەڵک وەرگرن و هیچ کامیان بێ کار نەهێڵنەوە. دیارە کە ئەم قسانە دووپاتەی ئەوشتانەن کە لە پێشدا ئاماژەیان پێکرا. بەو جیاوازییەوە کە ئەفلاتوون ئەمجارەیان جەختی لەسەر پیاوان کردۆتەوە و سەرنجی هەمووانی بۆ ئەم رەگەزە راکێشاوە[٣٥]. ئاشکرا و روونە کە بەهێزی و چەکوچۆڵ لە مەیدانی شەڕدا گرینگییەکی تایبەتیان هەیە و نابێ هیچ هێزێک لەکاتی شەڕدا پەراوێز بخرێ و دەبێ کەلک لە هەردووک باهۆ کەڵک وەگیردرێ[٣٦].

سێهەم: تێگەیشتنی یۆنانییەکان لەو نموونە هێماییانەی ئەفلاتوون بەنیسبەت درک و تێگەیشتنی ئێمە زۆر روون و ئاشکرا بووە. بۆ وێنە فیساغورسییەکان ژمارە جووتەکانیان (٢، ٤، ٦ ....) وەک رەگەزی مێینە لەقەڵەم دەدا کە خاوەنی شوناسی (چەپ)ن و لە جۆری (نگریس و بێ فەرەکان) واتە خراپە و تاریکییەکانن و ژمارە تاکەکانیش یا پیاوانیان بە (راست) و لە جۆری "(پیرۆز و پێ بەخێر) وەک خواکان، رووناکییەکان و شتە باشەکانی دیکە دەزانی.[٣٧]

چوارەم : ئەو خاڵانەی لە وتووێژی ئەفلاتووندا، هەن سەلمێنەری ئەوەن کە وشەی دەست و باهۆکان بەڕای ئەو بەمانای مرۆڤەکانن. بۆ وێنە لە کتێبی یاساکاندا لە زمانی ئەسینی (ئەفلاتوون)ەوە دەبیستین کە: "جیاوازییەکی قووڵ هەیە لە نێوان ئەوانەی فێرکراون و ئەوانەی فێر نەکراون و ئەو شەڕکەرانەی



پەروەردەکراون و ئەوانەی پەروەردەنەکراون.[٣٨] ئەم وتەیەش پەیوەندیی بەوڕاستییەوە هەیە کە ئەفلاتوون لە کۆتایی وتووێژەکەیدا دەیهێنێتەوە و ئەویش ئاوایە: "راهێنەران و مامۆستایانی منداڵان وریابن کە شان و باهۆی کوڕان و کچان بەهێزبن بۆ ئەوەی ئەو هێزەی سروشت پێی داون، بە هۆی عادەتەوە لە ناونەچێ"[٣٩]. ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکاندا بەڵگەگەلێکی جوانی سەبارەت بە لێهاتوویی و توانایی ژنان (هەڵبەت بە پارێزەوە) هێناوەتەوە. ئەو ئەم یاسایانەی بۆ کۆمەڵگایەک داڕشت کە لەڕووی بەختیارییەوە پلە دوو بوو. چونکە پێکهێنانی وەها کۆمەڵگایەک لە واقیع نزیکتر و لە کۆمەڵگەی ئاسمانی و یۆتۆپیا دوورتر بوو.[٤٠] ئەو دانی بەوە دانا کە تەنانەت دانانی ئەو یاسایانە بۆ هێندێک کەس زۆر ناخۆش بوون و زۆر کەس لێیان بێزارن.[٤١] بە سەرنجدان بەوەیکە ئەفلاتوون بۆ ئەم کۆمەڵگایە "نەچۆتە بنج و بنەوانی پارادایمی تەشقی جوانی و راستی و بە هێندی نەگرتووە"، ئەم بایەخ پێنەدانە لەبەر ئەوەیە کە "یاسادانەر، کۆمەڵگاکەی خۆی بە خەون دیتووە یا پێیوایە کە دەتوانێ شارێک لە "مێو*" دروست بکا و هەرچۆنێکی حەزی لێی بێ وای لێبکا".[٤٢] روون و ئاشکرایە کە مەبەستی ئەفلاتوون لە سەرنجدان بە تەشقی جوانی و راستی لە کۆمەڵگای بەختیاری پلە دوو دا دەزگای بنەماڵە بوو کە ژنان دەورێکی گرینگیان تێدا دەگێڕا و بەڕێوە بردنی ئەم رۆڵە لە کۆمەڵگای پلە دوودا کارێکی ئەستەم بوو. هەڵبەت ئەوشتە بە لای ئەفلاتوونەوە شتێکی سەیر نەبوو، چونکە "ئێمە بۆ خۆشمان دەزانین کە تەواوی ئەو رەخنانە بێ جێ نین و پێتان وانەبێ لە کاتی دانانی یاسا دا ئەو رەخنەگەلەم لەبەرچاو نەبووە. بەڵام من لەسەر ئەوەم کە هەرکات مرۆڤ بیهەوێ شتێک بخوڵقێنێ سەرەتا دەبێ تەشقی جوانی و راستی بکاتە پارادایمی خۆی بۆ ئەوەی بڵێ ئەو شتە دەبێ چۆن بێ ". لە کتێبی یاساکاندا باسێکی گرینگی تێدایە کە داهێنان، بیری نوێ و خوڵقێنەری، بۆ کۆمەڵگا وەک سەرمەشقی زۆر مەترسیدار دیاریکراون.[٤٣] لەوکاتدا تاوتوێکردنی کاروباری (سێکسی) شتێکی نوێ بوو و دەربڕینیشی گەلێک مەترسیدار. لە درێژەی باسەکەماندا ئەم مەسەلەیە زیاتر تاوتوێ دەکەین . لێرەدا و لەم پەیوەندییەدا

* مێو" ئەو ماددەیەی دەگەڵ هەنگوینە.

تەنیا دەبێ ئەوەندە بڵێین کە توێژەرانی بیروڕاکانی ئەفلاتوون سەبارەت بە لێهاتوویی و توانایی ژنان دوو بۆچوونیان خستۆتەڕوو. یەکیان ئەوەی کە ئەفلاتوون بۆ دەربڕینی دژبەریی خۆی دەگەڵ هەر جۆرە داهێنانێک لە میتۆدی گاڵتەپێکردن بەکەمگرتن و سووکایەتیکردن بە ژنان کەڵکی وەرگرتووە. بۆچوونی دووهەم پێیوایە گەلاڵەی توانایی و لێهاتوویی ژنان لە کۆماردا گەلاڵەیەکی کۆنە پارێزانە (کۆنزەرواتیڤ) و نەریتییە کە پشتی بە بەڵگەگەلی واقیعی و "زەوینی"یەوە بەستووە و بەلای خوێنەرەوە زیاتر جێی متمانەیە و سووکایەتیی کەمتر تێدایە. ئەوکاتەی ئەفلاتوون خەریکی نووسینی یاساکان بوو تێگەیشت کە؛ "سروشتی مرۆیی" ژنانی کۆمەڵگا پێگەیەکی شیاو و لە باری نییە. ئەگەرچی لەوانەیە کەسانێک ئیدعا بکەن کە ژنانی ئەوکات توانایی ئەوەیان بووە بگەنە ئاستی پیاوان و دەگەڵیان یەکسان بن. نموونەش بێننەوە کە: لەوکاتدا ئافرەتگەلێکی شەڕکەر بوونە کە شان بە شانی پیاوان دەستیان کردۆتەوە؛ بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەفلاتوون دۆخی ڕاستەقینەی ژنانی خستۆتەڕوو. لە ڕاستیدا ڕەوشی ژنان بە جۆرێک بووە کە لە هیچ شتێکدا دەگەڵ پیاوان یەکسان نەبوون و ئەو ڕۆڵ و ئەرکەش کە لەسەر شانیان بوو، ئەرک گەلێک بووە لە ئاستی کۆیلەکان، منداڵان و کەلوپەل و ماڵی پیاواندا. هەروەها ئەفلاتوون لە ڕەوتی کاردا بە شێوەیەکی فەرمی سەبارەت بە سروشتی ژنان دواوە و ئەم لێدوانانە تەواو بە ئاشکرا لێکدژ و پڕ لە جیاوازیدانان بوون.

بەو پێیە ژنان بۆیە شیاوی ئەوەبوون ئاوا نایەکسان دەگەڵیاندا هەڵسوکەوت بکرێ چونکە وەک پیاوان نەیاندەتوانی فەزیلەتی ئەخلاقی و ڕوحی وەدەست بێنن. ڕوون و ئاشکرایە کە پەروەردەی ئەفلاتوون لە باری ئەخلاقییەوە پەروەردەیەکی فەشەلە. لەبەر ئەوەی ئەم پەروەردەیە لە سەر ئەم تەوەر و بنەمایە دامەزراوە کە خراپە بەرهەمی پەروەردەی خراپ؛ ژینگەی نەخۆش و سەلیقەی نقوستانە و وەباڵی ئەم خراپەیەش "لە پلەی یەکەمدا لە ئەستۆی مامۆستایان و ڕاهێنەرانە نەک لە ئەستۆی لاوانی پەروەردە نەکراو.[٤٤]

ئەفلاتوون بەو ئاکامە دەگا کە هەلومەرجی ژیانی ڕۆژانە و ئەو پەروەردەی ژنان هەیانە؛ وەها بواریکیان بۆ نارەخسێنێ کە مەزناهی و فەزیلەت وەدەست



بێنن و پەرەی پێبدەن بۆ ئەوەی لەڕووی یەکسانی مافەوە بێنە ئاستی پیاوان. زۆربەی ئەم لێدوانانەی لە لایەن ئەفلاتوونەوە سەبارەت بە سروشتی ڕەگەزی ژن کراون لێدوان گەلێکن کە لەچوارچێوەی "چ جۆرە مۆسیقایەک بۆ ژن یا پیاو باشە" خول دەخۆن.[٤٥]. لێرەدا واباشە لە بیرمان بێ کە "مۆسیقا" ئاماژەیەکە بە مەسەلەی جوانناسی (ستاتیکا) کە لە بەرامبەر "فیزیک" دا دێتە گۆڕێ. بەکورتی هەروەکی دیتمان بەڕای ئەفلاتوون بۆ بیچم پێدانی کەسایەتیی مرۆڤ پەروەردە و فێرکردن یەکێکە لە گرینگترین ئامرازەکان.[٤٦]

لە لێدوانەکانی ئەفلاتووندا دوو مەسەلەی گرینگ بەدی دەکرێن: یەکێکیان وریایی دان سەبارەت بە مەترسییەکانی نوێخوازی بە تایبەت لە سەردەمی منداڵیدا کە لە کایە و سەما و گۆرانییەکاندا دێنە گۆڕێ و دووهەم: پێشنیاری ڕوون و بنەڕەتیانە (ڕادیکاڵ) و ڕاشکاوانەی ئەو (ئەفلاتوون)ە سەبارەت بە یەکسانیی پەروەردە و فێرکردن و کەڵک وەرگرتن لە هێز و وزەی ژنان. بۆ وێنە ئەو شتەی ئەسینی (ئەفلاتوون) پێشنیاری دەکا ئەوەیە کە ئەو گۆرانی و ئاوازانەی تایبەت بە کوران و کچان دەبێ بەپێی ڕەگەزی ئەوان لێک جیاکرێنەوە. بەواتایەکی دیکە و بە سەرنجدان بە جیاوازییە سروشتییەکانی دوو ڕەگەزەکە، دەبێ مۆسیقا و سرودگەلێکی تایبەت بۆ ژنان و پیاوان دابنرێ.

خاڵی سەرنجراکێش لەم پەیوەندییەدا ئەوەیە کە یاسادانەر دیاریی دەکا چ جۆرە مۆسیقایەک بۆ کامە ڕەگەز گونجاوە. ڕوون و بەرچاوە کە ئەم بابەتەش دەگەڵ ئەو شتەی ئەفلاتوون ناوی دەنێ دژبەریی سروشتی؛ ناتەبایی هەیە. بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە باشتروایە بە تەواوی ئەو شتە بێنینەوە کە ئەفلاتوون گوتوویەتی: "بێجگە لەوەش پێویستە ئەو گۆرانی و سروودانەی شیاوی ژنانن جیابکرێنەوە لەو سرودانەی کە پیاوان دەبێ بیانچڕن. بۆ ئەو مەبەستە یاسادانەر دەبێ یاسایەکی تایبەت دانێ و پێوەرێک بۆ لێکجیاکردنەوەی ئەم دوو ڕەگەزە لە یەکتر بخاتەڕوو. هەروەها هەرکام لە سروودەکانی ژنانە و پیاوانە دەبێ خاوەنی کێش و مۆسیقای گونجاو و هارمۆنیک بن و ئەو مۆسیقا و ئاوازانەی کە باس لە پاڵەوانێتی و بوێری دەکەن دەبێ تایبەتی پیاوان بن و ئاوازگەلی نەرم و نیان و هێدێ دەگەڵ ژنان یەک دەگرنەوە.[٤٧] ئەو بۆچوونانە دەبێ دەگەڵ ئەو قسانە

بەراورد بکرێن کە ئەفلاتوون لە دەرەنجامی کتێبی پێنجەمی کۆماردا هێناویێتی. چونکە لەوێدا ئەو بە پێچەوانەی ئەم وتەیە؛ ژنان و پیاوانی پارێزەری بە خاوەن "سروشتێکی وێکچوو" زانیوە. لێرەدا پێویستە بگوترێ کە وتەکانی ئەفلاتوون جیاوازیی سروشتیی نێوان دوو رەگەز دەرناخەن. بەڵکو خستنەڕووی یاسایەکە سەبارەت بە "جیاوازییە سروشتییەکانی دوو ڕەگەز" کە یاسادانەر بۆ ژنان و پیاوانی داناوە.[٤٨]

پێویستە ئەوەش بزانین کە ئەفلاتوون زیاتر حەزی لەوەبوو کە وەک ئیجازە نامەیەکی یاسایی لە وشەی "سروشت" و "جەوهەر" کەڵک وەرگرێ، ئەو هیچکات نەیویست وشەی "سروشت" بەواتای راستەقینەی خۆی بەکاربێنێ.

هەر بۆیەش وێنای ژنان لە هەر دوو کۆمەڵگاکەی ئەفلاتووندا، هەم کۆمەڵگای پلەیەک (یۆتۆپیا) و هەم کۆمەڵگای بەختیاری پلەدوودا، وێنایەکی پاردۆکسیکاڵە و بە ئاسانی ناتوانین لێیان تێبگەین. سەرەڕای ئەوەش لە بەڵگاندنەکانی ئەودا وشەی "سروشت" سەبارەت بەژنان، خاڵێکی زۆر گرینگە؛ چونکە ئەفلاتوون وەک نەریت و یاسای سروشتی Nomos کەڵک لەم وشەیە وەردەگرێ. بۆ وێنە ئەو، ئاژەڵەکان وەک نموونەیەک کە "ئاکاری سروشتییان" هەیە لە بەرامبەر ئاکاری ناسروشتییانەی مرۆڤەکاندا دێنێتەگۆڕێ. بە سەرنجدان بەوەی کە ئاکاری سروشتی ئاژەڵەکانی بەباش زانیوە و هەڵسوکەوتی ناسروشتیی مرۆڤەکانی بە شێکی گەندەڵی خوڵقێن لە قەڵەم داوە و ئەم نموونە و وێنایانە لە یۆنانی کەوندا؛ وێناگەلێکی ناسراو بوونە.

جەی ئێچ فاینلەی J.h. finley لە پێداچوونەوەی سەرلەنوێی نامیلکەکەیدا بەناوی چوار قۆناغی بیرۆکەی یۆنانی four stagesof creek Thouht جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "لە یۆنانی کەوندا مرۆڤەکان لە باری هەڵسوکەوتەوە خۆیان هیچ پێ گەورەتر نەبووە لە ئاژەڵەکان"[٤٩]. لەم پەیوەندییەدا یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی ئاریستۆفان ئەوەیە کە: "باڵندەکان" لە بەراورد دەگەڵ هەڵسوکەوتە ناسروشتی، گەندەڵی خوڵقێن و ئاڵۆزەکانی مرۆڤدا؛ خاوەنی ژیانێکی تەکووز و بەختەوەرن. بە پێی بۆچوونی جەی هۆم J.Hom ئەفلاتوون لەو باوەڕە کۆنەی یۆنانییەکان کەڵکی وەرگرتووە بۆ خستنەڕووی بیروڕاکانی خۆی؛ بەڵام ئێچ، دی،



رانکین H. P. Rankin باوەڕی وایە کە "ئەفلاتوون بە دڵنیایی لە بیرۆکە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیدا؛ بواری سروشتیی بەراوردی مرۆڤ و ئاژەڵەکانی نەهێناوەتە گۆڕێ بەڵکو بەراوردی مرۆڤ دەگەڵ ئاژەڵ لە یۆنانی کەوندا یارمەتیی کردووە بە گریمانەکانی ئەو".

بۆ وێنە هەروەکی لە کۆماردا دەگوترێ: دەسەڵاتداران پارێزەری مێگەلەکانن، تیۆرییەکی فەیلەسووفانەیە کە بە پێی سروشتی دەسەڵاتداران خراوەتەڕوو. بەواتایەکی دیکە پارێزەران ئەو گەماڵە پاسەوانانەن کە خاوەنی خەسڵەتگەلی بەئەمەگی و توانایین لەبەرامبەر حکوومەت و تووڕەیی و هێرش دوژمنانی حکوومەتدا.

لە پاشان؛ ئەفلاتوون ئاخرییەکەی لە زمانی سوقراتەوە لە تیۆریی پەروەردە و فێرکردنەکەیدا تیشکی خستە سەر رۆڵی ژنانی پارێزەر. ئەم تیۆرییە بەمجۆرەیە کە ئافرەتگەلێک لە نێو ژنەکانی دیکە بۆ کاری پاسەوانی هەڵدەبژێردرێن کە خاوەنی هێندێ تایبەتمەندیی دانسقەن. بۆ ئەوەی دەگەڵ پیاوانی پاسەوان جووت بن و بۆ بەردەوامی و مانەوەی وەچەو تۆرمەی مرۆڤ کەڵکیان لێوەرگیرێ. هەروەک چۆن ئاژەڵە رەسەنەکان بۆ گەراخستن و پەروەردەی توخمی رەسەنتر رادەگیرێن. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەچەیەکی بوێر، بە ئەمەگ و رەسەنتر و پاکتر بخوڵقێ*. ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکان و کۆماردا بۆ پێکهێنانی دوو کۆمەڵگەی پلەیەک و پلەدوو؛ ئەم بۆچوونەی دەربڕیوە و بەراشکاوی ئاماژەی کردووە بە رۆڵ و کاریگەریی پیاوانی پاسەوان و زاوزێ کردنی ژنە پاسەوانەکان بەمەبەستی خستنەوەی وەچەیەکی پاک و رەسەنتر. روون و ئاشکرایە کە ئەم تیۆرییە لە بیاڤی باسە عەقڵانییەکاندا بەتاڵەو لە بیاڤی کۆمەڵایەتیدا فەشەلی هێناوە. لەبەر ئەوەی پێوەرەکانی ئەفلاتوون بە شێوەیەکی دوور لە عەقڵ ساختەیین و پارامێترێکی ئەزموونکراون. شوێنێکی دیکەی کە ئەفلاتوون وەک ئیجازە نامە و بەڵگەی یاسایی کەڵکی وەرگرتووە لە هێنانە ئارای تیۆریی "سروشت" و "جەوهەر"، کاروباری جنسی (سێکس)ی ئاژەڵەکانە. ئەو لە بیاڤی ئاکاری سێکسیی مرۆڤەکان و بەراوردکردنی دەگەڵ کردەی سروشتی و سێکسیی ئاژەڵەکان بابەتگەلێکی لە کتێبی یاساکاندا هێناوەتە گۆڕێ: ئەفلاتوون

کردەی سێکسی «پیاو و پیاو» یا «ژن دەگەڵ ژن» (هۆمۆ سێکسیوالیتە) نەک دەگەڵ سروشتی رۆحی تەنانەت دەگەڵ سروشتی ئاژەڵیی مرۆڤ بە ناتەبا دەزانێ. لەبەر ئەوەی بەڕای ئەو "ئەم جۆرە کردە سێکسییە بە تەواوی لە نێو ئاژەڵەکاندا ناسراوە"[٥١]. لە روانگەی ئەفلاتوونەوە؛ مرۆڤ دەبێ دەرس وەرگرێ لە کردەی سێکسی ئاژەڵەکان کە لە سروشتیانەوە سەرچاوە دەگرێ و هەموو شتێکی سروشتی باشە بەو جۆرەی کە هۆمۆ سێکسیوالیتە لەنێو ئاژەڵاندا شتێکی نائاسابییە؛ مرۆڤەکانیش دەبێ خۆ لەم کارە ببوێرن.

بەو پێیە لە خۆڕایی نەبووە کە ئەفلاتوون هاووڵاتیانی دەگێڕاوە بۆ مێتودی کردەی سێکس و شێوە ژیانی پەلەوەران کە تاک ژنی و ئەمەگدارانەیە.[٥٢].لێرەدا دەبێ ئاماژە بە دوو خاڵ بکەین:

١- ئەو شتەی کە ئەفلاتوون لەو پەیوەندییەدا هۆشیارانە ئاماژەی پێ نەکردووە ئەوەیە کە ئاژەڵەکان لە کردەی جنسی (سێکس)ی خۆیاندا هیچ سنوورێکیان نییە و تاک ژنی ئەوان لە رووی یاسا و رێساوە نییە بەڵکو کردەیەکی وارسکەییە.

٢- ئەفلاتوون بە هۆی نووسراوەکانی هێرۆدۆتەوە ئاگاداری ناتەبایی و جیاوازیی کەلتووری و رێوڕەسم و دابونەریتەکانی کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان ببوو، و لەو جیاوازییە کەلتوورییانە بە قازانجی بەرەوپێشبردن و گەشەی بیروڕاکانی خۆی کەڵکی وەردەگرت.[٥٣]. ئەو دەیزانی کە ئەم دابونەریتانە لە کۆمەڵگاکاندا بوونەتە تابۆ و یاساگەلێکی پیرۆز و لە ئاستێکدان کە وەکو یاساگەلێکی سروشتی ئاماژەیان پێ دەکرێ و ئەگەر هاووڵاتییەک ئەم یاسا پیرۆزانە پێشێل بکا یا بێ حورمەتییان پێ بکا؛ کارێکی دژ بە سروشت و نامووس و یاسای کردووە و دەبێ شاربەدەر بکرێ. هەروەکی پێشتریش ئاماژەی پێکرا کاروبار و کردەی سێکسیش وەک تابۆ وابوون و دەبوایە بە پارێزەوە خۆی لێدرێ.

ئەفلاتوون ئەم مەسەلەیەی بە جوانی لەبەرچاوبوو، هەر کاتێکیش باسی نائاسایی بوونی هۆمۆسێکسیوالیتەیی دەکرد؛ دەگەڕاوە بۆ نەریتەکانی خەڵکی سپارتە. بۆ وێنە لە یاساکاندا هاتووە کە "ئەوانەی ملکەچ ناکەن بۆ یاساکانی نەهێشتنی هۆمۆسێکسیوالیتە ناتوانن دەگەڵ ئێمە کە ئەڤینداریی نێوان پیاو و کوڕ بە



شتێکی دژە سروشت دەزانین؛ هاودەنگ بن".[٥٤] ئەفلاتوون باش دەیزانی کە هاندانی خەڵک بۆ دەست هەڵگرتن لەو شتانەی لێیان بووەتە خووخدە و دابونەریت و بووەتە بەشێک لە یاسا و سروشتیان؛ کارێکی مەحاڵە و مەیسەر نابێ.

هێندێ شتی دیکە کە ئەفلاتوون لە نێو ئاخنی قسەکانیدا لەسەر خووخدە و دابونەریتی وڵاتان دەیکا؛ مەسەلەی خواردن (چێشت)ە لە سەرخوان و سفرە گشتییەکان. ئەو دەڵێ "خەڵک بڕوا ناکەن بەوەی کە تەواوی دانیشتوانی شارێک بتوانن لە تەواوی ژیانیاندا لەسەر سفرە گشتییەکان خواردن بخۆن هەرچەند لە رابردوودا وەها یاسایەک هەبووە. دیسان ئەوان دەڵێن، کە سروشتی رەگەزی ژن ئیزن نادا ژنان بێنە سەر سفرە گشتییەکان؛ چونکە ئەوکارە بۆ ژنان شتێکی نائاساییە، بەڵام بۆ پیاوان نا".[٥٥] هەروەها ئەفلاتوون لە کۆماردا و لە وەڵامی گلاوکێندا، کە پێی وابووە ئەگەر ژنان لە گۆڕەپانی وەرزش و زۆرانبازیدا رووت ببنەوە شتێکی سەیر و گاڵتەجاڕییە دەڵێ: "ئێمە نابێ لە گاڵتەی خەڵک بترسین: چونکە هەر قەیرێک پێش ئێستا؛ یۆنانییەکان رووت بوونەوەی پیاوانیشیان بە شتێکی خراپ دەزانی. هەروەک چۆن ئێستاش بەڕبەڕەکان هەروا دەڕواننە ئەم شتە، کاتێک لە دوورگەی کرێت و دواتر لە  سپارتەشدا زۆرانبازی داکەوت، ئیتر ئەم وەرزشە بەلای قەشمەری و گاڵتەچییەکانیشەوە شتێکی سەیر و جێی لۆمەکردن نەبوو.[٥٦] ئەو شتانەی وتران، ئەوە دەردەخەن کە ئەفلاتوون بە دەگمەن باسی لە "سروشت" کردووە و زیاتر چووەتە سەر "نەریتە بگۆڕەکان. بەواتایەکی دیکە ئەو؛ بەردەوام ئەوشتەی پەیوەندیی بە nomos یا یاسا و خووخدەوە هەیە، بەجێی Physis یا سروشت و جەوهەرەی شتەکان بەکاری هێناوە و ئەم بەکارهێنانەش، بەکارهێنانێکی وشیارانە بوو. ئەفلاتوون بە جوانی لەوە گەیشتبوو کە ئەم  دابونەریتانە دەگەڵ "تۆبزی* سروشتی" وەک یاسایان لێهاتووە و لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی دیکە دەگۆڕدرێن و جیاوازن. بەو پێیە ئەفلاتوون؛ ئەو شتانەی کە لە بیاڤی nomos دا بە یاسا و خووخدە لە قەڵەم دەدران، لە بیاڤی physis دا وەک "سروشتی" و "جەوهەری" باسی لێدەکردن؛ لەبەر ئەوەی کە ئەو هێزی تابۆکان (یاساپیرۆزەکان)ی دەناسی و لە کاروباری

* تۆبزی سروشتی: (جبر طبیعی)

یاساداناندا بەردەوام کەڵکی لێوەردەگرتن. بۆ وێنە؛ (زیناح دەگەڵ مەحرەم) نموونەیەکی پڕ بەپێستە. ئەفلاتوون لە کتێبی یاساکاندا ئەوە بیر دەخاتەوە کە "زۆربەی خەڵک وێڕای ئەوەی کە گوێیان بە پێشێلکردنی یاسا نابزوێ؛ بەڵام لە هێندێ شتی تایبەتدا خۆ لە سێکس دەبوێرن، ئەویش زیناحە دەگەڵ مەحرەمان. تەنانەت زۆربەیان وەها بیر و خەیاڵێک هەر بەمێشکیشیان دانایە، چونکە بیر و باوەڕی گشتی بەکردەیەکی قیزەون و دزێوی دەزانێ و بێ لێبووردن ئیدانەی دەکا. بەو جۆرە ئەگەر یاسادانەر بیهەوێ ئەو حەز و ئینتما بەتینە (سێکسییانە) لغاو بکا کە لە ناخی مرۆڤدا شاراوەن لە دەستی دێ لەبەر ئەوە هەر ئەوەندەی بەسە کە متمانە و سەرنجی خەڵک بۆ ئەم یاسایانە راکێشێ و لەبەر چاویان بڤەو پیرۆزیان بکا.[٥٧]

ئەفلاتوون لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە دەکرێ وەکو چەکێک بۆ دژبەری یا هاوڕایی دەگەڵ یاسا؛ لە باوەڕی خەڵک کەڵک وەرگرین. بۆ وێنە یاسادانەر بە پەسندکردنی یاساکان و کەڵک وەرگرتن لە "باوەڕی گشتی" و "تابۆ"کان، دەتوانێ بەرپەرچی هەموو ئەو شتانە بداتەوە کە دژی بەختەوەری و (فەزیلەت) مەزناهیی خەڵکن، وەک کردەی سێکسی نائاسایی (هۆموسێکسوالیتە) یاسێکس دەگەڵ ژنی بەمێرد (زنای محصنە). دەشتوانێ داکۆکیی لەو شتانە بکا کە لە بەرژەوەندیی خەڵکدان و بۆ چاک کردنی نەژادی خەڵک بەکەڵکن. بۆ ئەم مەبەستە دەکرێ یاساگەلێک دامەزرێنێ و بە باشترین شێوە لەلای خەڵک پیرۆزی بکا.

بۆ وێنە یاسادانەر دەتوانێ سیستەمی ژن و مێردایەتیی پاسەوانان کە سیستەمێکی هاوبەشییە وەک یاساو "تابۆ"ی لە قەڵەم بدا[٥٨].

دەقی وتووێژەکانی یاساکان و کۆمار، ئەوە دەردەخەن کە ئەفلاتون پێوەرە سەرەکییەکانی کاروبارە عەقڵی و لۆژیکییەکان لە بری کاروباری سروشتی و جەوهەرییەکان؛ دەکار بەکاردێنێ هەروەها بۆ بایەخدان بە بەڵگاندنە عەقڵییەکانی خۆی؛ بە تەواوی کەڵک لە یاسا بەهێزەکانی سروشتی وەردەگرێ. راستییەکەی ئەوەیە کە ئەوە بەڵگاندنی فەیلەسووفانەن کە دیاریی دەکەن چ شتێک "سروشتی" و "جەوهەر"ین و ئەوە فەیلەسووفەکانن کە ئەو دابونەریت و خووخدانە بە قازانجی کۆمەڵگای دەزانن وەک دیاردەی سروشتی بەخەڵکیان دەناسێنن.



بەوپێیە کەڵکوەرگرتنی ئامرازی لە "سروشتی" و "جەوهەری" سەبارەت بە ژنان، مەسەلەیەکی گرینگە لە فەلسەفەی سیاسیی ئەفلاتووندا؛ چونکە ئەو بەپێی ئەزموون و تاقیکارییەکانی خۆی بەوە گەیبوو کە هیچ هۆکارێکی ماقووڵ دەگۆڕێدانییە بۆ دیاریکردن و دەسنیشانکردنی "سروشتی" ژن. سروشتی لێک جیاوازی ژنانی ئەسینی و سپارتی سەلمێنەری ئەو شتەبوو. هەروەها ئەفلاتوون دەیزانی کە ژنانی ئامازۆن و سوماترایی نموونەی ئەو جۆرە ژنانەن کە هێچگار جیاوازن لە روانگەی پیاوان؛ واتە دەور و رۆلی ژنانی ئامازۆن و سوماترا لە بەڕێوەبەریی کۆمەڵگای خۆیاندا زۆر جیاوازە لە روانگەی پیاوان کە ئەوانیان پێ زەعیفە و ملکەچ و ژێردەستەیەو خوویان بەوە گرتووە. ئەفلاتوون بە دەربڕینی ئەوەکە "ژنانی سپارتە وەک پیاوانن و شان بە شانی پیاوان دەچنە شەڕێ و بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە." [٥٩] کەڵک لە پەروەردەی ژنان وەردەگرێ. هەر ئەوەش بە روونی دەریدەخا کە ئەو بە ناساندنی کۆمەڵگا و دوو جۆر "سروشت" و "جەوهەرەی" جیاوازی ژن؛ نەک هەر دان بە سروشتە جیاوازەکانی ژنان دادێنێ، بەڵکو ئەوەش پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەوە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکانن کە بیچمی سروشتیی ژن دیاری دەکەن. بۆ وێنە لە ناوبردنی خاوەنداریتی و دەزگای بنەماڵە بۆ چینی پاسەوانان کە لە کۆماردا باسی لێوەکراوە بووە هۆی ئەوەی کە کەشی نەریتیی رۆڵی ژنان لەناوبچێ و مەودای نێوان پیاو و ژن کەمتر بێتەوە و لێک نزیکتر ببنەوە. بەواتایەکی دیکە ئەوکاتەی ئەفلاتوون وتی سروشتی ژنە پاسەوانەکان دەگەڵ پیاوانی پاسەوان هاوشێوەیە و لە ئاستێکدان، ئەوەی لێکداوتەوە کە ئەو ئەگەر بە شێوەی رێژەییش بێ دانی بە یەکسانیی مافی ژناندا هێنا لە بوارەکانی پەروەردە و فێرکردن و بوارگەلی دیکەشدا. بەوشێوەیە ژن و پیاوی پاسەوانی بە خاوەن کەسایەتی و رەوشتێکی تایبەت زانیوە. بۆ وێنە؛ ئەوان بێجگە لەوەی کە بوێر و نەجیبن*، بە پێی پەروەردەکردن و راهێنانیان بە شێوەیەکی یەکسان، بەهاگەلێکی جوانی دیکەشیان هەیە کە بۆ کۆمەڵگا بە کەڵکن.

دیارە کە ئامانجی کۆمەڵگایەک کە لەسەر بنەمای تێکدانی رۆڵ و دەورە رەگەزییەکان دامەزراوە؛ دوورە لە ئامانجەکانی کۆمەڵگا نەریتییەکان. ئەفلاتوون

* نەجیب: نەجیم واتە بە حەیا و بە شەرم

باسی لەو ئامانجانە و پەروەردەی هاوبەشیی ژنان کرد لە کۆمەڵگای پلە یەکدا، بۆ ئەوەی رۆڵ و دەورە رەگەزییە نەریتییەکان لە ناو بەرێ. بەڵام لەولاوە، "لە کۆمەڵگای بەختیاری پلەدوو" و هەروەها لە کتێبی یاساکاندا باسی دەکا، داکۆکی دەکا لە خاوەندارێتی تایبەت و دامەزراندنی سیستەمی تاکە ژنی و دەزگای بنەماڵە و جارێکی دیکەش لە رۆڵی "ژنانی تایبەتدا" ژنان دەناسێنێ. ئەگەرچی ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماردا بەگشتی زۆر بەهێزتر باس لە توانایی و پێگەی ژنان دەکا لە چاولێدوانەکانی لە یاساکاندا، بەڵام بە هۆی دۆخی ئابووری و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی نەیتوانیوە ئاڵوگۆڕێ بەسەر رۆڵ و پێگەی ژناندا بێنێ. ئەو کۆمەڵگایەی ئەفلاتوون لە یاساکاندا وێنای دەکا کۆمەڵگایەکە؛ کە لەوێدا "سروشتی ژن" جیاوازە لە "سروشتی پیاو." ئەو ژن وەک بوونەوەرێک پێناسە دەکا کە دەبێ خاوەنی رەچەڵەکێکی رەسەن بێ، ئەوسا شیاوی ئەوە دەبێ کە ببێتە ژنی تایبەتیی پیاو و هاوسەرێک، کە وەک میراتگری یاسایی؛ پاراستن و چاودێریی ماڵ و سامانی پیاوی بکەوێتە ئەستۆ.

هەروەها ژنان لە یاساکاندا، بوونەوەرگەلێکن کە لە چاو پیاوان تواناییەکی کەمتریان هەیە لە فێربوون و وەدەستهێنانی مەزناهی و فەزیلەتدا و لەبەر "سروشتە" گەندەڵەکەیان دەبێ بە دانسقە و تایبەت پەروەردە بکرێن. کۆمەڵگای ئەفلاتوونی لە یاساکاندا بە شوێن ئەوەدایە کە ئەو مەسەلەیە جێگیر کە ژن "بە شێوەیەکی سروشتی" گەندەڵە و گەندەڵی لە ناخیدا هێلانەی کردووە هەر بۆیەش ژنان پێویستە لە شوێنێکی داخراو و تایبەتی وەک چوارچێوەی ماڵێدا بمێننەوە. کەچی ئەفلاتوون لە کۆماردا باس لە ئافرەتگەلێک دەکا کە بوێری و دڵۆڤانییان تێدایەو لە ئاستی پیاوان دان و لە حکوومەتی ئایدیالدا رۆڵی پاسەوانی دەبینن. پێویستە ئەو خاڵە گرینگە بێنینەوە یاد، کە ئەفلاتوون وێڕای ئەوەی کە لە کۆماردا بۆچوونێکی شۆڕشگێڕانەی سەبارەت بە "ژنانی پاسەوان" هەبوو؛ بەڵام نەیتوانی پێگە و توانایی ژنان لەوە زیاتر بەرێتە سەرێ کە هەیانبوو. چونکە کاتێک ئەو باس لە "سروشتی" ژنان دەکا؛ لە راستیدا مەبەستی ئەو "سروشتە" نییە کە پیاوان هەیانە. ئەو بەردەوام توانیوێتی لە دەرەنجامی باسەکانیدا بە کەڵک وەرگرتن لە خوازە و هێمای خێرا سەبارەت بە توانایيە گەشەنەکردووەکانی ژنان؛ مەبەست و



ئاکامە دڵخوازەکانی خۆی بپێکێ، کە ئەویش خستنەڕووی وێنەی ژنە وەک ملْک و ماڵی پیاو و رەگەزی دووهەم. ئەو جیاوازییە بەرچاوەی سەبارەت بە رۆڵ و ئەرکی ژنان لە دوو کتێبی کۆمار و یاساکاندا باسیان کراوە، لەوەڕا سەرچاوە ناگرن کە ئەفلاتوون بیروباوەڕی خۆی سەبارەت بە "سروشت" و "توانایی" ژنان گۆڕیوە، بەڵکو بە پێچەوانە، باوەڕی ئەو لەم بابەتەوە زۆر پتەوتربووە لە رابردوو. لە راستیدا ئەو جیاوازییانە لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە ئەفلاتوون لە سەرەتای وتووێژەکانیدا داکۆکیی کردووە لە نەبوونی خاوەندارێتی تایبەت و لەناوچوونی دەزگای بنەماڵە. بەڵام دوایی، واتە لە درێژە و کۆتایی لێدوانەکانیدا، بیروڕای دەگۆڕدرێ. ئەو دیسان گەلاڵەی خاوەندارێتی تایبەت و رۆڵی دەزگای بنەماڵە لە کۆمەڵگادا، دادەڕێژێتەوە و مەسەلەی ژن و ئەرکەکانی لە بنەماڵەدا بە شێوەیەکی یاسایی و رێسایی بە جۆرێک دەنووسێتەوە کە خوێنەرەکانی بەوە قایل بکا کە ژن بە پێی "سروشتی" ژن بوونیەوە، رۆڵ و بەرپرسیارەتییەکانی لە کۆمەڵگادا بۆ دیاریکراوە. کاکڵی قسەکەی ئەفلاتوون ئەوەیە کە؛ ژن بێنێتە سەر ئەو رایە کە ئەو بە شێوەیەکی جەوهەری و زاتی پاشکۆ و موڵکی تایبەتیی پیاوە.

## بەشی چوارەم:

# تاوتوێکردنی ڕوانگەی ئەرەستۆ
# پێگەو سروشتی ژن لە جیهانی ئەرکوەخۆگردا

فەلسەفەی ئەرەستۆ لە ئامانج و شێوەی ئاخافتندا جیاوازییەکی بەرچاوی دەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوون هەیە. ئەرەستۆ خاوەنراو بیرمەندێکی ئینتزاعی (ئابستراکتەر)ە هەربۆیەش دەکەوێتە جەمسەرێکی تەواو دژبەری ئەفلاتوونەوە. بە واتایەکی دیکە ئەفلاتوون لە سەرانسەری لێدوانە ڕەخنەییەکانی خۆیدا، کە زیاتر لە سەر بابەت و پارامێترە تابۆ و پیرۆزەکان بوون و دەکەوتنە ریزی ڕێوڕەسم و دابونەریتەکانی جیهانی ئەوکات؛ مشتومڕ و گەنگەشەی دەکرد و ڕاشکاوانە و بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ داکۆکیی لە بیروباوەڕەکانی دەکرد... بەڵام ئەرەستۆ وەشوێن شتگەلێک دەکەوت کە لەو کاتدا خەڵک فێری ببوون و باوی بوو لە نێوایندا و ئەویش هەوڵی دەدا کە لە ڕێگەی مەعریفە و زانیاریی ئەزموون کراوەوە دیاردەکان و هۆی سەرهەڵدانیان بناسێ. وێناچێ هیچ فەیلەسووفێک تەنانەت هێگلیش کە دەکرێ کارەکانی بە نموونەی بەرزی گەنگەشە فەلسەفییەکان لە قەڵەم دەین؛ سەبارەت بە فەلسەفە بەم ئاکام و پێناسەیە گەیشتبێ کە: "فەلسەفە بۆچوون گەلێکە، کە لە چوارچێوە (ظرف) و جۆگرافیای کاتدا خۆی دەردەخاو دەرکی پێدەکرێ."[1] ئەرەستۆ سەبارەت بە مەعریفە و ناسینی ئەزموونی (ئەزموونکراو) دەڵێ: مرۆڤ لە هەستێکی پاژەکی (تۆسقاڵە هەستێک)ەوە بەرەو مەعریفە ڕۆیشتووەو وردە وردە ئەو واتا گشتییەی کە بە شێوەیەکی پەنگراو (بالقوە)* لە و هەستە دابوە؛ بە پراکتیکی کردووە.

بەواتایەکی تر؛ هەموو مەعریفەیەک لە هەستەوە دەستپێدەکا؛ هەستێکی بچووک کە لە شوێنکاتێکی دیاریکراو دایە تەرخانە بۆ کەسێکی تایبەت کە ئەم

* بالقوە=هێزو وزەیەک کە لە شوێنێکدا کۆبۆتەوە، بەڵام هێشتا نەخراوەتە کار.(وەرگێڕی کوردی)



مەعریفەیە دواتر، لە ئاراستەی گۆڕاندا دەکەوێتە سەر گەڕی خۆی. لەم گۆڕانەدا هەر مەعریفەیەی لە مەعریفەیەکەوە سەرچاوە دەگرێ کە بەر لەو لە ئارادابووە. واتە پلەی بالاتری مەعریفە لە پێشدا بە شێوەی پەنگراو (بالقوە) لە ئاستی خوارەوەتردا هەبووە"[2]. ئەرەستۆ لەسەر ئەم باوەڕەیە کە لێکۆڵینەوە زانستییەکان بە قەدرایی دیتنی بابەتەکانی ئەم جیهانە ساکارنین، چونکە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەو شتەیە کە تیشک دەخاتە سەر تەشقی هۆکار (علت غایی)ی شتەکان. هەروەها لەڕوانگەی ئەوەوە دەبێ تەشقی هۆکار؛ بەوشێوەی کەهەن و هەستیان پێدەکرێن خوێندنەوەیان بۆ بکرێ.

ئەفلاتوون هەوڵی بۆ ئەوەدەدا کە لێدوانەکانی خۆی لەسەر مەسەلە جۆراوجۆرەکان بە شێوەی بەڵگاندنی فەلسەفی و باو؛ دەربڕێ. هەر بۆیەش میتۆدگەلێکی تیۆری و دیار لە وتە و لێدوانە ڕەخنەییەکانیدا باو بوون. بەڵام ئەرەستۆ لەدەربڕینی بیروڕا فەلسەفییەکانیدا؛ میتۆدگەلێکی لێکۆڵینەوەیی دەخستەڕوو کە لە میتۆدەکانی ئەفلاتوون جیاواز بوون.

بۆ وێنە: ئەو لە ئەخلاقی نیکۆماخۆس و لە شرۆڤەی مەزناهی (فضیلت)دا ئاماژە بۆ میتۆدی لێکۆڵینەوە دەکا و دەڵێ: "پێویستە مەزناهیش وەک شتەکانی دیکە بە پێی بینراوەکان (مشهودات) تاوتوێ بکرێن بۆ ئەوەی "مەتەڵەکە هەڵێنین*." لەم شێوازەدا پێویستە بیروڕا لێک نزیک و هاوڕاکان لە سەر بابەتێک؛ کۆبکرێنەوە و ئەگەر کۆکردنەوەی بیروڕا لێک نزیکەکانیش مەیسەل نابێ زیاترین و گرینگترینیان بۆ سەلماندنی گریمانەکەی ئێمە پێویستن. ئەگەر بیروڕا لێک نزیکەکان ڕاستیی گریمانەیەکیان سەلماند؛ ئەو هۆیە بەسە بۆ قبووڵکردنی ئەم گریمانەیە"[3].

ئەرەستۆ وەک فەیلەسووفێکی ئەخلاقی بیروباوەڕەکانی خۆی دێنێتە ئاراوە و لەم ڕووەوە لە باوەڕە باو و دیارەکانی خۆیدا؛ خۆدەبوێرێ لەو شتەی کە لەوانەیە تووشی دژوازوێژی و هاتەران پاتەرانی بکا.[4] ئەخلاقی ئەرەستۆ لە ڕەهەندێکی هەراودا؛ ئەخلاقێکی نەریتی و ڕاشکاوانە و بەڵگەمەندە و بە پێچەوانەی ئەفلاتوون کە یاسا ئەخلاقییەکانی بۆ سەردەمێکی دیکەی جیاواز لە

* مەتەڵ هەڵێنان: کردنەوەی پازڵ و معما.

سەردەمی خۆی دانرابوون، ئەرەستۆ باس لە دۆخی هەنووکەیی statusquo دنیای واقیع لە سەردەمی خۆیدا، دەکا و لە روانگەی سروشت و جڤاتەوە باوەڕەکانی خەڵک لێکدەداتەوە و ئەم دوو هەرێمە (سروشت و جڤات) بە باشترین میتۆد دەزانێ بۆ خستنەڕووی بیروڕاکانی خۆی. دیارە ناکرێ بە سادە و ساکاری وەک گریمانەگەلێکی دەمارگرژانە و چەقبەستوو لە دەستکەوتە کۆنسێرڤاتیڤییەکانی ئەرەستۆ بڕوانین چونکە ئەو شێوازێکی عەقڵانییەتی تایبەت رەچاودەکا ئەرەستۆ پێیوایە دەبێ بابەتە سروشتییەکان بەو جۆرە تاوتوێ بکرێن کە هەن. ئەگەر ئەوان؛ ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە بە جوانی بەجێی بگەیەنن؛ راوەستاو و هەرماو دەمێننەوە ئەگینا تێدادەچن. بۆ وێنە؛ ئەرەستۆ لە سەرەتای کتێبی سیاسەتدا دەڵێ: ماهییەتی هەر شتێک بەو ئەرکانەوە بەستراوەتەوە کە بەپێی تواناییەکانی بۆی دیاریکراوە، بەجۆرێک کە ئەگەر نەیتوانی ئەم ئەرکانە جێبەجێ بکا؛ نابێ ئەو حسێبەی بۆ بکەین"[٥].

دوورە دیمەنی تێۆریی ئەرکوەخۆگرانەی ئەرەستۆ ئەوە دەردەخا کە ئەو گرینگی و بایەخ دەدا بەجیهانی جەوهەر و زات. ئەگەرچی psyche "جەوهەر" تایبەتمەندییەکە؛ کە تەنیا لەگیانلەبەراندا بەدی دەکرێ. بەڵام وێڕای ئەوەش، ئەرەستۆ لە هێنانە گۆڕێی بەراوردی جەوهەری و جەستەدا؛ ئاماژە دەکا بۆ نموونەی تیژیی تەور و بینایی چاو. بەواتایەکی دیکە؛ تیژێتی تەور جەوهەرەی تەورە و تەورەکەش جەستەیە، یا چاو وەک جەستە و بیناییش بە جەوهەرەکەی لەقەڵەم دەدرێ. بە بۆچوونی ئەرەستۆ: "ئەگەر تەور وەک جەستە چاولێکرێ؛ تیژێتی بە جەوهەرەکەی زانراوە". واتە ئەگەر جەوهەرەکەی تەور واتە تیژێتییەکەی لێ بستێنیتەوە ئیتر ناکرێ ناوی تەور لەسەر ئەم ئامێرە دانرێ مەگەر ئەوەی کە تەور واتایەکی دوولایەنی هەبێ. هەروەها دەڵێ: "ئەگەر چاو وەک شتێکی جەستەیی سەیر بکەین؛ بینایی بە جەوهەرەی ئەم جەستەیە دەزانرێ."[٦] لێرەدا دەکرێ بە روونی لەوە تێبگەین کە بەڕای ئەرەستۆ جەوهەرە (نفس) ئەو شتەیە کە بتوانێ بەوپەڕی توانایی ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکا. وێڕای ئەوەش، جەوهەر شتێکی سەربەخۆ و رەبەن (ئەبستراکت) نییە کە بتوانێ بخزێتە هەر لەشێکی کە بیهەوێ یا بۆ هەر چارەنووسێکی رۆحیی کە پێویستیی



پێی بێ؛ یا ئەوەی کە ئەو لەشەی تێیدایە بەجێی بێڵێ بۆ ئەوەی بچێتە لەشێکی دیکەوە؛ بەڵکو هەرکام لەگیانلەبەرەکان "گیان" و جەوهەرێکی تایبەت بەخۆیانیان هەیە کە دەگەڵ جەستەیان یەک دەگرێتەوە و لەو جەستە و لەشەدا نەبێ ناتوانێ چالاکی بنوێنێ و بجووڵێ.[٧] ئەرەستۆ پەیوەندیی نێوان جەوهەر (زات) و جەستە وەک پەیوەندیی نێوان ئامێر و خاوەن ئامێر لێکدەداتەوە و دەڵێ: "هەر پیشەیەک ئامێری تایبەت بەخۆی هەیە و هەر جەوهەرێکیش لەشێکی تایبەت بەخۆی." بەواتایەکی تر؛ هەر جەوهەرێک پێویستیی بە لەشێکی دیاریکراوە و گۆڕینی جۆری ئەم جەستەیەش پێویستیی بەوە هەیە کە جەوهەرێکی دیکە سەر هەڵدا کە لە قۆناغێکی دیکەدایە. ئەگەر ئەو رایەمان قبووڵ بێ کە دەڵێ: یەک جەوهەر (گیان) دەتوانێ لە چەند لەشدا بێ؛ وەک ئەوە وایە بڵێین کابرایەکی دارتاش بۆ ئەوەی پیشەکەی خۆی بخاتەگەڕ؛ دەتوانێ لە بری کەرەسە و ئامێری دارتاشی لە ئامێری مۆسیقایی کەڵک وەرگرێ و ئەوەش گریمانەیەکی بەتاڵە. چونکە وەک ئەوە وایە کە بڵێین دەکرێ پیشەی دارتاشی بە قامیش (نەی) جێبەجێ بکرێ و بەڕێوەبچێ. راستییەکەی ئەوەیە کە هەر پیشەیەک دەبێ کەڵک لە ئامراز و ئامێرە تایبەتییەکانی خۆی وەرگرێ و هەر گیانێکیش پێویستە لەشی تایبەت بەخۆی هەبێ[٨].

لە تێۆریی ئەرک وەخۆگریی ئەرەستۆدا؛ بوونەوەرەکان بە پێی ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە پۆلێن بەندی دەکرێن و دەناسرێن و ئەو نموونانەی لە ئامێر و پاژەکانی لەش باسیان لێکرا نموونەگەلێکن کە ئەو سەبارەت بە ئەرک وەخۆگریی شتەکان دەیانخاتە بەرباس. ئەرەستۆ تێۆرییەک دێنێتەگۆڕێ کە بە پێی بەراوردێکی لۆژیکی، پێویستە گیانلەبەران لە پەیوەندی دەگەڵ یەکتر و ژینگەکەیاندا هەڵسەنگێندرێن. ئەوە لە حاڵێکدایە کە لەوەپێش؛ دیموکرتیوس فەیلەسووفی سروشتی، پێویستی دیاردە سروشتییەکانی هەست پێ کردبوو. ئەرەستۆش بۆیە رەخنەی لەم بۆچوونە گرت چونکە ئەو تەشقی هۆکار (علت غایی)ی لەبەرچاو نەگرتبوو بەڵکو لە نێو دیاردە سروشتییەکان دەریشی هاویشتبوو. ئەرەستۆ ئەوەی قبووڵ کردبوو کە (هەڵبەت ئەوە راستە کە ئەو شتانەی سروشت بەکاریان دێنێ) لە پێویستییەکانن. ئەڵام دیاردەکان بە شێوەی

هاوکات خاوەنی ئامانج و دوائامانجن؛ چونکە لە هەموو کارێکیدا یەکێکیان لە ئەوی دیکە هەر باشترە"[٩].

دونیابینی ئەرەستۆ، دونیابینییەکی هیرارشییە hierarchy؛ واتە ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە بوونەوەرەکان؛ ئیدی لە گژوگیایەکی بێ کەڵکەوە بگرە هەتا دەگاتە مرۆڤ و سەرووتر لە مرۆڤ و هەتا شتە گەردوونییەکان و خواکان؛ هەر هەموویان بە شێوەیەکی هیرارشی ڕێکخراون. ئەرەستۆ بەو سیستەمە هیرارشییەوەیە کە دەڵێ: "هەم لە جیهانی سروشت و هەم لە جیهانی هونەردا؛ ئەوانی خوارەوە هەمیشە بۆ خزمەتکردنی مەزنەکان خوڵقاون."[١٠]

هەر بۆیەش ئەو بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کە: "سروشت هیچ شتێکی لە خۆڕایی بێ کەڵک ناخوڵقێنێ". ئەرەستۆ لە لێدوانەکانیدا دەڵێ: "گژوگیاکان خوڵقاون بۆ ئەوەی بوونەوەرەکان تێرکەن و بوونەوەرەکانیش مرۆڤەکان." لێرەدا بە روونی دەردەکەوێ کە مرۆڤ لە بەرزترین پلەی ئەم بوونەوەرانە دایە کە مەرگیان لە پێشە و "تەواوی ئەو ئاژەڵانەی سروشت خوڵقاندوونی، لەبەر مرۆڤەکان و بۆ خزمەت بەوانە"[١١].

ئەم روانگەیەی ئەرەستۆ لەو باوەڕەوە سەرچاوە دەگرێ کە: مرۆڤ سەروەری ئەفرێنراوەکانە و بناغەی جیهانی بوونەوەرانە. بەڵام خاڵێک کە سەبارەت بە مرۆڤەکان واتە مەزنترین بوونەوەر؛ دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە کە نەژادی مرۆڤ خۆی سیستەمێکی هیرارشیی هەیە. لێرەدا پێویستە بابەتێک لە پەراوێزەوە باس بکەین و دواتر بچینە سەر درێژەی مەسەلە و ئەرکەکانی مرۆڤ.

ئەرەستۆ لە پرۆسەی خوێندنەوە و موتالا و لێکۆڵینەوەکانیدا؛ هێندێ مەسەلەی (قضایا) نەگۆڕی بۆ دەردەکەوێ کە دەبنە بنەمای فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەتی ئەو. بەواتایەکی دیکە ئەم مەسەلە نەگۆڕانەن دەبنە هۆی ئەوەی کە بڵێ: شاری یۆنانی Polis شارێکە؛ کە بەپێی سروشت دروستکراوە و باشترین شێوە (بیچم)ی کۆمەڵگای سیاسییە و دوای ئەویش بنەماڵەی یۆنانی بەلقەکانییەوە؛ واتە بە ژن و منداڵ و کۆیلەکانەوە؛ شتێکی سروشتی و باشترین شێوەی دەزگای بنەماڵەیە. دیارە ئێمە لەو پەیوەندییەدا [دەبێ] سەرەتا باس



لەوشتانە بکەین کە ئەرەستۆ سەبارەت بە ئەرکی مرۆڤەکان باوەڕی پێیان بوو. ئەرەستۆ لە سەرەتای ئەخلاقی نیکوماخوسدا دەڵێ: بەختەوەری، دوایین قۆناغە کە مرۆڤ تێیدا دەوڵەمەندە و پێویستی بە چالاکی نییە. ئەو پاش ئەوەی باس لە ئامرازی بەختەوەری دەکا دەڵێ: "ئەگەر بتوانین ئەرکەکانی مرۆڤ دەستنیشان بکەین؛ ئەوجار دەتوانین بەختەوەریی پێ بدەین."[١٢] بەگشتی لەم جیهانەدا ئەو ئەرکانەی تایبەت بە مرۆڤن؛ بە پێچەوانەی ئەرکی بوونەوەرەکانی خوارەوەتر؛ ئیدی خزمەت بەشتێکی سەرووتر لەخۆی نییە چونکە لەو هیرارشییەی جیهانی "هایدن*" دا هیچ بوونەوەرێک لە مرۆڤ سەرووتر و مەزنتر نییە. بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە مرۆڤ لە هێندێ تایبەتمەندیدا وەک: خواردن و هەڵدان (گەورەبوون) و هەست؛ دەگەڵ بوونەوەرەکانی نزمتر لەخۆی هاوبەشە و وەک یەکن. بە پێی باوەڕی ئەرەستۆ ئەو شتەی مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە هێزی ئاوەز و عەقڵ و بەڵگەهێنانەوەیە و "تۆخمی ژیانی چالاک کە بنەمایەکی لۆژیکیانەی هەیە"[١٣] پارامێتری گەورەیەتیی مرۆڤە. پەیوەندیی مرۆڤ دەگەڵ سەرووتر لەخۆی (خواکان) بە پێی خزمەتپێکردن نییە، بەڵکو ئەوە هێزی ئاوەز و بەڵگاندنە کە ئەوان بە خۆاکانەوە گرێدەدا و ئەو کارەش بۆ مرۆڤ بەختەوەرییە. بەواتایەکی دیکە ئاوەزمەندیی مرۆڤ لەبەر دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵک نییە؛ بەڵکو لەبەر خۆیەتی بۆ ئەوەی بتوانێ لەو ڕێگەیەوە بگاتە بەختەوەری. ئەرەستۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە خواکانیش وەک مرۆڤ خاوەنی جەستە و چاکە و خەسڵەتە مرۆییەکانن؛ هەروەها ئەو باش دەیزانی خواکان بەو جۆرەی کەهەن؛ وێنەیەکن کە مرۆڤ کێشاونێتەوە و وێنای کردوون. ئەرەستۆ بۆ ئەوەیان دەڵێ: "ئێمە هەروەکی پێمان وایە شێوەی خواکان لە ئێمە دەچن؛ پێمان وایە ژیانیشیان هەر لە ژیانی ئێمە دەچێ."[١٤] بەڵام وێڕای ئەوەش کارێکی ئەستەمە کە مەزناهی و گەورەیی مرۆڤەکان بە باڵای خواکان بگرین و باشترین چالاکییەکانی مرۆڤ لەوانەوە بزانین. ئەرەستۆ پێیوایە زۆربەی بوونەوەران؛ ئەو چالاکی و کارانەی دەیکەن پەیوەندیی بە بوونەوەرانی لە خۆیان مەزنترەوە هەیە و بۆ ئەوانە؛ لە حاڵێکدا، ئەو کارانەی بۆ خۆیانی

* هایدن: وشەیەکی ناوچەی ئیلامە و بەواتای "هستی" دێ.

دەکەن چالاکی گەلێکی بچووک و کەم بایەخن. ئەوپەڕی چالاکیی مرۆڤ گەیشتن بە بەختەوەرییە و ئەو "عەقڵەچالاکەی وا بۆ بیرکردنەوە و تێفکرین تەرخانە؛ ناکۆتایە و چێژەکەشی بارتەقای خۆیەتی.[١٥] بە واتایەکی دیکە، بیرکردنەوە و تێفکرین کە لە خۆیدا چێژ بەخشە، چالاکییەکە تایبەت بە مرۆڤ و سنوور و کۆتاییەکی بۆ دیاری نەکراوە.

ئەرەستۆ لە نێوئاخنی قسەکانیدا وشەی man دێنێتەوە کە وشەیەکی یۆنانییە و بەمانای مرۆڤە و لە سروشتی مرۆڤ و توانایی مەزنەکانی مرۆڤ دەدوێ. خاڵێکی گرینگ کە لەو پەیوەندییەدا دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە کە ئەرەستۆ بەڕاشکاوی سەبارەت بەهێنانی ئەم وشەیە روونیکردۆتەوە کە بە بۆچوونی ئەو، مرۆڤ (anthropos) بە گرووپێکی دانسقەی نەژادی ئادەمیزاد دەگوترێ و مەزناهی، توانایی سەرووتر و بەختەوەری لە تایبەتمەندییەکانی ئەون. مرۆڤ سەرەڕای بارگاوی بوون بە ئاوەز و هێزی بیرکرنەوە (هزرمەندی) پێویستە لە ژیاندا هێندێ قانی (امتیاز) دیکەشی هەبێ. بۆ وێنە ئەرەستۆ پێیوایە کە بەختەوەری بەبێ ماڵ و سامان، هاوڕێێ زۆر، منداڵی باش، هێمنی، جوانی و رەچەڵەکی رەسەن؛ مەیسەل نابێ. بەواتایەکی دیکە؛ مرۆڤ یانی ئەو کەسەی تێکڕای ئەو لایەنە باشانەی هەبێ؛ لە کەسیش شاراوە نییە کە تەنیا بژاردەکان بۆیان دەلوێ تەواوی ئەم شتانەیان هەبێ هەروەها بۆ وەدەستهێنانی ئەوانە و بوون بە مرۆڤ؛ پێویستە کەڵک لەهێزی دیتران (ئەوانی دی) وەربگیردرێ و ئەوان بخەیتە خزمەتی خۆت. بۆ گەیشتن بە ئاستی بەختەوەری پێویستە خەڵک بچەوسێنیتەوە و مافەکانیان پێشێل بکەیت. ئەرەستۆ لەو پەیوەندییەدا باوەڕی وایە کە نەک هەر ئاژەڵەکان بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤەکانیش یاسای سروشت؛ ئامراز و کەرەسەگەلێکن بۆ حەساندنەوەی تاقمێکی کەم؛ چونکە بەبێ ئەو ئامرازە ئەم (خەڵکە ژێردەستە)، ئەو تاقمەکەمە ناتوانن بەختەوەربن. ئاکامەکەی ئەوەیە کە ژنان، کۆیلەکان و کرێکاران دەبنە ئامرازگەلی یاریدەدەری ئەو مرۆڤانە بۆ ئەوەی ئەوانە بتوانن بگەن بە بەرزترین ئاستی بەختەوەری و بەختیاریی خۆیان. ئەرەستۆ لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: "لەبەر ئەوەی کە خۆشبەختی، بەرزترین بەختیارییەکانە و ئاکامی کەڵک وەرگرتن لە



مەزناهییە و چونکە ئەم بەختیارییەش بۆ هەمووان دەست نادا؛ هێندێک بەتەواوی خاوەنی ئەم مەزناهییەن و هێندێکی دیکە بڕێکیان هەیە یاهەر هیچیان پێ نەبڕاوە"[١٦].

بەو پێیە بەختەوەری تەنیا بەو تاقمە مرۆڤە دەبڕدرێ کە خاوەنی مەزنایەتیی تەواو و هەلومەرجی دەرەکیی وەک: ماڵ و سامان و رەچەڵەکی رەسەنن.

ئەرەستۆ لە نێو لێدوانەکانیدا جاروبارەیەک ئاوڕێک لە واتای وشەی ئەرکوەخۆگری دەداتەوە بۆ ئەوەی قسەی لە دڵان بنیشێ. ئەو باوەڕی وایە کە پەیوەندییەکان لە نێوان ئەوانەی وابەشێوەی سروشتی فەرمانڕەوا (دەسەڵاتدار)ن و ئەوانی دیکە کە بە شێوەی سروشتی فەرمانبەرن (باڵادەست و ژێردەست) وەک: مێرد و ژن. ئاغا و نۆکەر (کۆیلە)؛ بۆ هەردووک لا بەکەڵکە؛ چونکە تواناییەکانیان لە چاویەکتر جیاوازن لەیەک. ئەم جۆرە بەڵگە هێنانەوەیە بەشێکی گرینگ لە لێدوانەکانی ئەرەستۆ سەبارەت بە کۆیلەداریێتی پێک دێنن کە دەچینە سەری. بێجگەلەوە ئەرەستۆ سەبارەت بە فەرمانڕەوا و فەرمانبەر (دەسەڵاتدار و بەردەست) دەڵێ: "ئەگەرچی کۆیلە وەک ئامراز و کەرەسە چاوی لێ دەکرێ" بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە "رەوش و هەلومەرجی کۆیلایەتی بە قازانجی هەر دووک لایەنە (کۆیلەدار و کۆیلە) چونکە هەردووکیان یەکتر دەپارێزن و ئاسایشی یەکتر دەستەبەردەکەن و هەردووکیان قازانجی یەکسانیان پێ دەگا.[١٧] هەروەها ئەرەستۆ ئەوەش دەڵێ کە لە پەیوەندیی نێوان گیان و جەستە، ئامراز و خاوەن ئامراز و ئاغا و کۆیلەدا، ئەوە لایەنی دووهەمە کە بەردەوام قازانجی پێ دەگا".[١٨] ئەو پاش دەربڕینی ئەم مەسەلەیە. دێتە سەر شێوەیەکی بەراوردکارانە و وێڕای باسکردن لە قازانجی دوولایەنەی پەیوەندیی ژن و مێرد، دەڵێ: کە سەرەتا "ژن و مێرد بەخستنەگەڕی توانایە تایبەتییەکانیان و تێکۆشانی هاوبەشیان؛ یارمەتی یەکتر دەدەن" و دوایی "لە راستیدا ژن قازانج دەکا و پیاو قازانج دەگەیەنێ.[١٩]

هەروەکی چاوەڕوان دەکرا، لە جیهانی هیرارشیی ئەرەستۆدا، بە هێنانە گۆڕێ گریمانەی بە قازانج بوونی شتەکان؛ ژنان کە بەرەگەزی دووهەم و نزمتر لە قەڵەم دەدران زوڵمیان لێچوو. ئەرەستۆ سەبارەت بە گەورەیی و

سەروەرێتی ئاغا بەسەر کۆیلەدا دەڵێ: "ئەگەرچی بەرژەوەندییەکی هاوبەش؛ ئاغای سروشتی و کۆیلەی سروشتی پێکەوە گرێدەدا؛ بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەو زاڵێتییە لە بەرژەوەندی ئاغادایە و بەقازانجی ئەو تەواو دەبێ و کۆیلە لەوێدا تەنیا بە شێوەی لاوەکی و کاتی قازانجی پێ دەگا.[٢٠] بەگشتی؛ بەڕای ئەرەستۆ پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەست، ئاغا و کۆیلە، ژن و مێرد؛ پەیوەندییەکی لێکدانەبڕاوە و لەیەکتر جیا ناکرێنەوە چونکە بوونی یەکێکیان بەوی دیکەوە بەستراوەتەوە[٢١]. ئەرەستۆ بەم قسەیە کە: "ژێردەستەکان لە شمشاڵ ساز دەچن و ئەوانەش کە دەسەڵاتدارن وەک شمشاڵ ژەن؛ ئەو شمشاڵا دەژەنن کە ئەوان (کۆیلەکان) سازیان کردوون"،[٢٢] بەڕوونی دەسەڵاتی پیاو بەسەر ژندا دەردەخا.

ئەو پێیوایە ژنان هەر لە سروشتی ڕەگەزییدا لە پیاو نزمترن و پلە دوون، کەواتە دەبێ بە شێوەی سروشتی لە ژێر دەسەڵاتی پیاوان دابن کە ڕەگەزی یەکەمن و مەزنترن.

ئەرەستۆش وەک ئەفلاتوون بە ئاڵۆزی و پێچەڵاوپێچییەوە باس لە وشەی Physis واتە سروشت، جەوهەر و لقەکانی دەکا.[٢٣] بەو جیاوازییەوە کە ئەو، جارنەجارێک وشەی "سروشت" بەواتای جەوهەر دێنێتەوە. واتە شتێک کە دەکەوێتە دژەدیوی ئەو شتانەی لە دەوروبەر وەردەگیردرێن[٢٤]. ئەرەستۆش وەک ئەفلاتوون ئەوەی دەزانی کە سروشتی بوونەوەرێکی بالق (پێگەیشتوو) دەگەڵ ئەو ئاکارانەی لەژیاندا فێری بووە لێک جیاناکرێنەوە و هێشتا بەجوانی لێک هەڵناوێردراون.[٢٥] بەڵام دەبێ سەرنج بدرێتە ئەو خاڵە کە بەکارهێنانی وشەی "سروشت" لەڕوانگەی ئەرەستۆوە زیاتر لە پەیوەندیی دەگەڵ تێوریی ئەرکوەخۆگرییەکەیدایە کە واتای خۆی وەردەگرێ. ئەو ڕای وایە کە ئەرکوەخۆگریی هەر دیاردەیەک نیشاندەری پێویست بوونیەتی و جەوهەرەی هەر شتێک لە پەیوەندی دەگەڵ توانایی ئەرک وەخۆگریی ئەودا لێک دەداتەوە. بەو پێیە کاتێک ئەرەستۆ لە سەرەتای کتێبی سیاسەتدا دەڵێ: "هەرکات شتێک بە تەشقی خۆی (کماڵ) گەیشت بە شتێکی سروشتیی دەزانین؛ ئیدی ئەو شتە بنیادەم بێ، ئەسپ بێ یا بنەماڵە،"[٢٦] نابێ تووشی هەڵەمان بکا کە لەزەینی ئەودا



پەیوەندییەکی پێویست هەیە لە نێوان گەشە و هەڵدانی شتەکان و ئەرکەکانیاندا. ئەرەستۆ لە سەرەتای کتێبی سیاسەت دا، واتە لەو جێگەی خاوەن و مێرد و باوک واتای «گەورەی ماڵ.» دەگەیەنن؛ شتێکی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە بنەماڵە دێنێتەوە گۆڕێ کە دەڵێ: "هەر بنەماڵەیەک تەواو لە کۆیلە و سەربەست پێکهاتووە؛ بەڵام چونکە تاوتوێکردنی هەرشتێک دەبێ لە ناسینی بچووکترین پاژی ئەم شتەوە دەست پێ بکا و یەکەمین پاژەکانی بنەماڵە؛ خاوەن و کۆیلە، مێرد و ژن، باوک و منداڵەکانن. کەواتە دەبێ پێکهاتەی دروست و تایبەتمەندیی هەرسێ پەیوەندییەکە بخرێنەڕوو — بناسرێن -. ئەم سێ پەیوەندییە بریتین لە: سەرەتا پەیوەندیی خاوەن و کۆیلە، دووهەم، پەیوەندیی مێرد و ژن وسێهەم باوک و عەولاد (منداڵان). هەروەها ئەوەیکە "سروشتی" هەرکام لەو سێ پەیوەندیە بنەماییە؛ هۆکارێکی چوارەمە کە "هونەری ماڵ وەسەریەکنان" (cherematistique)ی پێ دەڵێن.[٢٧] لە جیهانی هزریی ئەرەستۆدا؛ دوو پرەنسیپ و یاسا لە پراکتیکدا لێک دەچن. بۆ وێنە کاتێک ئەو دەڵێ: "واباشترە ئەو شتانە تاوتوێ بکەین کە سروشتی و ئاسایین؛ نەک ئەو نموونە گەلەی لەحاڵەتی ئاسایی و سروشتی دەرچوون".[٢٨] لە ڕاستی دا ئاماژە بەدووپارامێتر دەکا کە بەشێوەی بەراوردێکی لۆژیکی خراونەتە ڕوو. لە ڕاستیدا وشەی سروشتی natural کە لە بنەما ئەرستۆییەکاندا هەیە؛ ئاماژەیەکی پاڵەکیی (ضمنی) ئەخلاقیانەی جیاوازە کە دەکەوێتە بەرامبەر شتێکی نائاساییەوە (corrupt: "ئەوشتەی کە باشە"). هەر وەکو لە باسی ئەرکوەخۆگریی ئەرەستۆدا ئاماژەمان پێ کرد هیچ شتێکی باش "سروشتی" نییە مەگەر ئەوەیکە بکەوێتە نێو پرۆسەی هیرارشیی ئەرکوەخۆگرانەوە. بەو شێوەیە ئەرەستۆ توانی چوارچێوەیەکی فەلسەفیی وا لە ڕەوشی باو دامەزرێنێ کە تێیدا ئەرکی کەسەکان دیاری کرا بێ. بەواتایەکی دیکە بەختەوەریی مرۆڤ دەگەڵ سروشتیان تێکەڵاوە و یەکسانە و ئەو بەختەوەرییەش بە شێوەی سروشتی دەگەڵ ڕۆڵ و پێگەی تاک لە کۆمەڵگادا یەکدەگرێتەوە. لێدوانەکانی ئەرەستۆ سەبارەت بە سروشتی شتەکان و بوونەوەران؛ بەتایبەت ئەوانەی کەوتوونەتە هەرێمی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەوە؛ تێگەیشتنیان بە شێوەی پراکتیک زۆر ئەستەمە مەگەر ئەوەیکە لە ڕوانگەی ئەرەستۆوە لە ماهیەتی ئاڵۆز و

راز ئاسای سروشتی تێبگەین. بۆ وێنە "بنەماڵە بەشێوەی سروشتی، هەیە" و "شار و وڵاتیش لە روانگەی سروشتییەوە سەرەتیان بەسەر تاک و بنەماڵەدا هەیە."[٢٩] لێرەدا ئەرەستۆ بەهیچ جۆرێک نایهەوێ بەگوتنی ئەوەیکە بنەماڵە واقعێکی سروشتییە؛ بوونی بنەماڵە بەشتێکی هەمیشەیی دابنێ بەڵکو ئەو دەیهەویست بوونی بنەماڵە بکاتە واقعێکی پێویست بۆ مانەوە و تەکووزی و رێکوپێک بوونی ژیانی پیاو. بەڵام هۆی ئەوەیکە لە سیستەمی هیرارشیی کاروبارەکاندا، شار سەرەتیی هەیە بەسەر بنەماڵەدا؛ لەبەرئەوە نییە کە شار لە چاو بنەماڵە لایەنێکی بنچینەیی و بنەمایی هەیە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە؛ ئەوە شار و ئەنجومەنی کۆمەڵایەتین کە پیاو والێدەکەن لە تێروتەسەلی و دەوڵەمەندیدا چێژ لە ژیان وەرگرێ؛ "چونکی بنەماڵە بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی رۆژانەیە". بەواتایەکی دیکە؛ بەهۆی ئەوەی لە دەزگای هزریی ئەرستۆدا «گشت بەسەر پاژدایە» و سەرەتیی هەیە بەسەریدا بۆیەش شار کە واقعێکی سروشتی و گشتییە بایەخی لە بنەماڵە زیاتر دەبێ.

بۆ چوونەکانی ئەرەستۆ سەبارەت بە کۆیلەدارییش هەر ئاوان، واتە ئەگەر کەسێک لە فەلسەفەی (دوایین هۆکاری) ئەرەستۆ سەبارەت بە سروشت تێنەگا، باسی کۆیلایەتی بۆ ئەو شتێکی دوور لە عەقڵ دەبێ. ئێمە ناتوانین ئەو بۆچوونەی ئەرەستۆمان قبوولّ بێ کە دەڵێ: "کۆیلەیی شتێکی سروشتیە، چونکە کۆیلەکان بەو رادەیە لە خەڵکانی دیکە جیاوازن کە جەستە لەگیان و ئاژەڵ لە مرۆڤ جیاوازن.[٣٠] بۆیەش قبوڵی ناکەین چونکە قایلمان ناکەن. بەڵام ئەگەر لە روانگەیەکی کۆمەڵایەتییەوە لە کۆیلەیەتی بڕوانین و بە پوانێکی بزانین بۆ تاقمێکی کەم، بۆ ئەوەی بتوانن خەریکی چالاکی و کاروباری هزری بن، هەروەها لەو روانگەیەوە کە سروشتی کەسەکان لە کۆمەڵگادا بە پێی ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتییانە دیاری دەکرێ کە وەئەستۆی دەگرن، ئەوکات لەوانەیە پاساوەکانی ئەرەستۆ سەبارەت بە سروشتی کۆیلەداریتی قایلمان کەن. دیارە دەبێ سەبارەت بە ئافرەتیش ئەو شتانەمان لەبەرچاوبێ. واتە بە سەرنجدان بە تیۆریی ئەرک وەخۆگری و پێگەی چینایەتیی رەگەزی مێوینە لە کۆمەڵگادا، پەیوەندیی دەسەڵات خوازانەی پیاو بەسەر ژندا درکی پێدەکرێ کە ئەرەستۆش ئەوەی بۆ کۆمەڵگای مرۆیی بە قازانج زانیوە.



ئەرەستۆ لە لێدوانەکانی خۆیدا دژی راوبۆچوونی "بەڕبەڕەکانە barbarian کە ژن و کۆیلەیان پێ وەک یەکن. بەو جۆرەش دژبەرییەکەی خۆی دەردەبڕێ: "ژن و کۆیلە هەر بەشێوەی سروشتی لێک جیاوازن. سروشت بە پێچەوانەی ئەوانەی "چەقۆی دێلقی" یان دروست کردووە؛ لە دروست کردنی هیچ شتێک دا بەرچاوتەنگی نانوێنێ، بەڵکو هەرشتەی تەنیا بۆ یەک ئامانج و یەک مەبەست دەخوڵقێنێ ؛ چونکە ئەوکاتە دەبێ ئامرازێکمان پێ کامڵ و تەواو بێ کە ئەو ئامرازە تەنیا کارێکی پێ بکرێ نەک کاری جۆراوجۆر. بەو جۆرە کۆیلە و ژن کە لەلای بەڕبەڕەکان پێگەیەکی یەکسانیان هەیە، هەڵەیە ئەگەر وابیر بکەینەوە کە ئەوان فەرمانڕەوای سروشتییان نییە. بەڕای ئەوان کردەی سێکسی ژن و مێرد؛ سێکسی نێوان ژن و پیاوێکی کۆیلەیە."[٣١] ئەرەستۆ بۆیە دەگەڵ رای خەڵک نییە و دژیانە چونکە پێی وایە: "سروشت هەرشتەی تەنیا بۆیەک مەبەست و یەک ئامانج دەخوڵقێنێ" و لەو پەیوەندییەدا ئەرکی کۆیلەکان تەنیا دابین کردنی پێداویستیی رۆژانەی ئاغاکان و دابین کردنی بژیوی ژیانیانە، بەڵام ئەرکی ژنان زاوزێ کردن و منداڵ خستنەوەیە.[٣٢]

ئەرەستۆ لە کتێبی سیاسەت دا ئەرکی ژنی تاوتوێ کردووە. ئێمە بۆ تێگەیشتن و روونکردنەوەی ئەو مەسەلەیە ناچارین بگەڕێینەوە سەر نووسراوە ژینناسییەکانی ئەو. ئەرەستۆ زاوزێ کردن بە هۆگری و حەزێکی بەهێز لە ژناندا دەزانێ و بە "سروشتی ترین کردەی گیانلەبەرە باڵقەکان"ی لەقەڵەم دەدا. لە بەراورد دەگەڵ دەرکەوتەکانی بواری ژینناسی و کۆی بینراوەکانی (مشاهدات) ئەرەستۆ سەبارەت بە زاوزێ کردن، دەبێ بڵێین کە بۆچوونەکانی ئەو هەڵەی زۆر زەقیان تێدایە کە چاوگەکەیان هەر لە گریمانە سەرەتاییەکانیدا دیارە؛ چونکە ئەو بەردەوام رەگەزی نێرینەی پێ مەزنتر و باشتربووە لە رەگەزی مێوینە. ئەرەستۆ لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەمیشە گیان (صورت)* سەرەتی هەیە بەسەر "ماک" دا. لە (مشاهدات) بینراوەکانیشیدا سەبارەت بە زاوزێ، دەڵێ کە ئەوە ئاولمە (تۆوی)ی پیاوە کە سەرچاوە و خوڵقێنەری گیانە؛ بەڵام تۆوی ژن جەستە دەخوڵقێنێ. گیان لە جەستە بەرزترە و لە زاتی خۆیدا شتێکی یەزدانییە و لە رووی پێویستیشەوە سەرەتی هەیە

* صورت: لێرەدا دەکەوێتە بەرامبەری جەستە و ماک بەوپێیە مەبەست گیانە. (وەرگێر)

بە سەر هەمووو ئەوشتانەی لەپلەی خوارتردان، هەر بۆیەش ڕەگەزی نێرینە لە مێوینە بەرزتر دەبێ".[٣٣] بە واتایەکی دیکە تەواوی هێزە رۆحییەکان پەیوەندییان بە شتگەلێکەوە هەیە کە لەو توخمە ئاساییانە جیاوازن وا جیهانیان لێ پێک هاتووە؛ واتە جەوهەرەی یەزدانی بوونیان زیاترە هێندێ لەو هێزە گیانی و رۆحییانەی خاوەنی ماکێکی مەزنتر و بەرزترن. سەرچاوەی تەواوی بەروبووی گیانلەبەران لە تۆوی (نطفە) باوکدایە و ئەویش تووییەکە Pneurma کە لە توخمی هەسارە خوڵقێن دەچی و لە ڕاستیدا، تۆوی پیاوە کە بارگاوییە بە سەرچاوەی ژین و گیانێکە هەرکات بوو بە تۆل (جنین)* عەقڵ و ئاوەزیش دەگەڵ خۆی دێنێ." ئەرەستۆ بە پێی تیۆریی هیرارشییەکەی خۆی لەبەر خوڵقانی روخسارێکی مەزنتر واتە پیاو؛ زاوزێ کردن بە پێویست دەزانێ. ئەو باوەڕی وابوو کە: "خراپەیەک لە سروشتدا سەری هەڵداوە و بۆتە هۆی یەکەمین چەواشەبوونی خوڵقان". ئەم خراپەیە زەمانێک دەرکەوت کە" تۆلی مێوینە بە جێگەی نێرینە بیچمی گرت". بەپێی ئەم لادانە لە یاسا و ڕێسا "پێویستییەکە لەلایەن سروشتەوە، کە پێشی بەخوڵقانی گەوهەری سەرەکی (پیاو) گرتووە. ئەرەستۆ ئەو دەرەنجامە لە باسەکەی وەردەگرێ کە: "ئەگەرچی لە ڕەوتی سروشتدا تاقەجارێک "تۆلی ژن لە بری تۆلی پیاو" بیچمی گرت؛ بەڵام دەبێ بە گشتی وەک خوڵقاوێکی ناتەواو لە ژن بڕوانین".[٣٤] ژن لە دەزگای هزریی ئەرەستۆدا خاوەنی تایبەتمەندیگەلێکی وەک؛ سووکی، ناتەواوی و بێ توانایییە. روونتر بڵێین، پیاو لە تەواوی قۆناغەکانی ژیانیدا وەک بکەر و شوێندانەر رۆڵ دەبینێ، بەڵام ژن رۆڵێکی پاسیڤی هەیە. هەروەها ئەوە پیاوە کە ژیان و گیان دەبەخشێ و دەبێتە هۆی زیندوویەتی لەش؛ کە سەر بە ژنە. ژن کە جەستەیە بە هۆی پیاوەوە دەژی کە سەرەتی بەسەر هەموو شتێک دایە. ئەرەستۆ لە کۆی لێدوانەکانیدا بەو دەرەنجامە دەگا کە: "ئافرەتێک بە سەرنجدان بە رۆڵ و ئەرکی زاوزێ کردن؛ وەک پیاوێکی نەزۆک وایە؛ چونکە بڵێی و نەڵێی ژن ناتەواوە. پیاو بۆیە پیاوە چونکی هێندێ توانایی دانسقە و تایبەتیی هەن. ژنیش بۆیە ژنە لەبەر ئەوەی کە لەو تواناییە تایبەت و دانسقانە بێبەرییە"[٣٥]. "بەگشتی، "ئەو شتەی کە دێتە پێشێ ڕاست ئەو شتەیە کە چاوەڕوان دەکرێ بێتەپێشێ و کردەوەی ژنیش هەر

* تۆل ئاوەلمە: (جنین) هەنبانەبۆرینەی م. هەژار.



ئەو شتەیە کە هەمووان چاوەڕوانی دەکەن."[٣٦] ئەرەستۆ لە کتێبی سیاسەتدا لە ڕوانگەیەکی ژین ناسیانەوە بیرو بۆچوونی خۆی لەسەر ژنان و زاوزێ کردن دەربڕیوە. بە گشتی تێگەیشتنی ئەو لە ژن ئەوەیە کە ژن ئامرازێکە بۆ زاوزێ کردنی پیاو و ژیانی هاوبەشیش نەریتێکە، کە بۆ "ڕەخساندنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ڕێکدەخرێ بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە منداڵ و وەچەیەکی تۆکمە و بەهێز پەروەردە بکرێ."[٣٧]

ئەرەستۆ لە درێژەی باسەکەیدا دێتەسەر هەلومەرجی زەماوەندکردن و پێیوایە باشترین تەمەنی زەماوەندکردن ئەوکاتەیە کە هێز و وزەی جەستەیی ژن و پیاو لەوپەڕی خۆیدایە. واتە لە تەمەنی نێوان هەژدە و نۆزدە ساڵیدا بۆ ژنان؛ بۆ پیاوانیش تەمەنی سی و حەت ساڵی یا ئەو سەروبەندە. لە ڕوانگەی ئەرەستۆوە هاووڵاتیان "نابێ زەویی بەیار بکێڵن" بە واتایەکی دیکە؛ هاووڵاتیان نابێ کچۆڵەی مێرمنداڵ کە هێشتا ئامادەی بەرگرتن* نین، بخوازن، چونکە "منداڵ بوون بۆ ئەوانە ژانێکی تاقەت بڕووکێنی هەیە و زۆربەیان لەسەرمنداڵ دەچن**" هەروەک دەبینین کردەی سێکسی و زاوزێ کردن بە زەوی کێڵان چوێندراوە و لە پیاوان ڕادەسپێرن کە زەوی بەیار نەکێڵن، چونکە؛ ژن هیچ دەسکەوتێکی لێ هەڵناگرن. بەو پێیە و بەپێی تیۆرییە گشتییەکەی ئەرەستۆ ژن تەنیا جەستە بە منداڵ دەبەخشێ، بەڵام پیاو گیان و رۆح دەدا بە ساواکەی. ڕوون و ئاشکرایە کە لێرەدا هێزی ئاوەز خوڵقێن تەنیا لە پیاودایە، بەڵام ژنان ئامۆژگاری دەکرێن کە "لە کاتی زگ پڕیدا، تەندروستی خۆیان بپارێزن، وەرزش بکەن و خواردەمەنی باش بخۆن، لە کاتێکدا جەڵتە و تۆل خەریکە لە جەستەیدا دەگورێ و هەڵدەدا ئەو نابێ فکر و خەیاڵی ئاڵۆزبێ، دەبێ هێور و بێ دڵەڕاوکێ بێت بە جۆرێک کە تەواوی هێزی خۆی بۆ منداڵەکەی تەرخان بکات."[٣٨]

ژن سەرەڕای تەواوی کەموکوڕی و بێ تواناییەکانی؛ دیسانیش بوونی بۆ پیاو پێویستە. ئەرەستۆ ئەم پێویستییە بە ئەرکێک دەزانێ کە سروشت خستوویەتییە ئەستۆی ژن، چونکە ئەگەر زاوزێ کردن لەگۆڕێدانەبوایە؛ بوونی ئەم "خوڵقاوە

* بەرگرتن وەک داری میوە کە بەر دەگرێ. (وەرگێڕ)

** لەسەر منداڵ چوون: ئەو ژنانەی لە کاتی منداڵ بووندا دەمرن.

ناتەواوەی سروشت" (ژن) هیچ پێویست نەبوو. ئێستاش کە سروشت وەها شتێکی بە پێویست زانیوە؛ هەر لە سەرەتاوە ئەرکی شتەکانیشی دەسنیشان کردووە، بۆ وێنە "پیاو ماڵ کۆدەکاتەوە (چالاکی لە بواری کۆمەڵایەتیدا) و ژن رایدەگرێ و دەیپارێزێ و دەیخاتەسەریەک (ماڵداری و کەیبانوویی).[٣٩]

ماڵدارێتی پێویستییەکە بۆ ژیانی رۆژانە. چونکە هەربەپێی باوەڕی ئەرەستۆ؛ ژمارەیەکی زۆر ئەرکی سەرشانیانە کە کەلوپەل و پێداویستییەکانی تاقمێکی کەم دابین بکەن واتە ئەو تاقمە کەمە بحەسێننەوە کە خەریکی "کاروباری راستەقینەی مرۆڤن" بە واتایەکی دیکە؛ چینە جۆراوجۆرەکانی خەڵک بەگشتی و ژنان بە تایبەتی؛ ئەرکی سەرشانیانە کە بە کار و کردەوەی جەستەیی خۆیان پێداویستییەکانی بیرمەندان و نوخبەکان دابین بکەن چونکە ئەوان پێشەنگی رێنوێن و رێ پێشاندەری کۆمەڵگان و رێبەریی کۆمەڵگایان لە ئەستۆیە. ئەم بۆچوونە، ئەرەستۆی هێنایە سەر ئەوەی کە بەپێی شتێک یا تایبەتمەندییەک کار بەسەر پیاو و ژندا دابەش بکات، کە دەگەڵی یەک بگرێتەوە و "سروشتی" بنوێنێ.

ئەرەستۆ پەرچەکردارێکی نواند دژی بۆچوونە رادیکاڵانەکەی ئەفلاتوون کە خوازیاری هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵە بوو. ئەو لە بەشی سێهەمی کتێبی سیاسەت و لە هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی ئەفلاتووندا دەچێتە سەر سێ بابەتی سەرەکی؛ یەکەم ئەرەستۆ ئەم بۆچوونەی ئەفلاتوونی قبووڵ نییە کەپێیوایە: "یەکیەتی و یەگرتوویی لەسەرانسەری کۆمەڵگای سیاسیدا باشترین بەختیارییەو بۆ یەکگرتوویی پاسەوانان؛ پێویستە دەزگای بنەماڵە هەڵوەشێندرێتەوە". ئەرەستۆ ئەم بۆچوونە بە هۆکارێک دەزانێ کە شارەکان کاول دەکا. ئەو لە کتێبی سیاسەتدا دەڵێ: "دیارە ئەگەر یەکگرتوویی لە رادەبەدەربێ کۆمەڵگای سیاسی لە ناو دەچێ لەبەر ئەوەی کە هەر کۆمەڵگایەکی سیاسی لە فرەیی و فرەدەنگی پێک دێ و ئەگەر [تاک دەنگبێ] و تاک دەنگییەکەی لە رادەبەدەر بێ لە پێشدا وەک بنەماڵە و دواتر وەک تاکێکی لێدێ. لە سروشتدا جڤاتی جۆراوجۆر هەن، بەڵام یەکیەتیی لە رادەبەدەر و وێکچوویی گشتی بۆ شار زیانیان هەیە."[٤٠] دووهەمین رەخنەی ئەرەستۆ لە ئەفلاتوون وەک شتێکی دژوار دەچێ چونکە بەڕای ئەرەستۆ ئەم بۆچوونەی ئەفلاتوون کە پێیوایە: "هاوبەشبوونی دەزگای بنەماڵە (لە نێو پیاواندا)



رێگەیەکە بۆ یەکگرتوویی کۆمەڵگا" بە بۆچوونێکی بێ بنەما دەزانێ کە پەیوەندییە خزمایەتییەکان لەرزۆک و لاواز دەکا. ئەرەستۆ بەم بۆچوونەی ئەوە دەردەبڕێ کە لە رێگەی سیستەمی هاوبەشییەوە کە ئەفلاتوون بۆ حکوومەت بە پێویستی دەزانێ یەکگرتوویی مسۆگەر نابێ و بەو بەڵگەیە (سیستەمی هاوبەشی) ناکرێ بیسەلمێنی کە "ئەو شتە هی من نییە". وشەی "تەواوی" هەڵگری واتایەکی روون نییە و لێڵە و ئەو ئاڵۆزیی واتاییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مشتومڕی لێبکەوێتەوە. ئەو جار ئەم بەو ئاکامە دەگا کە "ئەگەر هەمووی خەڵک، شتێک بە هی خۆیان بزانن. لە لایەکەوە باشە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە هۆیەک نییە بۆ یەکگرتوویی و هاوئاهەنگیی نێوانیان و..." دووهەم، خەڵک ئەوشتانە دەپارێزن کە موڵکی خۆیانن و بەردەوام بیر لە پاراستنی سامانی تایبەتیی خۆیان دەکەنەوە و ملک و ماڵی هاوبەش بەلایانەوە زۆر گرینگ نییە بەوپێیە ئەو هۆیانەی کە ئەفلاتوون بۆ یەکیەتیی کۆمەڵگای سیاسیی هێناونییەتەوە بنەمایان نییە. سێهەم ئەوەی کە ئەرەستۆ بۆ رەدکردنەوەی بۆچوونەکەی ئەفلاتوون ئەوە بە بەڵگە دێنێتەوە کە، لە یەکیەتیی زێدەڕۆیانەدا کەس نازانێ سەر بە کامە بنەماڵەیە و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە: "بەها سروشتییەکان" بکەونەبەر، پرسیارەوە و تاوانگەلێکی وەک زیناح (سێکس دەگەڵ مەحرەم) براکوژی و... بێنە گۆڕێ. بە واتایەکی دیکە هاوبەشبوونی بنەماڵە و ملکو ماڵ نەک هەر نابێتە هۆی یەکگرتوویی ئەندامانی کۆمەڵگا بەڵکو گەلێک کێشە و گرفتیشی لێدەکەوێتەوە و لە هەمووان گرینگتر دەبێتە هۆی لەناوچوونی بەها کۆمەڵایەتییەکانی وەک خۆبواردن لە سێکس دەگەڵ دایک و باوک و هەروەها هەستی سۆز و دڵۆڤانییش کە بە چاکە و مەزناهی دەژمێردرێن. وێدەچێ کە گەنگەشەکانی ئەرەستۆ دژی ئەفلاتوون قایلکەر نین، چونکە لە پلەی یەکەمدا دەکرێ ئەو گەنگەشە و مشتومڕانە دەرەنجامی ئەوەبن کە لەوکاتدا بێجگە لە ئەفلاتوون؛ گەلێک بۆچوونی جۆراوجۆری دیکەش سەبارەت بە حکوومەتی یۆتوپیا و ئایدیال هەبوونە و پێویست نەبووە هەڵوەشانەوەی بنەماڵە بوبێتە هۆی یەگکرتوویی زێدەڕۆیانە، وێڕای ئەوەش؛ یەکەمین و دووهەمین بەڵگاندنی ئەرەستۆ دژوار دێنەبەرچاو. چونکە ئەگەر هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵە دەبێتە هۆی لاوازی و لەرزۆک بوونی پەیوەندییە خزمایەتییەکان ئەدی چۆن بەپێی بەڵگەکەی سوقرات

(ئەفلاتوون) لە هەمانکاتیشدا دەبێتە هۆی یەکگرتوویی سەرەڕۆیانەی کۆمەڵگاش؟ لە ئەنجامدا سێهەمین ڕەخنەی ئەرستۆ لەڕاستیدا پێچەوانەی ئەو شتەیە کە ئەفلاتوون بڕوای پێی بوو. واتە ئەفلاتوون بە ئانقەست دەیویست پاسەوانان خۆیان سەر بەهیچ بنەماڵەیەک نەزانن و کۆمەڵگا بۆ ئەوان وەک بنەماڵەیەک وابێ. پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە کتێبی سیاسەتی ئەرەستۆ بەگشتی، ڕەنگدانەوەی رای ئەو نووسەرانەیە کە سەبارەت بە هەڵوەشانەوەی دەزگای بنەماڵە، ملکداری و خاوەنێتی هاوبەش و بیروڕا رادیکاڵەکانی دیکەی ئەفلاتوون قسەیان کردووە و دواون و ئەرەستۆ بۆ خۆی هیچ رایەکی سەبارەت بە باوەڕە رادیکاڵەکانی ئەفلاتوون بۆ گوتن پێ نەبوو. سەرەڕای ئەوەش، ئەرەستۆ لە ئاماژەیەکی خێرادا؛ تەنیا چووە سەر مەسەلەی بەراوردکردنی مرۆڤەکان دەگەڵ سەگی گوڵ (نێر) و دێڵ (مێو) سەبارەت بە مەسەلەی ڕەگەزییان کە لەلایەن ئەفلاتوونەوە خرابووەڕوو. لەوەشدا وەڵامەکانی ئەرەستۆ بە ئیدعاکانی ئەفلاتوون لێڵن و بۆ تێگەیشتن نابن مەگەر ئەوەی کە دان بەوە دابنێن کە هیچ کامێکیان لە چوارچێوەی دەزگای هزری و فەلسەفیی خۆیاندا رۆڵێکی سەربەخۆیان بۆ ژنان لەبەرچاونەگرتووە. بۆ وێنە ئەرەستۆ گەمژەیی ئەفلاتوون کە لە هەمانکاتدا گەمژەیی خۆشییەتی؛ لە رستەیەکدا کورت دەکاتەوە: "بەراورد کردنی مرۆڤ بە ئاژەڵ شتێکی تەواو نەگونجاوە چونکە ئاژەڵەکان بەپێچەوانەی ژنان ئەرک و بەرپرسیارەتیی ماڵەوە یان لە ئەستۆ نییە".[٤١]

ڕوون و ئاشکرایە کە هەتا ئەوکاتەی ئەرەستۆ تیۆریی هاوبەشبوونی ژن و منداڵی رەد دەکردەوە؛ هیچ بە پێویستی نەدەزانی کە دژی بۆچوونە توند و رادیکاڵەکانی دیکەی ئەفلاتوون قسە بکات کە سەبارەت بە توانایی ژنان وەک تاکێکی مرۆیی خرابوونە روو. بەکورتی: سەبارەت بە راو بۆچوونی ئەرەستۆش کە باوەڕی بە بوونی بنەماڵە و ژنی تایبەتی هەبوو؛ ئەوەندە بەسە بگوترێ کە ئەویش (ژن)ی بە هاوسەری تایبەتیی پیاو لەقەڵەم دەدا کە ئەرکی پاراستنی ماڵی پیاوی لە ئەستۆیە. لە فەلسەفەی ئەخلاقیی ئەرەستۆدا، تەواوی بوونەوەرەکان بە پێی ئەو ریزبەندییە هیرارشییە هەڵدەسەنگێندرێن کە بە شێوەی سروشتی لە جیهاندا هەیانە و ژنیش لەم ریزبەندییە بەرەو هەڵکێشان و هیرارشییەدا؛ رۆڵ و ئەرکی زاوزێ کردن و ماڵدارێتیی هەمیشەیی لە ئەستۆیە. تیۆریی هیرارشییەتی ئەرەستۆ دەبێتە



هۆی ئەوەی کە لە ژیانی مرۆڤدا فەزیلەت و مەزناهییەکان بەپێی رەوشی سروشتیی خۆیان بناسرێن و گرێ درابێنەوە بە پێگەی تاکەکان لە کۆمەڵگادا و پەیوەندییان بە یەکترەوە. ئەرەستۆ بە تێروتەسەلی لە کتێبی سیاسەتدا ئەم چاکە و بەستراوەییانەی وەک دادپەروەری و دۆستایەتی هێناوەتەوە. لێرەدا بەگشتی دەبێ بڵێین کە بەڕای ئەو؛ پێناسە ئەخلاقییەکان سەبارەت بە تاکەکان؛ وەک چاکە پارێز (تقوا) و بوێری؛ تا ئەو ئاستە قبوولن کە ئەو کەسانە لەهێرارشی کۆمەڵگادا پێگەیەکیان هەبێ. بەواتایەکی دیکە؛ فەزیلەتی ژن یا پیاو لەپەیوەندیی چڕوپڕی پێگەی کۆمەڵایەتییاندا پێناسە دەکرێن. ئەو شتەی بۆ ئافرەت بە چاکە لە قەڵەم دەدرێ لەوانەیە بۆ پیاو؛ بەپێی هەڵکەوت و پێگە کۆمەڵایەتییەکەی شتێکی خراپ بێ و ئەو چاکە و مەزناهییەی ئاغا (دەسەڵاتدار) هەیەتی؛ دەگەڵ چاکەی کۆیلە دوو وتەزا و چەمکی تەواو لێک جیاوازن. ئەرەستۆ لەم روانگەیەوە ژن بە شێوەی سروشتی بەکەمتر و خوارتر لە پیاوان دەزانێ و رای وایە کە بە هۆی ئەو پێگەیەی کە ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا هەیانە؛ ناکرێ یەکسان بن. هەروەها دەڵێ: واباشترە تا ئەوجێیەی دەکرێ ئەم پێگە و بەستراوەییە کۆمەڵایەتییانەی نێوانیان بە باشی دیاری بکرێن، چونکە بەو جۆرەیە کە پێگەی هەر کامیان لەو هیرارشییەی بوونەوەراندا؛ دەستنیشان دەکرێ و نابەرابەری و نایەکسانییەکەشیان باشتر درکی پێدەکرێ.

هەروەها ئەرەستۆ لە پێناسەی دادپەروەریی سیاسیدا؛ باوەڕی وایە کە دەبێ تاڕادەیەک یەکسانی هەبێ لە نێوان باڵادەست و ژێردەستدا. ئەوەش خۆی دادپەروەریی راستەقینەیە. بەواتایەکی دیکە ئەرەستۆ؛ دادپەروەریی سیاسی بە هاوسەنگییەک دەزانێ کە لە نێو ئەندامانی کۆمەڵگەدا هەیە و پێیوایە ئەگەر ئەم هاوسەنگییە بوونی نەبێ، بەڵام دەسەڵاتداران بڵێن کە لە کۆمەڵگادا بوونی هەیە؛ ئەم دادپەروەرییە، دادپەروەرییەکی هێمایی (خوازەیی) یە. لێرەدا وێدەچێ کە ئەرەستۆ دڵنیا نەبووە لەوەی کە ژنان شیاوی چ جۆرە دادپەروەرییەکن. ئەو لە ئەخلاقی نیکوماخۆسدا دەڵێ: "دەکرێ دادپەروەریی راستەقینە بۆ ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەکان بەڕێوە بچێ و دادپەروەرییەکی نێو ماڵی (خانگی) بۆ هاوسەر لەبەرچاو بگیردرێ کە دەگەڵ دادپەروەریی سیاسی جیاوازیی هەیە".[٤٢] بەڵام دواتر؛ دەمودەست دادپەروەریی نێوان ژن و مێرد، ئاغا و کۆیلە و بەشە عەقڵانی و

ناعەقڵانییەکانی ڕۆح[٤٣] پێکەوە بەراورد دەکا. لەو بەراوردکارییەدا؛ مێرد، ئاغا و عەقڵانییەت دەکەونە لایەکی ڕیزبەندی و هیراشیی کۆمەڵایەتییەوە و پەیوەندییەکانیان دەگەڵ لایەنەکەی دیکە واتە، هاوسەر، کۆیلە و ناعەقڵانی، بە پەیوەندییەکی دادپەروەرانە لەقەڵەم دەدرێ. دیارە لە یۆنانی کۆندا، کۆیلە بەشێک بووە لە ماڵ و موڵکی خاوەنەکەی و نەدەکەوتە ڕیزی مرۆڤەوە. هەروەها بەپێی پشت ڕاستکردنەوەی ئەرەستۆ؛ ژن لە پێگەی هیرارشی کۆمەڵایەتییەکەیدا، وەک بوونەوەرێکی لە مرۆڤ کەمتر سەیری دەکرا. هەروەها؛ دۆستایەتی و بەستراوەییە ئەخلاقییەکانی دیکە لەچوارچێوە فکرییەکەی ئەرەستۆدا شتێکی نەگۆڕ بوون. بۆ وێنە؛ لە نێوان مرۆڤێک و کۆیلەیەکدا؛ تا ئەو کاتەی وەک کاڵا سەیری کۆیلە دەکرا؛ دۆستایەتی بەهیچ جۆر پێک نەدەهات. لە خشتەی (نمودار) پلەبەندی و هیرارشیی ئەرەستۆدا؛ پەیوەندی و دۆستایەتیی نێوان پیاو و عەولاد، ژن و مێرد؛ هاوکێشەیەکی پۆلێن بەندی کراوە کە قازانجدەر و بەرهەمهێنەر دەکەونە لایەک و سوود وەرگر و بەکارهێنەر (مصرف کننده) لەلایەکی دیکەوەن. ئەرەستۆ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد بە پێی ئەو شتەیە کە لە چینی ئەریستۆکراتەکاندا باوە، واتە بەپێی گەورەیی و مەزناهیی پیاوان. بۆ وێنە، لە ئەخلاقی نیکۆماخوسدا ئەرەستۆ باس لەوەدەکا کە "بەپێی مەزناهی و چاکە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو کەسەی مەزنتر و باشترە دەبێ لەو شتەی باش و شیاوە بەش وەرگرێ؛ و ئەم سوودوەرگرتنە لە باشییەکان لە پەیوەندیی و هۆگرییەکاندا خودی دادپەروەرییە.[٤٤] ئەوە ڕاستییەکی سەلمێنراوە کە جیاوازیی جۆرەکانی دۆستایەتی و خۆشەویستی و پەیوەندییەکان؛ بەستراوەتەوە بە چاکە و پلە و پایە و پێگە کۆمەڵایەتییەکانی تاکەکان و بەو پێیە "ئەو ئەڤین و خۆشەویستییەی لە نێو تاکەکاندایە لێک جیاوازن؛ چونکە ئەڤین و خۆشەویستی دەبێ لێوەشاوەیی و لێهاتوویی کەسەکان بێ".[٤٥] ئەوشتە لە زەماوەندیش (ازدواج)دا خۆی دەبینێتەوە. واتە، مێرد بە هۆی ئەوەی کە هەڵگری گەلێک چاکە و مەزناهییە؛ بەنیسبەت هاوسەرەکەیەوە ڕۆڵێکی بەکەڵک و قازانج دەرانە دەگێڕێ، لە ئێکۆ نۆمیکادا conomica موریدەکانی ئەرستۆ بەوجۆرە باسیان لەو هۆیانە کردووە کە ژن دێننە سەر ئەوە ملکەچی لەبەرامبەر مێردەکەیدا بە ئەرکی سەرشانی بزانێ و سوور بێ



لەسەر خزمەتکردن بە مێردەکەی: "پیاو نرخێکی قورس دەدا بۆ هەڵبژاردنی ژن بە هاوسەرێتی. ئەم نرخەگرانە؛ یەکەم لەوەدایە کە ژن بۆ هاوسەرێتی و ژیان هەڵدەبژێرێ و دووهەم ئەوەی کە بواری زاوزێ کردن بۆ ژن دەرەخسێنێ و ئەم هەموو چاکەی پیاو دەرهەق بە ژن دەیکا؛ دەرهەق بەخواکانیش نەکراوە».[٤٦] بەو پێیە بێ هۆنییە کە ژنان لە هەموو قۆناخەکانی ژیانیاندا بە وشە و دەستەواژەگەلێک تاریفکراون و پێیاندا هەڵگوتوون کە پەیوەندیی بووە بەو ئەرکە جیاوازانەی بەنیسبەت پیاوانەوە هەیانبووە. لەبەر ئەوەی کە ژنان هیچ کات خاوەنی پێگەیەکی سەربەخۆ نەبوون.

بەباوەڕی ئەرەستۆ؛ شتێکی گەلێک گەپچاڕانەیە ئەگەر ژنێک سەبارەت بە گوتن و دەربڕینی خۆشەویستی و ئەڤین ئەو چاوەڕوانییەی لە مێردەکەی هەبێ کە مێردەکەی لەو هەیەتی. ئەم شتە بەو ڕادەیە سەیر و گەپچاڕانەیە کە پیاوێک چاوەڕوانیی ئاکاری وەک خۆی لە "خواکان" هەبێ چونکە بەباوەڕی ئەرەستۆ ئەوە یاسادانەرانن کە مافی ئەوەیان هەیە خۆش بویسترێن؛ نەک ئەوەی کە چاوەڕوانیی خۆشویستنت لێیان هەبێ."[٤٧] لەو پەیوەندییەدا؛ زەماوەندکردن (ازدواج) و دۆستایەتیش لە شتەکانی دیکە ناوازە و ڕیزپەڕ نین. خۆشەویستی و دۆستایەتیکردن؛ چ لە زەماوەنددا بێ، چ لە بوارگەلی دیکەدا؛ دەبێ بە ڕەچاوکردن و لەبەرچاوگرتنی لێهاتوویی و لێوەشاوەیی و پێگەی کۆمەڵایەتیی تاکەکان بکرێ. یەکەم بابەتێک کە لە ئەخلاقی ئەرەستۆدا سەرنجڕاکێشە و جوان دیارە بەکارهێنانێکی بگۆڕ(متغییر) لە وشە و پێوەرەکانە کە بەلای یۆنانییەکانەوە شتێکی نوێ نەبوو. ئەی؛ دەبلێو، ئێچ، ئەدکینز لە کتێبی "ڕۆشنگەر"ی خۆیدا بەناوی بەرپرسیاری و لێوەشاوەییەوە* ئەوە نیشان دەدا کە یۆنانییەکان هەر لە سەردەمی هۆمێرەوە هەتا ئەرەستۆ (جیا لە سەردەمی ئەفلاتوون) واتا و مانایەکی نەگۆڕ و دڵخوازیان بۆ ئەخلاق و چاکە مرۆییەکان نەبووە کە بەپێی ئەو بتوانن پێگەی کۆمەڵایەتیی ژن و پیاو پێناسە بکەن.[٤٨] گرینگترین وشەی پێداهەڵگوتن و ستایشی یۆنانییەکان arete بوو کە مانای چاکە و خۆپاراستنی (تقوا) هەبوو؛ ئەوانیش ئەم وشەیان بۆ پەسن و پێدا هەڵگوتنی پیاوان و نوخبەکان؛ کەسانێک لە ڕەچەڵەک و

* Merit and Responsibity

ڕەگەزی باش (پیاوان) و ئاسوودەییەکانی ژیان بەکاردێنا. هەروک گوترا؛ "چاکە و مەزناهیی ژنان" بە هۆی یەکیەتیی و پەیوەندیی ئەوان دەگەڵ پیاوان پێناسە دەکرا و مانا و واتاکەیان تەواو جیاواز بوو دەگەڵ ئەوەی پێی دەگوترا چاکە و مەزناهیی پیاوان. بە واتایەکی دیکە پیاوان بۆ خۆیان توانایی ئەوەیان هەیە بگەن بە مەزناهی و چاکەی ڕەها. بەڵام ژنان نەک ئەو تواناییەیان هەر نییە، بەڵکو ئەو مەزناهی و چاکەیەی هەشیانە چاکەیەکە؛ کە لە پەیوەندییان دەگەڵ پیاوان پێیان بڕاوە. ئەفلاتوون لە نامیلکەی "منون"دا؛ لە زمانی سوقراتەوە نکوڵی لە پەیوەندیی نێوان ڕەگەز و چاکە دەکا و لە کۆماردا بە شێوەی پاڵەکی (ضمنی) دەڵێ: «ڕەگەز پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەگیان (ڕۆح)ەوە نییە». ڕوون و ئاشکرایە بیروڕاکانی سوقرات لەو کاتدا وەک داهێنانێکی نوێ لەقەڵەم دراون کە ئێمە نابێ بەکەمیان بگرین. ئەرەستۆ لە نووسراوە سیاسی و ئەخلاقییەکانیدا بەنیسبەت ئەو نوێگەری و داهێنانە نوێیانە دژکردەوە دەنوێنێ و بەپێی ئاستی عەقڵانییەتی مرۆڤەکان باس لەچاکە و بەرزبوونی مەزناهییەکان‌یان دەکا. ئەدکینز دەڵێ: ئەرەستۆ هیچ هیوایەکی نەهێشتەوە بۆ هاتنە ئارای پێناسەیەکی دیکە بۆ کۆمەڵگا[٤٩]. ئەرەستۆ لە ڕوانگە زێدەڕۆییانەکەیدا ئەوەندە چووە پێش کە پیاوانی سەربەست و ئەوانەی خەریکی کارە بێ بایەخ و سووکەکانی کۆمەڵگان- وەک پیشەکاران و کرێکاران - بەو چینانەی لە قەڵەمدان کە ناتوانن لە پێناو وەدەستهێنانی مەزناهی و چاکەدا بکەونە هەڤرکی. دیارە ژنان لەو نێوەدا نەک ئەوەنەبوون کە دەگەڵ پیاوان بەراورد بکرێن بەڵکو ئەگەر کەسانێکیش (لە پیاوان) کاروبارەکانی ئەوانی وەک (تەشی ڕستن و....) بەڕێوەبردبا؛ بە خوێڕی و سووک لە قەڵەم دەدران[٥٠]. بەپێی ئەوشتەی ئەرەستۆ دەیخاتە ڕوو؛ پێناسەی چاکییەکانی هەر چینێک بەپێی ئەرک و بەرپرسیارتییەکانیان دیاری دەکرێ. ئەو لەم بارەیەوە دەڵێ: "لێگەڕێ با ئەوە وەک چاکە لەقەڵەم بدرێ چونکە ئەوە باشترین دۆخ و ڕەوشی کارکردن و بەکارهێنانی هەر چینێکە"[٥١]. ئەرەستۆ پانتایی پێناسە دڵخوازەکانی خۆی وا هەراو کرد کە هەمووشتێکی "وەک مەڕ، بزن، ماڵ و گیان"ی لەخۆ دەگرت. هەڵبەت بائەوەمان لەبیربێ کە لەوانەیە پارامێتر و تایبەتمەندییەکانی شتگەلێک بەلای ئێمەوە جێی پەسندبن کە خوڵقاوی دەستی مرۆڤن یا مرۆڤ پەروەردەی کردوون و ئەرەستۆ ئەم پارامێترانەی



دەربڕیوە و باسی لێوەکردوون. بۆ وێنە: تێگەیشتن لە "ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتیانەی لەئەستۆی مرۆڤن لەچاو ئەرکی سەرشانی ماسییەکان" کارێکی ساکارە؛ بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە بیستنی ئەم ڕاڤە و لێکدانەوانە بۆ گوێچکەی ئەمرۆیی شتێکی ئازاردەر و ناڕێکە. ئەرەستۆ لەسەر ئەم باوەڕە بوو: کە هەروەک مرۆڤ ئەرک و بەرپرسیارەتیی لە ئەستۆیە دەستکردەکانیشی واتە ئەوانەی مرۆڤ پەروەردەیان دەکا ئەرکیان لەسەرشانە، بەوجیاوازییەوە ئەوشتانەی لە لووتکەی هیرارشیی هایدن* دان ئەرکەکانیان تەنیا لە پەیوەندی دەگەڵ خۆیاندا دەسنیشان و پێناسە دەکرێن. لە سیستەمی هزریی ئەرەستۆدا، دوو جۆری بنچینەیی و جیاواز لە چاکە و مەزناهی هەیە: یەکەم چاکەی ڕەها و عەقڵانیی بێ کەموکورتیی ئەم پیاوانەی کە لەسەرەوەی پلە بەندیی (هیرارشی) بوونەوەران دان و دووهەم، ئەو چاکە و مەزنایەتییەی کە بە هۆی هەبوونی پەیوەندییەوە بەرهەم دێ و لە جۆری ناڕەسەن و پلە نزمەکانە. ئەو کەسانەی بە هۆی کەسانێکی دیکەوە ئەم چاکە و مەزناهییە وەدەست دێنن؛ بۆ زیاتر وەدەست هێنانی چاکە و مەزناهی ناتوانن لە ئاستی پلەبەندی کراوی چینایەتی خۆیان بچنە سەرتر؛ لەبەر ئەوەی هەر بەشێوەی سروشتی توانایی و لێوەشاوەیی ئەوەیان نییە کە شتێک وەدەست بێنن کە لە ماهیەتیاندا نییە. ئەرەستۆ لەم بارەیەوە دەڵێ: "تەنانەت ژنێک کە بوونەوەرێکە لە پلەیەکی نزم و خوارەوەدایە خاوەن مەزناهی و چاکەیە و کۆیلەیەکیش کە لە ژن نزمتر و سووکترە؛ لەوانەیە خاوەنی مەزناهی و چاکەبێ"[٥٢]، هەڵبەت ئەم مەزناهی و چاکەیە لە ئاستێکدایە کە سروشت لە ناخیاندا خوڵقاندوویەتی و ناکرێ پەرەی پێ بدرێ.

ئەرەستۆ تەنانەت سەبارەت بە پیاوی "ئازاد"ی هاووڵاتی ڕای ئەوەیە کە: "پێناسەی چاکە و مەزناهیی هەرکامێکیان تەنیا دەگەڵ خۆیان و لە پەیوندیی دەگەڵ ئەرکەکانیان؛ یەک دەگرنەوە، هەڵبەت لەلایەکیشەوە دەکرێ پێناسەیەکی هاوبەش بۆ چاکەو مەزناهی بدۆزینەوە کە تەواوی هاووڵاتییان لەخۆبگرێ، وەکو "ناویان"* کە

* هایدن: هستی

* "ناویان" ئەمە ناوێکە بۆ سەرجەم ئەو کەسانە (هەڵبەت لە زمانی فارسیدا) بە کاردەبردرێ کە پاپۆڕێک بەڕێوەدەبەن هەر لە سەربازەوە هەتا کەشتییەوان و.... / لەزمانی کوردیدا هاوتایەکم بۆ

لەلایەکی دیکەوە ئیشەکانیان لێک جیاوازە. بۆ وێنەیەکێ سەوڵ لێدەدا، دووهەمی فەرمانی پاپۆڕی بەدەستە و سێهەمی پاسەوانە، بەڵام تەواویان ئەرکێکی هاوبەشیان لە ئەستۆیە و ئەویش سڵامەتی و پاراستنی پاپۆڕەکەیە. بەو پێیە مەزناهیی هەر هاووڵاتییەک (بەپێی ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە) دەبێ دەگەڵ شار (دەوڵەت) یەک بگرێتەوە و شیاوی شاربێت."[٥٣] ئەرەستۆ لە درێژەی باسەکەدا دەڵێ: "چاکی و باشییەکەی شار لەوەدایە کە هاووڵاتییان شارەزای هەردووک هونەری فەرمانڕەوایی (دەسەڵاتداری) و فەرمانبەری (ژێردەستی) بن و مەزناهی هاووڵاتییەکی باش لەوەدایە کە فێری هەردووک «خاڵەکە بێت و لەهەر دووک هونەر سود وەرگرێ»[٥٤] لێرەدا دەبێ ئاماژە بە دوو خاڵ بکەی:

١- ئەو دوو هونەر و تەکنیکەی هاووڵاتی فێریان دەبێ تەکنیک گەلێکن کە لە ئاستی چینایەتیی ئەواندا باوە و سروشت ئەو تواناییەی پێداون کە فێری ئەو تەکنیکانەبن و بۆ خزمەتکردن لە شاردا دەکاریانبکەن.

٢- بوونی ژنان بەگشتی پێویستە, بەڵام وەک بەشێک لە شار (دەوڵەت) لە قەڵەم نادرێن چونکە لە سروشتیاندا نییە هاوکات بتوانن فێری دوو هونەر (فەرمانڕەوایی و فەرمانبەریێتی) بن. ئەوان خاوەنی جۆرێک فەزیلەتن ئەویش فەرمانبەریێتی (ژێردەستی) یە کە رۆڵێکی سروشتی و هەمیشەییە بۆ ئەوان. دەبینین لێرەدا پێوەرگەلێکی ئەخلاقیی نەگۆڕ و دەسنیشانکراو بۆ ژنان دانراوە. دەبوایە ئەم پێوەرە نەگۆڕانە وەک ئەرکی زاووزێکردن بێ پسانەوە بەڕێوە بچن بۆ ئەوەی هاووڵاتیی نوێ و سەربازی بوێر بەرهەم بێنن و بیدەنە دەست شار و کۆمەڵگا.

بەو پێیە جوان دیارە کە ئەرکی ژنان جیاوازە لە ئەرکی هاووڵاتییەکانی دیکە و هەر بۆیەش مەزناهییەکەشیان جیاوازە لەهی ئەوانی دیکە. بەوشێوەیە کۆیلەیەکیش لەبەر ئەوەی ئەرکەکەی لە پێشەکارێک جیاوازە مەزناهی و چاکەشی جیاوازە.

ئەرەستۆ لە کتێبی سیاسەتدا باس لەوە دەکات کە فەرمانڕەوا و فەرمانبەر هەردووکیان دەبێ خاوەن مەزناهی و چاکەبن، بەڵان دەبێ جیاوازیی دانێین لە نێوان مەزناهی و چاکەکانیان. جیاوازیی نێوان ئەوانەی بۆ فەرمانڕەوایی خوڵقاون

---

نەدۆزییەوە کە پڕبەپێست و گونجاو بێ. لەوانەیە "ستافی رۆژنامە" نزیک بێ لەوە. کە هەڵەچن، نووسەر و سەرنووسەر و راوێژکار و بەشە جیاجیاکان لە خۆدەگرێ. وەرگێڕ



زۆر روون و بەر چاوە لەوانەی بۆ فەرمانبەریێتی و ملکەچی لە دایک دەبن. هەر بەچاولێکردنێک دەکرێ ئەم جیاوازییە بە جوانی لێک جیا کەینەوە کە لە رۆحی مرۆڤ دایە. چونکە رۆحی مرۆڤ دوو بەشی هەیە: ئەوەی کە فەرمان دەدا و ئاوەزمەندە و ئەوەی کە فەرمان بەڕێوە دەبا و لە ئاوەز بێبەرییە. هەرکام لەو دوو بەشەش مەزناهییەکی جیاوازی هەیە. سەبارەت بەتوخمەکانی دیکەی فەرمانڕەوا و فەرمانبەریش ئەوشتە بەڕوونی وایە هەربۆیەش فرەمانڕەوا و فەرمانبەران جۆراوجۆرن؛ چونکە فەرمانڕەوایی مرۆڤی ئازاد و سەربەست بەسەر کۆیلەدا، مێرد بەسەر ژندا و باوک بەسەر منداڵەکانیدا وەکی یەک نین. هەمووان خاوەنی ئەم دوو بەشەی رۆح (بەشی ئاوەزمەند و بێ ئاوەز)ن کە ئێستا باسیانکرا، بەڵام هەرکام بەشێوەی جیاواز. لەبەر ئەوەی کۆیلە بێبەرییە لە توانایی بیرکردنەوە. ژن ئەم تواناییەی هەیە, بەڵام دەسەڵاتی بڕیاردانی نییە و منداڵیش بە شێوەیەکی ناکامڵ و پەروەردە نەکراو هێزی تێفکرین و بیرکردنەوەی هەیە. مەزناهی و چاکە ئەخلاقییەکانیشیان هەر بەمجۆرەیە، واتە دەبێ هەمووان ئەم مەزناهییەیان هەبێ؛ بەڵام هەرکام بەو رادەیەی شیاوی ئەرک و بەرپرسیارەتییەکەیەتی. فەرمانڕەوا دەبێ خاوەنی باڵاترین پلەی هەمووی ئەم مەزناهی و چاکەیەبێ. چونکە ئیش و کاری ئەو بەشێوەی رەها و لە سروشتی تەواوی خوێدا پێویستی بە وەستایەکی لێزان و پیشەکار هەیە و ئەم وەستا کارزانە ئاوەزە. لەم رووەوە دیارە کە تەواوی ئەوانەی باسیانکرا خاوەنی چاکەی ئەخلاقیی تایبەت بە خۆیانن و بەپێچەوانەی بۆچوونی سوقرات؛ "میانەڕەوی" و هەروەها دلێری و دادپەروەری ژن و پیاودا یەکسان نین. دلێریی یەکێکیان (پیاو) لە فەرمانڕەواییدا و دلێریی ئەویتر (ژن) لە فەرمانبەریێتیدا دەردەکەوێ و ئەم راستییە چاکە و مەزناهییەکانی دیکەش دەگرێتەوە"[٥٥].

بەپێی ئەو رەوتەی ئەرەستۆ لە سەرانسەری نووسراوەکانیدا دەکاری کردووە دوو جۆر پێناسەو پێوەری ئەخلاقی بۆ پیاو و ژن هەیە. لە درێژەی باسەکەی پێشوویدا سەبارەت بەژنان دەڵێ:

"لەم رووەوە بێینە سەر ئەم باوەڕە کە وتەی سۆفۆکێلی شاعیر حەقیقەتێکی گشتگیری هەیە کە دەڵێ: بێدەنگی خشڵ و زینەتی ئافرەتە، ئەگەرچی ئەم وتەیە...

بۆ پیاوان دروست نییه"[٥٦]. روون و ئاشکرایه کە لە قوتابخانەی هزریی ئەرەستۆدا فەزیلەتی ئەخلاقی و جەستەیی ژن و پیاو لێک جیاوازن. بۆ وێنە لەو پێجێیەی کە هەردوو رەگەز پێویستە جوان رێکوپێک بن تەنیا پیاوەکانن کە شیاوی ئەوەن جەستەیان پەروەردە بکەن یا لەوکاتەدا کە دەبوایە ژن و پیاو هێزی متمانە بەخۆیی و پشت بەخۆ بەستنیان وەدەست بێنن دیسانیش هەر پیاوەکان هان دەدرێن و بوێری و چاونەترسی و متمانەبەخۆیی خۆیان بەهێزتر دەکەن. لە بەرامبەردا ئەم هێزەی ژنان بە هۆی عادەت و دابونەریتە باوەکان نەک هەر تووشی داکشان دەبێ بەڵکو بە ئانقەست سەرکوتیش دەکرێن.[٥٧] ژنان بەردەوام هان دەدرێن بۆ ماڵداریێتی و چێشت لێنان و جلوبەرگ شۆردن. چونکە بەپێی باوەڕی ئەرەستۆ "ژن هەرگیز شیاوی ئەوە نییە ژیر و ئاوەزمەندبێت و کاروباری پیاوان راپەڕێنێ". ئەرەستۆ بەو هۆیە رەخنە لە ئۆریپید دەگرێ کە بۆچی ئەم سیفەت و خەسڵەتانەی بە ژنان بەخشیوە.[٥٨] هەر وەک گوترا؛ ئەرەستۆ لە پلەبەندیی و هیرارشییەکەیدا؛ ئاوەزمەندی بەموڵکی پیاوان و شارەزایان و کارزانان (نخبگان) دەزانێ و لە ئاوەزمەندێتیدا ژنان بەکەم عەقڵ و خاوەن توانایییەکی کەم و بەرتەسک لە قەڵەم دەدا و کۆیلەکانیش بەگشتی وەک بوونەوەرێکی بێبەری لە توانایی بیرکردنەوە دێنێتە ئەژمار."[٥٩] دیارە سەرمان سوڕنامێنێ ئەگەر ئەرەستۆ ئاوەزمەندێتی کەسەکان دابەش دەکا و بۆ هەرکامێکیشیان جیاوازییەک دادەنێ چونکە ئەو لەپێشدا رۆحی مرۆڤی دابەش کردبوو بەسەر دووبەشدا و گوتبووی کە هێندێ کەس وەک فەرمانڕەواکان لە هەردووک بەشەکە کەڵک وەردەگرن و هێندێکی دیکە وەک ژنان توانایییەکی بەرتەسکیان هەیە لە ئاوەزمەندێتیدا؛ بەڵام دەسەڵاتی بڕیاردانیان نییە.[٦٠] لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ و دەبێ وەڵامی گونجاوو پڕ بە پێستی پێ بدرێتەوە، ئەویش ئەوەی کە سروشتێک کە هیچ شتێک لە خۆڕایی و بێهودە ناخوڵقێنێ بۆچی... هێز و توانای ئاوەزمەندیی بەژن بەخشیوە، بەڵام لە دەسەڵاتی بڕیاردان بێبەریی کردووە؟ دیارە ئەرەستۆ پێوەرە زەینی و جەستەیی و فەزیلەتە ئەخلاقییەکانی ژنانی بەپێی ئەو ئەرک و بەپرسیارەتییانە داناوە کە لە هەمبەر پیاودا لە ئەستۆیەتی. بۆ وێنە؛ ژنی باش و لێهاتوو بەلای ئەوەوە ژنێکە؛ کە تایبەتمەندیگەلێکی وەک؛ بێ دەنگی و حەیا و ناموسی هەبێ لە بەرامبەریشدا ئەو



تایبەتمەندییانە بۆ پیاو بە عەیب و ئیراد دەزانێ. ژن نابێ تایبەتمەندیگەلێکی وەک بەهێزی و هۆشیاری وەدەست بێنێ چونکە ئەم خەسڵەتانە تایبەت بە پیاوانن. ئەرەستۆ کاتێک دێتە سەر هەڵسەنگاندنی کەماڵ و گەورەیی ژن و پیاو؛ لە دەرەنجامی قسەکانیدا تووشی پارادۆکسێکی زەق دەبێ و نکوڵی دەکا لە تواناییەکانی ژنان ئەگەرچی هەن.

ئەرەستۆ لە رووی ئەخلاقییەوە؛ چاکەی مرۆڤ دابەش دەکا بەسەر دوو جۆردا:

١- چاکە و مەزناهیی سروشتی؛ کە هەر کەسێک ئەم مەزناهییەی هەبێ دێتە نێو خانەی "چاکەی رەها"وە.

٢- چاکە و مەزناهییەک کە بە هۆی بەستراوەیی بەشێکی دیکەوە بەرهەم دێ و ئەویش لە جۆری "چاکەی رێژەییە"[٦١]. "چاکەی رەها؛ هی ئەو پیاوانەیە کە لە لووتکەی قووچەکی پلەبەندییەکەدان و کەوتوونەتە بەرامبەر ژنان. چاکەی رێژەییش هی ئەو تاقمە پیاوانەیە کە دەکەونە بەرامبەر گەمژەکانەوە. ئەم جۆرە چاکەیە دەکەوێتە خوارەوەی قووچەکی ئەرەستوویییەوە. چاکەڕەهاکان لە ناخی ئەو کەسانەدان کە بە شێوەی سروشتی، ژیرن و ئەوەش تایبەتمەندیی ئەو پیاوانەیە کە کەوتوونەتە لووتکەی پلەبەندی و هیراشییەکەی ئەرستۆوە و ژنان لەو تایبەتمەندییە بێبەرین .[٦٢] .

خوێنەران دەتوانن ئەم خاڵانە لە نووسراوەکانی دیکەی ئەرەستۆ بۆ وێنە لە "خطابە" و هونەری شیعر Rhetoric دا ببینن. ئەرەستۆ لە رەوتی بازنەیی بەڵگە و بەڵگاندنەکانی خۆیدا بەو دەرەنجامە دەگا کە ژنان لە چاوپیاوان رەگەزی پلەدوون و بە شێوەی سروشتی هێزی ئاوەز و ژیرێتییان کەمتر و نزمترە و لە پلەی بەهاداریێتی پیاواندا وەک کەرەسە و ئامراز چاویان لێدەکرێ. بەو پێیە تیۆریی هیرارشیی ئەرەستۆیی بووەتە هۆی سەرهەڵدانی ئاکاری ئەرکوەخۆگرانەی ژنان و پێگە و پلەیەکی "سروشتی" کەم و نزمی بۆ پێکهێناون.

روانگەی ئەرەستۆ بەنیسبەت کۆمەڵگا روانگەیەکی هیرارشی و باوک سالارانەیە. هەر ئەم تێڕوانینەشە ئیزنی ئەوەی پێدەدا کە لە سەر چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا و پێش گریمانەکانی خۆی قسە بکا و لە هەوڵی "سەلماندنیان" دا بێ. هیچ گومانێک لەوەدانییە کە ئەرەستۆ ئافرەتی وەک بوونەوەرێکی پلەدوو بەپێی ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتییانە ناساندووە کە لە کۆمەڵگای یۆنانیدا لە ئەستۆی بوو.

کۆمەڵگای یۆنانیی ئەوکات کۆمەڵگایەک بوو کە ژنان هیچ پوان و بەشێکیان نەبووە و بێ هیچ تێبینییەک سەرکوت دەکران. لە بەرامبەردا ئەوە پیاوان بوون کە چارەنووسی ژنانیان دیاری دەکرد و زاڵ بوون بەسەریدا و لە روانگەیەکی پیاوانەوە رۆڵ و بەها چەندایەتی و چلۆنایەتییەکانیان بەسەردا دەسەپاندن. هەربۆیەش ئەرەستۆ هیچ حەزی لەوەنەبوو کە لە نووسراوەکانیدا هیچ شتێک لەسەر بەهاکانی ژن بنووسرێ. ئەو وێڕای ئەوەی کە باوەڕی بەوە هەبوو کە ژینگە لەسەر توانایی و کەسێتیی مرۆڤەکان شوێندانەرە؛ پێی خۆش نەبوو کە بێجگە بۆ پیاوە سەربەستەکان؛ وەها باوەڕێکی سەبارەت بە کەسانی تر و بە ژنان هەبێ. هەروەک لەپێشدا گوترا ئەرەستۆ بەگشتی تێوریيە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی لە فۆرمی هیرارشیی بوونەوەراندا خستۆتەڕوو، پیاوانی هەڵکەوتە و بلیمەت و ژیر و فەرمانڕەوا کەتوونەتە لووتکەی ئەو پلە بەندییەوە و ئەوانەش کە، کەوتوونەتە پلەی خوارەوە ئەو کەسانەن کە بەپێی ئەرک و بەرپرسیارەتی و پێگە کۆمەڵایەتییەکان لە پلە جیاوازەکاندا پۆلێن بەندی کراون. ژنان لەو پلەبەندییەدا کەوتوونەتە خوارەوە و لە ریزی منداڵان، ئاژەڵ و کەلوپەلەکاندان. بەواتایەکی دیکە، ئەرەستۆ لە راستیدا جەماوەرێکی بێ هەژماری خەڵکی وەک بوونەوەرگەلێکی پلەنزم و وەک ئامراز و کەلوپەل لەقەڵەم دەدا کە دەبێ ملکەچی بڕیاری ئیلیتەکانی سەرەوە بن و دەبێ هەرچی لە سەرەوەڕا بۆ ئەو خەڵکە دەسنیشان دەکرێ ئەوان بیکەن و بەڕێوەی بەرن. بەداخەوە ئێستاش لایەنگرانی ئەرەستۆ بە شێوازی جۆراوجۆر بانگەشە بۆ ئەم روانگەیە دەکەن و پەرەی پێدەدەن. بەسەرنجدان بەو گەشەپێدانەی چەمکی یەکسانی و مافی مرۆڤەی کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا دەستی پێکرد بەشێکی زۆری تێوریی "فەلسەفەی دوایین هۆ"* و تێوریی کۆمەڵایەتیی ئەرەستۆ کەوتە بەر گومان و وەرنەگیرا. ئیتر کاتی ئەوە بەسەرچووە پاساوی بۆ بێنیتەوە و دیفاع بکەی لەوەی کە هێندێ لە مرۆڤەکان بە شێوەی سروشتی مافی ئەوەیان هەیە ئەوانی دیکە بکەنە کەرەسە و ئامرازی دابین کردنی ویست و پێداویستییەکانیان. دەبێ بەو تاقمە لە لایەنگرانی ئەرەستۆ[٦٣] کە دەیانەوێ ئەمەکدرابن بە بۆچوونە سیاسی و ئەخلاقییەکانی مامۆستاکەیان؛ بڵێین: دوو رێگەیان لەبەردەمە:

* حکمت علل غایی



١- دەبێ دەست هەڵگرن لەو باس و قسەچەواشە و بێ بنەمایانە کە دژی مافی مرۆڤن و بۆ مێژووی هزروبیری مرۆیی، خۆیان لەو تێفکرین و بیرە قێزەونانە ببوێرن.

٢- یا ئەوەی کە بە بەڵگە و دیکۆمێنتی نوێ بیسەلمێنن کە مرۆڤەکان بە گشتی لە کەرەسە و ئامراز بەدەر شتێک نین و ژنانیش بە تایبەتی بەرەگەزی دووهەم لە قەڵەم دەدرێن.

## بەشی پێنجەم:

# جان جاک رۆسۆ و نەریتی باوک مەزنی مۆدێرن

باوەڕەکانی رۆسۆ سەبارەت بە سروشت، خووخدە، پەروەردە و راهێنان و پێگەی کۆمەڵایەتیی ژن لەبەرسێ هۆی گشتی شیاوی تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەن. یەکەم: ئەوەی کە باسەتیۆرییەکانی رۆسۆ سەبارەت بە ژن دژایەتیی هەیە دەگەڵ پرنسیپ و بنەما گرینگەکانی بۆچوونە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکانی خۆی و کاریگەرییەکی دڵساردکەرەوە و هیوابڕی لەسەر باوەڕە فەلسەفییەکانی بەجێهێشتووە. ئەم تیۆرییانە کە ئێجگار هۆشیارانەن و بەمەستی پاساودانی مەسەلەکانی ژنان خراونەتەڕوو، پێشاندەری نەریتگەلێکن کە لە رۆژئاوا باون. رۆسۆ زێدەڕۆیانە و جاروبار هەستەوەرانە، بەهێنانەوەی بەڵگەی عەقڵانی پاساوی پاکانەی کردووە بۆ تەواوی ئەو شتانەی لە کەلتووری باوک مەزنیی patriarchal رۆژئاوادا باوە و بە دەرەنجام و ئاکامی سەرکوت و هەڵاواردنی ژنان لە درێژایی مێژووی رۆژئاوادا لە قەڵەم دەدرێن. ئەو؛ پێگەی جیاواز و هەڵاواردن و ئەم جیاوازی خستنانەی کە بەنیسبەت ژنان دەکرێن؛ بە ئەرک و بەرپرسیارتییەکیان دەزانێ کە سروشت بەپێی رەگەز خستۆیەتە ئەستۆیان. روانگەی رۆسۆ دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی کۆن و دووورودرێژی سەردەمی ئەرەستۆ و بگرە دوورتریش. چونکە ئەو لە رۆچنەی ناتورالیستیی خۆیەوە باوەڕی وایە کە ژن سروشت و دەروونێکی جیاواز لە سروشتی پیاوی هەیە. سروشت بەپێی تواناییەکانی هەرکام لە رەگەزەکان ئەرکێکی بۆ دیاری کردوون. بۆ وێنە: ژنان بە هۆی خسڵەتی زاووزێ؛ خووخدە و سروشتیان لە پیاوان جیاوازە و لە شوێنێک کە پیاوان بەپێی سروشتیان خاوەنی توانایی لە رادە بەدەر، ئاوەز، بیر و هزر و هێزی داهێنان و خوڵقاندنن؛ ژنان بەپێی تایبەتمەندیی ژنێتی واتە زاوزێکردن کە نیازی "زەرووری" سروشتە؛ لە



وەدەستهێنانی ئەم توانایی و هێزی هزر و تێفکرینە دوادەکەون. هەروەها پێکهاتەی ژن پێکهاتەیەکی جەستەیی و ماددیی هەیە و لە بەرامبەردا پیاو خاوەنی پێکهاتەیەکی عەقڵانی و رۆڵێکی خولقێنەرە. وەها روانگەیەک سەدان ساڵ لە مێژووی رۆژئاوادا باوبووە و جیاوازیگەلێکی بنەڕەتی و گرینگی خستۆتە سەر رێگەی فێربوونی زانست و گەشە و برەوپێدانی لە نێوان ژن و پیاو دا. جان جاک رۆسۆش؛ لەم جۆرە تێڕوانینانە بەنیسبەت ژنانەوە خافڵ نەبوو؛ "چونکە ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە هێز و توانای ژیریتیی ژنان بۆ درک کردن و تێگەیشتن لە بیرۆکە رووتەکان (تجریدی) ئێجگار لاواز و ناتەواوە".[1] لە هاوئاهەنگی و هاوتەریبی دەگەڵ ئەم نەریت و رێوشوێنە کۆنانەوەیە کە بۆ وێنە؛ پاندۆرا؛ کلی تێمنەیسترا clytemnaestra، لیلیث lilith حەوا Eve، دەڵەدێو succubi و ژنانی جادووباز witches بەو ژنانە دەگوترێن کە لەجیهاندا هێمای سەرەکی خراپەن و وێڕای خراپەکاریی ئەوان، ناوی بوونەوەرێکی وەک ژن کەوتۆتە سەرزاران و وەک شەیتان و سەرچاوەی خراپە ناوی زڕاوە.

رۆسۆ نەک هەر لە هێندێ بۆچوونی خۆیدا بە شوێن ئەم نەریتەداچووەو رەچاوی کردووە بەڵکو لە زۆر جێگەش داکۆکیی لێ کردووە و پاساوی بۆ هێناوەتەوە. مێژوونووسانی هاوچەرخ سەبارەت بە مەسەلەی باوک مەزنی و شێوازە جۆراوجۆرەکانی؛ گەلێک لێکۆڵینەوە و موتاڵایان کردووە و "پێیان وایە ئەوەیکە ژن بە سەرچاوەی خراپە و هۆکاری مەترسی ناسراوە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی دوور و درێژی باوک مەزنی لەجڤاتەکاندا[2]". بە خوێندەوەی بەرهەمەکانی جانجاک رۆسۆ دەکرێ بەڕوونی تێبگەین کە ئەو لە ناخەوە چۆن لە ئافرەتی روانیوە. لەڕوانگەی رۆسۆوە: "ژنان بوونەوەرێکن کە دەبنە هۆی بزووتن و گڕگرتنی حەزە سێکسییەکان و دروستبوونی هەستی ترس و گوناح و بەوجۆرە سەربەخۆیی و متمانەبەخۆیی تاک دەخەنە مەترسییەوە."[3] لەوکاتەوە کە ژن وەک هێمای هێزی ناکۆتای شەیتانی ناوی کەوتە نێو ناوان؛ تەنیا لەم بیاڤەدا لێیان روانی و بۆ بەربەرەکانێی ئەو دژبەرێکیان دروست کرد. ئەویش ئەوەی کە پیاوان دەبێ لەهەمبەر وەها هێز و خراپەیەکدا خۆڕاگر و کۆڵنەدەربن و بەو پەڕی مەزنییەوە پێشی هەراوتر بوونی

هەرێمی شەیتانیی ژنان بگرن. بە واتایەکی دیکە لەو کاتەوە وا دەرکەوت کە ژن بە سەرچاوە و دەسپێکی گوناح و خراپە لە قەڵەم بدرێ ئیدی سەرکوت کرد و وێستان لە بەرامبەریاندا بەڕەوا زانرا و پاکانەی بۆکرا. بۆ وێنە رۆسۆش وەک ئەوانی دیکە دێتە سەرلێکدانەوە تەوراتییەکە؛ کە دەڵێ تووک و نەحلەتی خودا بۆ حەوا هەر ئەوەبێ کە بەژان و ئازارەوە منداڵی بێ.(٤)

باس و لێکۆڵینەوەکان لەمەڕ ژنان لە نێو هاوکێشە کۆمەڵایەتی و حەزە سێکسییەکانیاندا و لە پەیوەندیی دەگەڵ پیاوان؛ مەسەلەیەکی دیکەیە کە رۆسۆش خۆی پێوە خەریک کردووە. بەگشتی لە باری حەز و کردەی سێکسییەوە پیاو بەردەوام چاوەڕوانیی ئەوەی هەیە کە نەک هەر لەژێر رکێفی ئاکار و حەزەسێکسییەکانی ئەودابێ و بەدڵی ئەو هەڵسووڕێ بەڵکو دەبێ بە شێوەی بوونەوەرێکی دووکەرت dichotomize هەڵسوکەوت بکا. پیاو بەهێزی پاڵنەریی سێکسی خۆی بە شێوەی کاتی و بە هۆی چێژخوازیی خۆی دەیەوێ ژن هەم پاڵنەر و بزوێنەری هەست و حەزە سێکسییەکانی ئەو بێت و هەم ئەوەی کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی حەزە سێکسییەکانی خۆی بەرپرسیارەتیی کۆنترۆڵ کردن و دامرکاندنەوەی هەست و حەزە سێکسییە بێ سنوورەکانی پیاویش بگرێتە ئەستۆ. بە واتایەکی روونتر پیاو دەیهەوێ ژن هەم دابینکەر و دامرکێنەری حەزە سێکسییەکانی ئەو بێت و هەمیش خۆی (ژن) بوونەوەرێکی پاکداوێن و راستگۆ بێ. لە روانگەی پیاوانەوە ژنان وێڕای تەواوی جیاوازییەکانیان بەیەکەوە؛ بوونەوەرگەلێکی دوو کەسێتی و دووکەرتن؛ بەو مانایە کە وێڕای ئەوەی خراپ و خراپەکارن؛ چاک و دڵگریشن. ئەو ژنانەی گڕی حەزە سێکسییەکانیان زۆر بە تینە لەلایەکەوە بۆ پیاوان سەرنجڕاکێش و ئایدیالن و لە لایەکیش ئەوان دەبێ حەزی ناسێکسی یا سارد و سڕیان هەبێ. پیاوان وێڕای ئەوەی دەیانهەوێ ژنەکەیان بە حەیا و بە ئەدەب و داوێن پاک بێ؛ بۆ خۆیان دەکەونە شوێن ژنانی دیکە و سەرنجدەدەن بە باری حەزە سێکسییەکانیان. جان جاک رۆسۆش یەکێک بوو وەک ئەوانی دیکە بۆ وێنە؛ ئەو کە ترسی هەبوو لە تووش بوون بە "سیلفیس"(٥) بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە کۆمەڵایەتییە دوو جۆر ژنی لێک جیاواز دەناسێنێ؛ واتە دوو جۆر لەو ژنانەی



کە ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانیان تەواولێک جیاوازن. (لە بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا دەچینە سەریان). رۆسۆ لە بەرهەمەکانی خۆیدا روخساری ژنێک وێنادەکا کە خاوەنی دووجۆر ئاکاری سێکسی جیاوازە واتە؛ ژنێک کە بەحەیا و شەرمە و ژنێک کە فریودەر و هەلخەڵەتێنەرە ئەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە پیاوان دەبێ ژنێک بۆ ژیان هەڵبژێرن کە وەک ژنانی رۆژهەڵاتی؛ نەجیب، گران و سەنگین، حەیا بەخۆ و شوکرانە بژێر و وەک ئاوی زمزم* پاک بن، بەڵام هەر ئەم پیاوانە بەر لە زەماوەند حەزیان لەو ئافرەتانەیە، کە خۆش سەودا و بەناز و عیشوە فرۆش و رووهەڵماڵراون. بەواتایەکی دیکە پیاوان چاوەڕوانییان هەیە ژنەکانی خۆیان؛ داوێن پاک؛ گران و سەنگین و شوکرانە بژێربن، بەڵام ژنانی دیکە خۆش سەودا و ناز فرۆش. ئەم دوو تێڕوانینە بەو مانایەن کە لە روانگەی پیاوانەوە لانیکەم دوو جۆر ژن هەیە کە خاوەنی دووجۆر کەسایەتی و ئاکاری جیاوازن: دەستەیەک ئەوانەی داوێن پاک و گران و سەنگینن و ئەوانەش وا لەش فرۆش و بەڕەڵڵان. لەو پەیوەندییەدا پێکهێنانی بنەوبنەچەکە و رەچەڵەک کە ئەویش خۆی گرێکوێرەیەکی دەخستە سەر کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ژنان، بۆ رۆسۆ ببووە گرێیەکی دەروونی. ئەو هەر جارنەجارێک لەبەرهەمەکانیدا هێندێ پاساو و بیانووی بۆ ئەوە دەهێناوە کە بۆ دەبێ پیاو دڵنیابێ لەوەی کە ژنەکەی پێی وەفادارە و منداڵەکانی لە خۆیین و لە یەکێکی دیکەنین؟

ئەم بەڵگانە روونی دەکەنەوە کە رۆسۆ پێوەرگەلێکی ئەخلاقیی تەواو جیاوازی بۆ پیاوو ژن هەبووە و باوەڕی وابووە کە پیاوان دەبێ بەسەرژناندا زاڵ و بەزیپکوزاکون بن. بۆ وێنە: رۆسۆ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پیاوان دەبێ لێبڕاوانە ژنەکانیان کۆنترۆڵ کەن و پاش زەماوەندکردن سنووری ئازادییەکانیان لە ماڵێدا بەرتەسک بکەنەوە و تەنانەت پێی باشە لەماڵێدا کوڕ و کچیش لێک هەڵاوێردرێن. جیاوازای هەیە لە نێوان ئەو شتەی کە رۆسۆ بۆ دەستەبەرکردنی زانستی ئەخلاق بەژنانی پێشنیاردەکا دەگەڵ ئەو شتەی بۆ پیاوانی لەبەرچاودەگرێ. رۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە توانایی و

* نووسەر بۆ پاک بوونی مرۆڤ دەڵێ وەک "مەڕمەڕ پاکە" کورد پاکی بە ئاوی زمزم یا ئاوی شەو دەشوبهێنێ. (فلانی وەک ئاوی شەوپاکە و. ک)

پێوەرەگەلێکی ئێجگار زۆر لە پیاواندا هەیە کە ئەوان دەتوانن بە هۆی ئەم پێوەرانەوە بگەنە ئەوپەڕی چاکە و مەزناهیی، بەڵام تەنیا یەک چاکە بۆ ژنان هەیە کە ئەوان دەبێ وەدەستی بێنن ئەویش مەزناهی داوێن پاکییە. بە سەرنجدان بەو بابەتانە؛ جێی سەرسوڕمانە کە رۆسۆ وەک فەیلەسووف و بیرمەندێکی کەلتووری سیاسیی رۆژئاوا نکوڵی دەکا لە یەکسانی و ئازادیی ژن و پیاوان بە شێوەی یەکسان و باوەڕی بەوە نییە کە ئەوان وەک یەکن لە گەیشتن بەسەرەتاییترین نۆرم و بەها مرۆییەکان. هەروەکی لە بەشەکانی داهاتوودا دەچینە سەری، ئەو کاتێک باس لە سەرچاوەی نایەکسانییەکانی نێوان مرۆڤەکان دەکا بێ لێ زیاد کردن (أغراق) تەنیا لە پەیوەندی دەگەڵ پیاواندا ئەو نایەکسانییانە تاوتوێ دەکا و ژنان لەو بابەتە هەڵداوێرێ. هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نایەکسانیی نێوان ژن و پیاو لە رابردوودا شتێکی قبوولکراو و جێی کەتوو بوو. بۆیەش بیرمەندگەلێکی وەک رۆسۆ لەلێکۆڵینەوە و موتالاکانیاندا بە پێویستیان نەدەزانی لە کاتی قسەکردن لەسەر نایەکسانیی مرۆڤەکان مەسەلەی ژن بێننەگۆڕێ و تاوتوێی بکەن (لە بەشەکانی دواییدا بە تێروتەسەلی باس لەو مەسەلەیە دەکەین). کورتی ببڕینەوە؛ بۆچوون و تیۆرییە باوک مەزنییەکانی رۆسۆ پێشاندەری نەریتێکی دوور و درێژ بوو کە بەسەر ژناندا دەسەپێندرا. ناکرێ ئەم تیۆرییانە بێنینە ریزی گریمانە و باوەرە پڕ لە دەمارگرژی و رووکەشییەکانی رۆسۆ کە وەک هەڵەی مێژوویی و کاتی لە قەڵەم دراون، لەبەر ئەوەی کە رۆسۆ گەلێک بەڵگە و فاکتی بۆ تیۆری و بۆچوونەکانی خۆی هێناوەتەوە.

ئێمیل Emile چیرۆکێکە؛ کە رۆسۆ تێیدا شێوەی ئایدیال و دڵخوازی پەروەردە و فێرکردنی (بەڕای خۆی) سەبارەت بە ژنان خستۆتەڕوو و پێیوایە ئەم کتێبە "یەکێکە لە باشترین بەرهەمەکانی". دیارە بۆ تێگەیشتن لە تێڕوانینی جان جاک رۆسۆ پێویستە ئەم کتێبە بخوێندرێتەوە و پێویستە لێکۆڵینەوە و موتالاکردن لەسەر ژنان بەو کتێبە دەست پێ بکرێ [٦] و دوای ئەوە باس لە سەرچاوەی نایەکسانیی ئەو بکرێ.[٧] رۆسۆ بەشی پێنجەمی کتێبی ئێمیل کە پەیوەندیی بە پەروەردە و فێرکردنی سووفی (ژنی ئایدیال)ی ئەوەوە هەیە بە باشترین و بەپێزترین بەشی کتێبەکەی دەزانێ[٨]. ئەو لەو نامە رەخنەییانەیدا کە سەبارەت بە



شانۆ بۆ خاتو دالەمبێر Madam d,Alembert ی نووسیون بە روونی دەریدەخا کە ژنان لە دروستکردنی گەندەڵیی لە کۆمەڵگادا چەندە خەتابارن.[٩] بەڕاستی رۆسۆ کەسێک نەبوو کە باوەڕی دەمارگرژییانە و کاتی قبووڵ بکا[١٠]. چونکە نەک هەر داکۆکیی دەکرد لە بیروباوەڕی خۆی بەنیسبەت ژنان– کە بیروباوەرێکی کۆن و نەریتی و هەڵە و کۆنزەرواتیڤ بوون – بەڵکو ئەم باوەڕانەی بەدژکردەوەیەکی پۆزەتیڤ بەنیسبەت رەوشی ئافرەتانەوە لە قەڵەم دەدا. هەروەها ئەو راشکاوانە دژی ئەو بیرمەندانە راوەستا کە بیروراکانی ئەویان لەپەیوەندیی دەگەڵ ژناندا بەبیروباوەڕێکی نەریتی و فریودەرانە لە قەڵەم دەدان. ئەم بیرمەندانە بیروباوەڕەکانی ئەرستۆیان بەشتێکی دەمارگرژانە و لە ئاراستەی بەرژەوەندیی پیاو مەزنیدا زانیوە و پێیان وابوو ئەو دەیهەوێ وابنوێنێ کە ملکەچی و ژێردەستەیی ژنان ئاکامی دەمارگرژی و پەیمانی کۆمەڵایەتی نییە بەڵکو بەشێکە لە تەکووزی سروشت و پێویستیی کاروبارەکان.[١١]

کاتێک مرۆڤێکی سەربەخۆی وەک ئێمیل لەلایەکەوە بیروباوەڕەکانی خەڵک (ئەوانی دیکە) بەهێندە وەرناگرێ و پاساو دێنێتەوە بۆ ئەم تێڕوانینەی کە پێیوایە پیاو لە هەمبەر هەڵسوکەوت و ئاکاری نالەبار و هەڵەی هاوسەرەکەیدا بەرپرسیارە و ئەوەش بەشتێکی ناوازە لە قەڵەم دەدا و لەلایەکی دیکەوە؛ پێیوایە تەواوی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی سروشتی لەوەپێش رێکوپێک کراون[١٢]. لە راستیدا لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئەو نایەکسانی و جیاوازییانەی لە نێوان ژن و پیاودا هەن و بە هاسانی لە نێو یاسا و نەریتەکاندا بەدی دەکرێ لە هزر و بیری مرۆڤەوە هەڵنەقوڵیون بەڵکو هەموان هۆکاری سروشتییان هەیە.[١٣] لەو سەردەمەدا کە رۆسۆ ئەم بابەتگەلەی دەنووسی کەشی کۆمەڵایەتیی ئەوکات دەگەڵ مەسەلەی ژن نامۆ نەبوو. چونکە باس و لێدوان لەسەر مەسەلەی ژن و رەوشی بەکەمگرتنی کۆمەڵایەتیی [مێینە]و کەلتووری پیاومەزنی کە سەدان ساڵ بوو تووشی هاتبوو لەوکاتیشدا هەر لەگۆڕێدابوو. بۆ وێنە مۆنتسکیۆ montesquieu لە نامە ئێرانییەکاندا persian Letters هێندێ لە بابەت و مەسەلە سەرەکییەکانی ژنانی وەک کۆمەڵایەتی بوون، زاوزێ و فرەژنی، هێناوەتە گۆڕێ[١٤].

هەروەها ئەو لە رۆحی یاساکاندا بێ هیچ پێچو پەنایەک دەڵێ: ژن و پیاو لەوەدا لێک جیاوازن کە پیاوان توانایی بەڵگە هێنانەوەیان هەیە و لە بەرامبەریشدا ژنان توانایی فریودەرییانە یان هەیە و سروشت بوێری و رووهەڵماڵراویی سێکیسی داوە بە پیاوان و شەرمێونی و خۆڕاگریی بە ژنان بەخشیوە.[١٥]

هێلڤێتیوس Helvetius لە کتێبی "پیاو و پەروەردەدا De l, Homane et de l, education" باسێکی سەبارەت بە جیاوازیی نێوان پیاو و ژن هێناوەتە گۆڕێ کە جیاوازییەکی زۆری دەگەڵ باسەکەی مۆنتسکیۆ هەیە. ئەو دەڵێ: ئەگەر لە چەند بیاڤی جیاوازی ژیاندا لە ژنانی بەناوبانگ بڕوانین، بۆمان دەردەکەوێ کە ژنان بە شێوەی سروشتی هیچ پوانێکیان لە پیاوان کەمتر نییە. چونکە ئەوانیش توانایی بەڕێوە بردنی ئەم کارانەیان هەیە کە پیاوان دەیکەن. ئەو هەروەها لەسەر ئەم باوەڕەیە کە "ئەگەر ژنان بە گشتی ملکەچ و ژێر دەستەن لەبەر ئەوەیە کە ئەوان بێبەریکراون لە دەرفەتی فێربوونی زانست."[١٦] بە وتەی بارۆن دۆلباچ Baron d Holbach لە کتێبی سیستەمی کۆمەڵایەتیی خۆیدا (بەشی ژنان)، لەسەر ئەو باوەڕەیە کە یەکەمین ویستی بنەڕەتیی چاخی رۆشنگەری ئەوەبوو کە ژنان فێری زانست بن و ڕێگەی خۆێندنیان پێ بدرێ. ئەو دەڵێ کە: "لەو ڕێگەیەوە بوو کە ژنان لە هەموو ولاتاندا توانییان خۆیان پێ بگەیەنن". چونکە "وێدەچێ ئەم "دەست ڕانەگەیشتنەی ژنان بەخوێندن و فێربوونی زانست" هەوڵێک بوو کە سەدان ساڵ بوو بۆ ئەوە بەڕێوەبوو کە ژنان لە دۆخێکدا راگرن کە بکرێ لەوەها دۆخێکیدا بەرەڵلایی؛ راڕایی بوون و ئەقڵ کورتیی ژنان بسەلمێندرێ.[١٧] پەروەردە و راهێنانی ژنان بە شێوەی عەقڵ پەسند و بەجێ و ڕێ سەلمێنەری ئەوەیە کە ئەوان بیر لە کۆیلەکردنی جیهانی دەکەنەوە کە ژنان بابەتی سەرەکی ئەم پرۆسەیەن. لە ئێنسیکلۆپیدیای فەیلەسووفاندا encyclopedie of philosophers گەلێک وتار بەناوی "ژنان" یا دژ بەژنان نووسراون و سەبارەت بەپێکهاتەی زاتیی جیاواز و ملکەچ بوونیان وەک رەگەزی دووهەم زۆر باس کراوە[١٨].

بەسەرنجدان بەو شتانەی گوتران بەو دەرەنجامە دەگەین کە جان جاک رۆسۆ ئەوکاتەی مەسەلەی ژنانی تاوتوێ دەکرد نەک هەر لەتێڕوانینە چەقبەستووەکانی نەشۆرابۆوە بەڵکو شتی وای دەگوتن کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان دەگەڵ بیر و



بۆچوونەکانی پێشووی نەبوو. "ئەو دەگەڵ خاتو دوپین Mme Dupin لەکتێبێکدا گەلاڵەیەکی دارشت کە پەیوەندیی بە هەلومەرجی ژنانەوە لە کۆمەڵگەدا، هەبوو و لەڕاستیدا وەک هێرشێکی شۆڕشگێڕانە بۆ سەر پێگەی ژنان لەقەڵەم دەدرا."[١٩] رۆسۆ ساڵی ١٧٣٠ی ز واتە ئەو کاتەی لە چامبێری chambery دەژیا، دوو وتاری کورتی لەسەر ژنان نووسی کە دەری دەخا لە سەردەمی گەنجێتیدا ئەم باوەڕە توند و رادیکاڵانەی نەبووە کە لە سەردەمی پیریدا بەنیسبەت ژنان پێیان گەیشتبوو.[٢٠] دوایین هۆیەک کە هانمان دەدا تیۆرییەکەی جان جاک رۆسۆ تاوتوێ بکەین بیروڕا و تیۆرییەکەی ئەوە سەبارەت بە پەروەردە و راهێنانی ژنان و رۆڵی ئەوان لە کۆمەڵگەدا. بێگومان ئەوە تیۆرییەکی تراژیکە چونکە نەک هەر ئەو پەروەردە و راهێنانەی بۆ ژنانی داواکردووە تراژیدیای رەوەشی ژنانە، بەڵکو ئەو دوو شێوەیەی وەک میتۆدی ئایدیالی ئەزموونی مرۆییش بەکاری هێناوە؛ هەر میتۆدگەلێکی تراژیکین.

هەروەکی لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبەدا دەبینین. ئەو ئافرەتە کۆمەڵایەتییەی کە رۆسۆ پێیوایە مافەکانی بە فەرمی ناسیوە؛ بۆ ئەوەی لەم ڕێگەوە سەرێک بە بنەماڵەی تاک ژنی و کۆمەڵایەتیی ئایدیالدا بکا، ژنێکە؛ کە دەبێ لە رەوتی وەها بنەماڵەیەکدا بوونی خۆی وێران بکا. ئەو دوو ژنە دڵخواز و ئایدیالەی رۆسۆ لە زەینی خۆیدا وێنای کردوون؛ یەکێکیان جولی یە Julie لە هیلۆییزی نوێدا، ئەوی دیکەش سۆفی sophi لەکتێبی ئێمیلدا. هەر دووک بیر و بۆچوونەکەی ئەو، واتە شێوەی پەروەردە و راهێنان و میتۆدی رەفتار دەگەڵ ژنان لە پراکتیکدا؛ ئاکام و دەرەنجامێکی تراژیدی و ناتەواویان لێدەکەوێتەوە. هەست و تێگەیشتنی رۆسۆ لە دژوازیی نێوان بەئەمەگی و مرۆڤایەتیدا؛ ئەوی گەیاندە دەرەنجامێکی گەشبینانە سەبارەت بە چارەنووسی پیاو، لە بەرامبەر و هەروەها لە پەیوەندیی دەگەڵ ئەم چارەنووسەشدا؛ تەنیا روخساری ژنێکی وێناکردووە و جۆرەکانی دیکەی ئافرەتی تووشی چارەنووسێکی لەوە سامناکتر کردووە.

## بەشی شەشەم:

# جان جاك رۆسۆ و "رۆڵی سروشتی" ژن

ئەو باس و لێدوانانەی لەڕابردوودا لەسەر جیاوازی و هەڵاواردنەکان بەنیسبەت ڕەگەزی مێینە لەگۆڕێدا بوون و ڕۆڵی ئافرەتیان وەک ڕەگەزی پلە دوو، ملکەچ و نزمتر لە پیاو دەسنیشان دەکرد، هەموو لە ژێر ناوی "سروشتی بوون"ەوە دەهاتنە گۆڕێ و ئێستاشی دەگەڵ بێ لە زۆربەی کاتەکاندا ئەو باسگەلە هەروەک رابردوو درێژەیان هەیە. ئەو کەسانە لە بری ئەوەی کە بێن ئەو پوانگەلە نادادپەروەرانەیە لابەرن کە لە ڕێگەی بنیاتە کەلتووری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ چەوساندنەوەی ژنان بەڕێوە دەچن، هەروا سورن لەسەر کردە و ئاکارەکانی خۆیان و پێیان وایە هیچ هەڵەیەکیشی تێدانییە و هەروەها ڕاستەوخۆ خەسڵەتگەلێکی وەک پاسیڤی، بەستراوەیی، ساویلکەیی، نالۆژیکی و هەستەوەر دەدەنە پاڵ ژنان و ئیدعا دەکەن کە "سروشت" ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی پێداون[1]. جاک جاک ڕۆسۆش یەکێکە لەو کەسانەی کە پەسن و تاریفدانی "سروشت" تەواوی فەلسەفەکەی ئەوی تەنیوە. ئەو بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی لە بری باس و لێدوان لە میتۆدی پێوەریی مۆدێرن archetypal modern و هاوشێوە سازیی لە پلانێکی سەرەتایی کەڵک وەردەگرێ و بەمجۆرە ئێمەی هێنایە سەر ئەوەی کە بەوردی میتۆدەکەی ئەو تاوتوێ بکەین و روونی کەینەوە بۆچی و چۆناوچۆن ڕۆسۆ لەم میتۆدە کەڵک وەردەگرێ.

بەشی گرینگ و بنچینەیی بەرهەم و نووسراوەکانی ڕۆسۆ، بەگشتی؛ تەرخان کراوە بۆ بە خودایی کردنی deification "سروشت" و ئەو ڕۆڵەی لە پێکهاتەی جۆری (ڕەگەز)ی مرۆڤ و شێوەی ژیانی ئەودا دەیبینێ. ڕۆسۆ بڕوای بە ژیار (شارستانیەت) نەبوو و بە توندی دەیدایەبەر ڕەخنە. ئەوە لە حاڵێکدابوو کە کەسانی هاوچەرخی ئەو هەوڵیان دەدا وەک یاساکانی پێشکەوتنی مرۆیی بڕواننە



ژیار و بەڕاشکاوی تاریف و پەسنی بکەن. ئەو ناوەی جان جاک ڕۆسۆ لە نامیلکەکەی خۆیدا لەسەر چاوگە و بنەمای نایەکسانیی مرۆڤەکانی داناوە لە وتەکەی ئەرەستۆی وەرگرتووە کە دەڵێ: "بۆ ئەوەی بزانین چ شتێک سروشتییە واباشترە شتگەلێک تاوتوێ بکەین کە لە حاڵەتی سروشتی (ئاسایی) دان نەوەک ئەو شتانەی کە لە فۆرم و حاڵەتی سروشتی دەرچوون و گەندەڵ بوون." یەکێک لەو پرەنسیپە بنەڕەتییانەی کە لە نێو زۆربەی نووسراوەکانی ڕۆسۆدا بەدی دەکرێن پێداگری و جەخت کردنە لەسەر ئەو مەسەلەیە کە: "سروشت هەرگیز بەهەڵە ناچێ."[2] بۆ وێنە ئەم میتۆدە پەروەردەیی و ڕاهێنانەی ڕۆسۆ بە وردی بۆ "ئێمیل"ی داڕشت لەبەر ئەوە بوو کە لە جیهانی لێوڕێژ لە گەندەڵیدا مرۆڤێک لە "ئێمیل" ساز بکا. ئەو میتۆدە خێزانی ئێمیل واتە "سوفی"ش دەگرێتەوە کە ڕۆسۆ لە هەوڵی ئەوەدا بوو وەک "ژنێکی ئاسایی" ڕایبێنێ و پەروەردەی بکا. ئەو بۆ مەزنایەتی بەخشین بە پێگەی "سوفی" وەک ئافرەتێکی ئایدیال ئامۆژگاریی دەکا کە: "سەرەکیترین و بنەڕەتیترین ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکەین کە سروشت ویستوویەتی، چونکە ئێمە بەردەوام بەرەو ئەو شتانە دەکشێین کە مرۆڤەکان پێی دەڵێن یاساکان."[3] ئەو خاڵەی کە دەبێ سەرنجی بدرێتێ ئەوەیە کە ئەم میتۆدە پەروەردەیی و ڕاهێنانەی کە ڕۆسۆ بۆ ڕاهێنانی سوفی بەکاری دێنێ بەگشتی جیاوازییەکی زەقی هەیە دەگەڵ ئەم میتۆد و شێوازەی بۆ پەروەردە و ڕاهێنانی ئێمیل بەکاری دێنێ. بۆ تاوتوێ کردنی بیروباوەڕەکانی ڕۆسۆ پێویستە لە هۆیەکانی ئەم دوو میتۆد و کارپێکردنە جیاوازە تێبگەین و جیاوازی لە نێوان "پیاوی سروشتی" و "ژنی سروشتی" و ئەو ئامرازگەلە دابنێین کە ئەو بۆ دەربڕینی ئەو شتانە بەکاری هێناون.

### میتۆدەکانی ڕۆسۆ بۆ کارپێکردن

ڕۆسۆ بۆ لێک جیاکردنەوەی ئەو شتەی مرۆڤ لە سروشت وەریدەگرێ دەگەڵ ئەو شتانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانییەت وەدەستی دێنێ لە دوو میتۆدی بنەڕەتی کەڵک وەردەگرێ. یەکەم شێواز؛ جیاکردنەوەی ئەو شتەیە کە لە زات و جەوهەری مرۆڤدا هەن لەو شتەی لە ژینگەی وەرگرتووە. ڕۆسۆ

مەبەستی راستەقینەی ئێمیل لە پێشاندانی شێوەیەکی پەروەردە و فێرکردندا دەبینێ کە ئەو وێڕای دەمارگرژیی گشتی و ژینگەیی، فێری بووە و ئیدعادەکا کە ئەو شتەی وا سروشت لە زات و خۆێنی ئەودا گوڕاندوویەتی؛ ئەو پەروەردەی کردووە و گەشەی پێداوە بۆ ئەوەی ئێمیل لەو گەندەڵی و لاڕێیانە بگێڕێتەوە کە هەموو کۆمەڵگایان تەنیوە.

دووهەم متێود؛ شێوازێکە کە ئەم بۆ دۆزینەوەی "مرۆڤی سروشتی" بەپێی حاڵەتی "فطری" و "زاتی" بەکاری هێناوە. دیارە چەمکی "فطری" و "زاتی"چەمکێکە؛ کە زۆربەی فەیلەسووفەکان لە بەرهەمەکانیاندا بەکاریان هێناون و رایان وایە کە بەکارهێنانی ئەم چەمکانە بەواتای لابردنی (سڕینەوەی) رووداوە مێژوویی و کاریگەرییە کۆمەڵایەتی- سیاسییەکانە و لە زۆر جێدا بۆ درک و تێگەیشتن لە پێکچوونییەکانی پەیوەندیی سروشت و مرۆڤە. بۆ وێنە هێندێ لە فەیلەسووفەکان وەک جۆن لۆک چەمکی (فطری) "سروشتی" بۆ تاوتوێکردنی مرۆڤ لە دۆخی نایاساییدا بەکاردێنن، لە هێندی روانگەکاندا کە تێڕوانینی رۆسۆش لەخۆ دەگرن، رەوشی "فطری" و "سروشتی" دۆخێکە؛ کە دەگاتە لێک هەڵاواردنی میتۆدی پەروەردە و راهێنان، وەرگرتنی پوانگەلی ئیش و کار، دابەشکردنی کار، خاوەندارێتی تایبەت و یاسا و بنیاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان.

تیۆری دارێژەران و فەیلەسووفان بۆیە لە لێدوان و نووسراوەکانیاندا کەڵکیان لەو چەمکانە وەردەگرت؛ هەتا یاسا و میتۆدگەلێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییان لێ هەڵێنجن کە دەگەڵ ئەو توانا "فطری" و سروشتییانە یەک بگرنەوە وا لە زاتی مرۆڤدا شاراوەن. رۆسۆ لە نامیلکەی سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا؛ لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئێمە هەتاکو بەڕاستی لە ماهییەتی مرۆڤ تێنەگەین ناتوانین لە سەرچاوەی ئەو نایەکسانییانە بگەین کە لە نێو مرۆڤەکاندا هەیە. بۆ وێنە نابێ سەرنج بدەینە نارێکیی گلاوکۆس. گەلێک هۆکار لە مێژووی جڤاتەکاندا هەن کە فۆرمە سەرەتاییەکەی روخساری مرۆڤیان گۆڕیوە و ناشرینیان کردووە. "خوڵقانی مرۆڤ لە دیتنێکی سادەدا لە گلاوکۆس دەچێ کە تەپۆڵکەی لم و زیخ دەور و بەرییان داپۆشیوە. دەی دیارە کە بۆ تاوتوێکردنی بوونی راستەقینەی مرۆڤ؛ پێویستە ئەو لم و خۆڵ و خاکە لادەین



کە روخساری ئەویان داپۆشیوە. بۆ ئەوەی روخساری راستەقینە و جوانی ئەو بەو جۆرە ببینین کە خوڵقاوە و ئەوجار لە بنچینە و زاتی خوڵقانی ئەو وردبینەوە. هیچ کەس ناتوانێ بەبێ موتالا و تاوتوێکردنی جیددیی مرۆڤ و توانا سروشتییەکانی؛ لەو جیاوازییە سروشتییانە بگات کە لە نێو مرۆڤەکاندایە"[٤]. لەو پەیوەندییەدا رۆسۆ رەوشی سروشتیی جۆرە مرۆیەکی دۆزییەوە کە هیچ فەیلەسووفێکی بەر لەو ئیدعای نەدەکرد وەها شتێکی دۆزیوەتەوە. هەروەک گوترا[٥] باسەکەی رۆسۆ لەمەڕ سەرچاوەکانی نایەکسانی لە نێو مرۆڤەکاندا گریمانەیەکی سادە نییە لە "رەوشی سروشتی بەڵکو کۆمەڵێک قۆناغی لێک جیاوازە لە بنچینە کەلتوورییەکاندا بۆ وێنە رەوشێکی سروشتی کە رۆسو بۆ خۆێنەرەکانی خۆی شرۆڤەی دەکا بەمجۆرەیە: "ئەی مرۆڤ لەهەر وڵاتێکەوە هاتووی، هەر باوەڕێکت هەیە، گوێ بدەیە؛ ئەمە مێژووی تۆیە کە بۆتی دەخوێنمەوە، بەڵام ئەم مێژووە لەڕووی کتێبێ هاوڕەگەزەکانتەوە ناخوێنمەوە کە هەمووی درۆیە. بەڵکو لەڕووی کتێبی سروشتەوە بۆت دەیخوێنمەوە کە هەرگیز درۆ ناکات. هەرچی لە سروشت هەڵدەقوڵێ باشە، ئەو سەردەمەی من دەمهەوێ بۆتی وەگێڕم زەمانێکی دوور درێژە لەو شتە کە تۆ بووی و ئێستاکە گۆڕاوی. ئەو ژیانەی هاوڕەگەزەکەت کە من دەمهەوێ بە پێی ئەم چۆنایەتییانە شرۆڤەی بکەم کە بە تۆ گەیشتووە، ئەوەیە کە راهێنان و خووخدەی تۆ دەتوانن ئەم "چۆنایەتییانە" گەندەڵ بکەن، بەڵام قەت ناتوانن کاولیان بکەن. ئەم سەردەمە سەردەمێکە کە تۆ ئارەزووت بوو رەگەزی مرۆڤ تێیدا بمێنێتەوە. ئەم کێشە و ئازار و ژانانەی ئێستا بەرۆکیان گرتووی و لە داهاتوودا پتردەبن و تۆ لەوانەیە حەزت لێ بوایە بگەڕێیتەوە ئەو سەردەمە."[٦] لەو پەیوەندییەدا شتێکی زۆر گرینگ کە پێویستیی بە شرۆڤە هەیە؛ ئەوەیە کە ئەم قۆناغگەلەی مرۆڤی وەک ئاژەڵێکی تەنیا و تاقانە وێناکردووە و رۆسۆ پێی دەڵێ "رەوشی سروشتی،" قۆناغگەلێک نین کە ئەم حەزی لێیە کە هاوڕەگەزەکەی خۆی لەوێدا بمێنێتەوە؛ بەڵکو رۆسۆ دەیەوێ مرۆڤ بەرەو قۆناغگەلێکی جیاوازی گریمانەیی دیکە پەلکێش بکا بۆ دەربڕینی چۆنایەتییە جیاوازەکانی رەوشگەلی "سروشتی"، بە تایبەتی بەنیسبەت "ژنی سروشتی" و "رەوشی بنەماڵە".

## سەرچاوەی دۆخی سروشتی

لێرەدا دەمانەوێ وێنەیەک تاوتوێ بکەین کە رۆسۆ لە بەشی یەکەمی «سەبارەت بە سەرچاوەکانی نایەکسانی لە "دۆخی سروشتی» دا خستوویەتەڕوو. لەم وێنەیەدا ئەو دوو رەگەزی لە مرۆڤی سەرەتایی وێناکردووە کە بەتەنیا و بەجوێ* لەیەکتر ژیاون. بەگشتی ئەم دوو رەگەزە (ژن و پیاو) تەنیا ئەو کاتانەی بەرێکەوت تووشی یەکتردەبوون؛ ئەویش تەنیا و تەنیا بۆ دامرکاندنەوەی کوڵوکۆی حەزەسێکسییەکانیان، بۆ ماوەیەکی کورت لای یەکتر دەمانەوە. ئەوان لەو کاتانەدا هیچ هەستێکی هاوکارییان بەنیسبەت یەکترەوە نەبووە و بێ هیچ فیزلێدانێک بەسەر یەکتریدا، پاش رەحەت بوونیان (تەواوکردنی کردەی سێکس) هەرکام بەرەولایەک دڕۆیشتن و ئەگەر جارێکی دیکەش یەکتریان دیتبایەوە یەکتریان نەدەناسییەوە.

یەکەم پرسیارێکی کە لێرەدا دێتە گۆڕێ و جێی مشتومڕە ئەوەیە کە جووت بوونی (سێکس) سروشتی و وارسکەیی (غریزی) بەگشتی جیاوازە لەم جووت بوونەی کە عەشق و ئەزموونی دەگەڵە و لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا هەیە.(٧)

دیارە کە لە " دۆخی سروشتی" دا کردەی سێکس، حەزێکی ئاژەڵی بوو کە دەکرێ بەراوردی بکەی دەگەڵ برسێتی و تێنوێتی؛ حەز و وارسکەیەک بوو کە مانەوەی رەگەزی مرۆڤی گەرەنتی و دەستەبەر دەکرد و لەلایەن رەگەزی بەرامبەریشەوە زۆر بە ئاسانی گڕی حەزەکان دادەمرکایەوە. بەشی ماددیی کردەی سێکس کە دەکەوێتە بەرامبەر بەشە مەعنەوی و ئەخلاقییەکەی، لە راستیدا بە ئەزموونی مرۆڤی کێوی لە قەڵەم دەدرێ. لە روانگەی رۆسۆوە بەش دووهەم و توخمی ئەخلاقیی عەشق؛ هەستێکی دەستکرد و ساختەییە کە لە داب و نەریتی کۆمەڵگاکانەوە سەرچاوەی گرتووە و ژنان بە لێوەشاوەیی رێزیان لەم عەشقە دەگرت و پێیان هەڵدەگوت؛ لەبەر ئەوەی لەم رێگەیەوە بوو کە ئەوان دەیانتوانی بەسەر پیاواندا زاڵ بن و فیزیان بەسەردا لێدەن.(٨)

لە "دۆخی سروشتی" دا هیچ کەس لەبەرامبەر ئەوی دیکەدا هەست بە بەرپرسیارەتی و ناسین و هاوکاری ناکا. لەم دۆخەدا رەگەزی مێینە بەکردەوە؛

* جوێ: جودا لەیەک



لەبەر وارسکە و حەزی دایکایەتی. سەرپەرشتیاری منداڵە وردەکانێتی و هەر ئەوەندی منداڵەکانی توانییان لە سەر پێی خۆیان راوەستن و بەڕەی خۆیان لە ئاو دەرکێشن بەجێیان دەهێڵێ و بەجۆرێک کە ئەگەر بە رێکەوتیش تووشیان هات نایانناسێتەوە. رۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕەیە کە سروشت ئافرەتی زۆرباش بۆ شیردان بەمنداڵ، چێشت لێنان و بەخۆی و بەمنداڵ راگەیشتن تەیارکردووە. ئەم ئەرک و بەرپرسیارەتییانە کە لەسەر ئەستۆی ژنە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو بەشێنەیی هەنگاو بنێ، چونکە هەرکام لەو ئەرکە وارسکەییانە کۆسپێکن لە بەردەم گەشەو پێشکەوتنی ژندا. لەبەرامبەردا پیاو هیچکام لەم بەرپرسیارەتییانەی لەسەرشان نییە و بۆیەش دەتوانێ بەخێرایی هەنگاوبنێ. جۆن لۆک بە "رەخنەی بەجێ و رێی" خۆی بەتوندی دژبەری ئەم بۆچوونەی رۆسۆ دەبوو کە دەیگوت: "مرۆڤی سروشتی" بەردەوام لە تەنیاییدا ژیاوە. ئەو باوەڕی وابوو کە زەماوەندی ژن و پیاو نەک هەر بۆ بەردەوامی و مانەوەی رەچەڵەکی مرۆڤ پێویست بووە بەڵکو ئەوی لە تەنیاییش رزگار کردووە. بەو پێیە؛ "دۆخی سروشتی" بەپێچەوانەی بیروڕای رۆسۆ بە شێوەی لۆژیکی و بەڵگەمەند هیچ کات دژی بنەماڵە نەبووە کە وەک دەزگایەکی بەهێز لە کۆمەڵگادا هەبێ.(٩) لێرەدا بێ ئەوەی بچینە نێو وردەکارییەکانی باس و گەنکەشەی جۆن لۆک و رۆسۆ، پێویستە بچینە سەر هێندێ تەوەری گرینگ کە نیشاندەری دژوازی و ناتەبایی باوەڕەکانی رۆسۆن لەسەر "دۆخی سروشتیی" بنەماڵە.

یەکەم: رۆسۆ پێیوایە لە هاوژینییە (همزیستی) سەرەتاییەکاندا کە لە "دۆخی سروشتی" دا پێک دەهات ژنان پەیتا پەیتا زگیان نەدەکرد و وێناچێ ژنان بێجگە لەو منداڵەی دەگەڵیان بووە دڵیان بەلای ئەوانی دیکەوە بووبێ بەواتایەکی دیکە دایکان لە "دۆخی سروشتیی" سەردەمە سەرەتاییەکاندا تەنیا منداڵێکیان بەخێو کردووە و ئاگایان لێی بووە، هەر بۆیەش ئەوان بەبێ یارمەتیی پیاوانیش توانیویانە پارێزگاری لە خۆیان بکەن.

دووهەم؛ لە "دۆخی سروشتی" دا ژن و مێرد پاش کردەی سێکس لێک دادەبڕان و هیچ پیاوێک نەیدەتوانی ئەو ژنە بناسێتەوە وا دەگەڵی جووت بووە و

منداڵی لێی هەیە. هەربۆیەش هیچ بیانوویەکی لۆژیکی لە گۆڕێدا نەبووە کە پیاو ناچار بکا بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەی یارمەتیی ژنەکەی بدا.

سێهەم؛ رۆسۆ نەک هەر رەخنەی هەبوو لە بۆچوونی لۆک سەبارەت بە بوونی بنەماڵەی سروشتی بەڵکو ئەوەی بەمیتۆدێکی تێکدەر دەزانی و بە توندی هێرشی دەکردەسەری؛ لەبەر ئەوەی کە جۆن لۆک سەبارەت بەبوونی بنەماڵەی سروشتی، بڕوای بە "دەرووەست بوونی ئەخلاقیی" هەبوو. ئەو باوەڕی وابوو کە بوونەوەرێک بەناوی پیاو پشتیوان و ورەبەخشی رۆح و جەستەی ژنە و پارێزەرێتی" و لە بنەماڵەیەکی سروشتی دا "مانەوەی پیاو لە لای ژن هەتا ئەو کاتەی منداڵەکان بتوانن ئاگایان لە خۆیان بێ "دەرووەست بوون و کردەیەکی ئەخلاقییە" بۆ پیاوان."[١٠]

جان جاک رۆسۆ لەو باوەڕە ئەخلاقییانە ناڕازییە و دەڵێ: "هۆکارە ئەخلاقییەکان هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر بابەتە ماددییەکان نییە و بوونی راستەقینەی شتەکان ناسەلمێنن".[١١] لە قسەکانی دوایی رۆسۆ وا دەردەکەوێ کە ئەو خۆی دەسنیشانی دەکرد کە چ شتێک بەکەڵکە چ شتێک بۆ تەکووزی (نظم) سروشتی پێویستە. هەر بۆیەش ئەو لە درێژەی باسەکەیدا بە جۆن لۆک دەڵێ: ئەو بەڵگانەی لۆک دەیانهێنێتەوە و من لەوە پێش باسم کردوون- ئەگەرچی لەوانەیە پوانێک بێ بۆ رەگەزی مرۆڤ، بەڵام ئەم ژیانە لەبەر ئەوە نییە کە بمانهەوێ بە سروشتەوە بیبەستینەوە؛ مەگەر ئەوەی کە پێمان وابێ کۆمەڵگا شارستانییەکان، هونەرەکان، بازرگانی و هەرچی بۆ مرۆڤ بەقازانج دەزانرێ، سروشت خوڵقاندوونی.[١٢] هەروەکی دەبینین وەڵامی رۆسۆ بەلۆک تیۆریی "دۆخی سروشتی" کە مرۆڤ بەپێی ئەو شکلی گرتووە لەرزۆک دەکا. لە تێوریی "دۆخی سەرەتایی سروشتی" رۆسۆدا کردەی سێکس بە عەشق و خۆشەویستییەوە ناکرێ، بەڵکو ئەوە وارسکەیە کە لە کەسانی بالق (پێگەیشتوو) دا بۆ دامرکاندنەوەی حەزەسێکسییەکان بەبێ سەرەوبەرەیی دەکەونەکار. هەروەها لە پەیوەندی دەگەڵ ئەو کاروبارەی نیشاندەری بەستراوەیی رەگەزێکە بە رەگەزێکی دیکەوە وەک (سێکس، زەماوەندکردن و بنەماڵە) وارسکە سروشتییەکان بە شێوەی یەکسان لە مرۆڤەکاندا هەن. رۆسۆ لە "ئێمیل" دا دەڵێ:



"ئەو راستییە لە سروشتدا هەیە کە یەکسانی؛ لە نێوناچێ و تا ئەو دەمەی جیاوازییەک نییە لە نێوان مرۆڤێک و یەکی دیکەدا هەر دووکیان سەربەخۆن و هەر ئەم بەڵگەیەش بەسە بۆ سەلماندنی سەربەخۆبوونی یەکێکیان لەوی دیکە.[١٣]

خاڵێکی گرینگ کە سەبارەت بە یەکسانی دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە کە چەمک و واتای یەکسانیی مرۆڤەکان لە روانگەی جان جاک رۆسۆوە یەکسانیی نێوان پیاوانە و ژنان کە لەڕاستیدا نیوەی کۆمەڵن؛ بەگشتی لەو رێسایە دەرهاوێژراون. "ژنی سروشتی" لەوشتانە جوێیە. ئەو بە بوونەوەرێک زانراوە کە تەنیا لە دەستی دێ بژیوی خۆی و منداڵەکەی دابین بکات و ئەوەش باسەکەی لە رۆسۆ دژوارتر کردووە، چونکە سەرەڕای خستنەڕووی مەسەلەی ژنان ئیدعای ئەوەی کردووە کە ژن بێجگە لە یەکسانی هەموو شتێکی هەیە."[١٤] بیر و باوەڕەکانی رۆسۆ سەبارەت بە "دۆخی سروشتیی سەرەتایی" بۆ وەرگرتن و قبووڵکردن نابن چونکی ئەگەر یەکێک لە گرینگترین مەسەلەکان بۆ رۆسۆ ئازادی و سەربەخۆیی نەبوایە؛ لانیکەم وەک بەهایەک وابوون و ئەو، ئەم سیفەت و تایبەتمەندییانەی لە سەردەمی دۆخی سەرەتایی و کۆمەڵگای سەرەتاییدا بەدی دەکرد و هەروەک لە لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نابەرابەرییەکاندا دەڵێ: "بەڕاستی حەزم لێیە یەکێک بۆم روون بکاتەوە کە چ چارەڕەشی و نەگبەتییەک لەوانەیە بەرۆکی دۆخی سروشتی سەرەتایی گرتبێ، لە حاڵێکدا خەڵک لە ئازادی و هێمنیدا دڵیان لێیدەدا و لەش و جەستەیان لە سلامەتی و تەندروستیدا گەشەی دەکرد."[١٥]

## مرۆڤی سروشتی

رۆسۆ بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی خۆی کەپێی وا بوو مرۆڤ هەر بە شێوەی سروشتی باش خوڵقاوە"[١٦] دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی و بۆ رابردوو. ئەو لە کتێبی لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا دەڵێ: ئەوکاتە دژبەری و ئێرەیی بردن و شەڕەکان هەڵاییسان کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان بەرەو رێکۆپێکی رۆیشت و بەشوێن ئەودا بنەماڵە و خاوەندارێتی تایبەت دامەزران لەبەرامبەردا، قازانج و باشییەکەی دۆخی سەرەتایی و

سروشتیی مرۆڤ لەو جێیەوە سەرچاوە دەگرێ کە کەس پێویستی بەکەس نییە خۆی دەگەڵ ئەوی دیکە بەراورد بکا و هەر بۆیەش هیچ ترس و نیگەرانییەکی نییە لەوەی کە لەوانەیە ئەو زیانی پێ بگەیەنێ. بۆ وێنە: رۆسۆ باوەڕی وابوو. کە ئەم رووداوانەی بوونە هۆی دوورکەوتنەوەی دۆخی سروشتیی رەگەزی مرۆڤ لە گۆمەڵگای شارستانی پەیوەندییان بە خاوەندارێتیی تایبەتی زەوی، دابەشکردنی کار لە نێوان جووتیاران و پیشەسازان، بەکۆیلە کردن و چەوساندنەوەی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤەوە هەبوو و ئەوانەی بە هۆکاری سەرهەڵدان و گەشەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان دەزانی. پێویستە ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە ئەو قۆناغەی رۆسۆ لە گریمانەی مێژوویی مرۆڤدا دەیخاتەڕوو قۆناغێکە؛ کە سەردەمێکی زۆر دوور و درێژ لە خۆ دەگرێ. ئەم قۆناغەی رۆسۆ ناوی لێناوە "سەردەمی زێڕین" ی بنەماڵە و باوکمەزنی، قۆناغێکە لە نێوان سەردەمی" دۆخی سەرەتایی سروشتی مرۆڤ" و سەردەمی "نایەکسانی" راکە بەرهەمی دابەشکردنی کارە. رۆسۆ لە لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا بەڕاشکاوی دەکەوێتە تاریفکردن و پەسنی دۆخی باوک مەزنی و پتەوی و تۆکمەیی بنەماڵە و بە ئاواتە وەها دۆخێک لە "ئێمیل" و هێلۆییزی نوێدا پێک بێنێ. بۆ وێنە ئەم (رۆسۆ) رەوشی ئایدیالی خەڵکی کێونشینی سوویسرا؛ کە خاوەنی ژیانێکی گوندی و باوک مەزنین بەیەکێک لە باشترین نموونەکانی شێوەی ژیانی مرۆڤ لەقەڵەم داوە و بە "گرینگترین واقعیەتی جیهان" ناوی بردووە.[17]

لۆ ڤێژۆی لەم پەیوەندییەدا باوەڕی وایە کە "مرۆڤی بەختیار بەلای رۆسۆوە کەسێکە کە لە "دۆخی سەرەتایی سروشتی" دووربێ و دابڕابێ؛ بەلام زۆریش دوور نەبێ."[18] بەهەرحاڵ روونە کە ئەوەی بۆ چوونە نێو تیوریی "پتەویی بنەماڵە"ی رۆسۆ پێویستە؛ خێرایی بزووتنە لە خاڵی بێ نیازییەوە بۆ خاڵی پێویست، کە ئەویش بە شێوەیەکی سەرنجراکێش دەبێ زیاتر ژنان بگرێتەوە. رۆسۆ بێ هیچ پێشەکییەک و ئەویش لەیەک رستەی بێ شیکردنەوەدا ئاماژە بۆ یەکەمین شۆڕش دەکا. بەڕای ئەو؛ هاوژینییە سەرەتاییەکان کە لە فۆرمی پتەوی بنەماڵەی تاکژنی دایە؛ دەگەڵ "جۆرێک خاوەندارێتی"ی کەرەسە و کۆخە



سەرەتاییەکان دەست پێدەکا. ئەو هەروەها لە درێژەی وتارەکەیدا کە لەسەر جۆرە خاوندارێتییەک؛ کتوپڕ وبێ پێشەکی باس لە دابەشکردنی کار لە نێو ژن و پیاودا دەکا و لە "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا؛ دەڵێ: "با ژنان زیاتر خانەنشین بن؛ لەبەر ئەوەی ئێنتما و گرۆییان بە ماڵدارێتی و منداڵ بەخێوکردن هەیە و پیاوانیش دەبێ بۆ ودەست هێنانی بژیو لە ماڵێ بچنە دەر."[19] ئەوە لە حاڵێکدایە کە رۆسۆ پێشتر شێوەی ژیانی ئەم دووڕەگەزەی بە یەکسان زانیبوو. ئەو شێوە کاردابەشکردنەی رۆسۆ ئاماژەی پێدەکا بەومانایەیە کە ژنان؛ کە پێکهێنەری نیوەی مرۆڤ (کۆمەڵ)ن؛ ئیدی ناتوانن وەک رەوشە سەرەتاییە سروشتییەکەیان؛ یەکسان و ئازاد و بێ نیاز بژیین. لە مەودوا تەفسیر و پاساوەکانی رۆسۆ بۆ داکۆکی کردن لە نایەکسانییەکان دەست پێدەکا، چونکە بەڕای ئەو بنەماڵە دەبێتە کۆمەڵگایەکی بچووک کە پێویستە یەکگرتووبن.[20] و لە لایەکی دیکەوە پیاو بە توخمی یەکیەتی لە قەڵەم دەدرێ و ئەو بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دەسنیشان دەکا. ئەو جار رۆسۆ سەرنجی خوێنەر بەرەو خاوەندارێتی[21] رادەکێشێ و دەڵێ: "کالا و کەلوپەلەکان لە دەست پیاودان بۆ ئەوەی بەستراوەیی منداڵان بە باوکەوە؛ بپارێزرێ و باوک دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ کە ئەگەر ئەوان بەگوێ و شیاوبن ئەو بەشێک لە کالا و کەلوپەلەکانیان بەمیرات پێ بدا."[22]

بەلام لەو نێوەدا رەوشی ژنان جیاوازە. بەواتایەکی دیکە لەوکاتەوە کالا و ئامرازە بەرهەمهێنەرەکان کەوتنە دەستی پیاو، کاری بە کەڵکی ژنان پشتگوێ خرا تا ئەو جێیەی رەوشی ئەوان بەگشتی لە هی مێرد و منداڵەکانیان جیاواز کەوت. هەروەک دواتر دەبینین یەکگرتوویی بنەماڵەی باوک مەزنی و بەستراوەیی ژن لە باری ئابوورییەوە بە پیاو؛ بەشێک لە تایبەتمەندییەکانی "چاخی زێڕینن" و لە نووسراوەکانی دیکەی رۆسۆدا بەردەوام جەخت لەسەر ئەم تایبەتمەندییانە کراوەتەوە. خاڵێکی گرینگی دیکەی کە دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە کە رۆسۆ لە "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا" ئەو گریمانەی باوک مەزنیەی وەک نایەکسانیی نێوان دوو مرۆڤی پێگەیشتوو (خۆناسیووبالق) دەی هێنێتە گۆڕێ، نایەکسانیی نێوان دوو پیاو پێکەوەیە. ئەگەر لە بنەماڵەدا باوک

مەزنی هەیە بەومانایەیە کە باوک دەسەڵاتی بەسەر کورەکانیدا هەیە و ژنان بێ ئەملا و ئەولا بەکاڵای پیاوان دەژمێردرێن و بوونەوەر گەلێکن کە دەبێ ملکەچی حەزو ویستە سێکسییەکانی پیاوبن.[23] ئەم رەوشە هەتا دووهەمین شۆڕشی مەزن درێژەی کێشا کە رۆسۆ پێی وابوو خاوەندارێتی زەوی و دابەشینی کار بەتەواوەتی لە نێو پیاواندا بەڕێوە چووە. ئەو وێڕای تیۆریی باوک مەزنیی سروشتیی بنەماڵە کە لە کۆمەڵگایەکی ئایدیالدا هەیە؛ سەرنجی خوێنەر بەرەو نەژاد و رەچەڵەکی مرۆڤ لەم سەردەمەدا رادەکێشێ. بەو جۆرە کە مرۆڤێک (پیاو) پێویستی بە یارمەتیی یەکێکی دیکە هەبوو (چەوساندنەوەی سەرەتایی) و پیاوان بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر یاساگەلێک دابنرێن و... ناچار یەکسانی دەبوو لابچێ و خاوەندارێتی بپارێزرێ. بەمجۆرە کار (کە پێویستی بە کرێکارە) بووبە بەشتێکی زۆر پێویست و لێرەوار و دارستانەکان کران بە زەوی و زاری جووتیاران کە دەبوایە بە دەست ئاو بدرێن.[24]

## تۆکمەیی بنەماڵە

جان جاک رۆسۆ لە تەواوی نووسراوەکانی خۆیدا وەک دەزگا و بنیاتێکی سروشتیی تاک ژنی باس لە توکمەیی بنەماڵە دەکا کە لەلایەن خوداوە بۆ رەگەزی مرۆڤ دانراوە. ئەو لە سەرەتای کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا [25] دەڵێ: "بنەماڵە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا کۆنترین بنیاتی سروشتییە و لە کتێبی ئێمیلدا بەو جۆرە باس لە "پیاو لە دۆخی سەرەتایی" دا دەکا، کە "سروشت وای بۆ ئەو (ئێمیل) داناوە کە بە ژنێک [سوفی] قایل بێ" (تاک ژنی) و سروشت ئەم دیمانەی ئەوان بەرەو چوارچێوە و کۆتوبەندێکی ئەخلاقی واتە زەماوەندکردن رێنوێنی دەکات". لەم زەماوەندەدا؛ "ئەوە پیاوە کە ژن هەڵدەبژێرێ و هەروەها ئافرەتە کە دەبێ خۆی دەبەر دەستی ئەو بنێ و روو لە کەسانی دیکە وەرگێڕێ".[26] جان جاک رۆسۆ کە بەتوندی ئەم بۆچوونەی جۆن لۆکی رەددەکردەوە کە "مانەوەی پیاوی لەلای ژن و منداڵ وەک دەروەستییەکی ئەخلاقی بە پێویست دەزانێ". ئێستاکە لە دژوازییەکی سەرسوڕهێنەردا دەڵێ: "منداڵان بۆ ماوەیەکی زۆر



پێویستیان بەدایکیانە و دایکیش بەبێ یارمەتی و چاودێریی باوک؛ ئەستەمە بتوانێ پێداویستییەکانی خۆی دابین بکا."[27]

وێڕای ئەوەش رۆسۆ باوەڕی بە بنەماڵەی تاک هاوسەریی پیاو مەزنی هەیە و ئەوەش بە دیاریکراو و پێدراوی سروشت دەزانێ کە بە مرۆڤی بەخشیوە. ئەو ئێمیل ئامۆژگاری دەکا: "هەر شێوەی باوک مەزنییە کە بە شێوەیەکی سروشتی و لە ئاشتی و هێمنیدا ژیانی سەرەکیی مرۆڤ دەستەبەربکا و ئەم جۆرە ژیانەش چێژ بە کەسێک دەبەخشن کە دڵی گەندەڵ و کرمۆڵ نەبووبێ،"[28] و لە لهەمان کاتدا ئامۆژگاری سوفی دەکا کە: "هەرکات بوویە خێزانی ئێمیل ئەو نەک هەر مێرد، بەڵکو خاوەنی (ئاغای) تۆیە و ئەوەش ویستی سروشتە کە دەبێ ملکەچی بیت."[29] لە کتێبی باس لەسەر مەسەلە ئابوورییەکاندا Discourse on political Economy و لە تاوتوێکردنی پەیمانە کۆمەڵایەتییەکاندا نووسیوێتی رۆسۆ سێ هۆکاری بۆ پێویست بوونی رۆڵی زاڵ و بەزیپکوزاکوونیی پیاو لە بنەماڵەدا هێناوەتەوە:

١- هەر کەسێک (پیاو) لە کاتی ناتەبایی و دژبەرێتیدا وەک یەکەمین دەسەڵات دەبێ قسەی ئاخر ئەو بیکا و دوایین بڕیار ئەو بیدا.

٢- ژن هێندێ جار لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیدا بێتوانا و ناتەواوە و دەروەست نایە؛ بۆیە کەسێکی بە توانا (پیاو) دەبێ کارەکان راپەڕێنێ.

٣- پیاو مافی ئەوەی هەیە کە بزانێ، ئەو منداڵانەی ژنەکەی بوویەتی و بەخێویان دەکا بۆ ئەوون[30]؛ مەسەلەیەکی کە بەردەوام مافی زاڵێتی و دەسترۆیشتویی پیاو بەسەر ژندا مسۆگەر دەکا. بەپێی ئەم رێسایەی رۆسۆ واتە "دڵنیایی پیاو لەوەی باوکی راستەقینەی منداڵەکانە" بێ ئەملا و ئەولا مافی دەسەڵاتی پیاو بەسەرژندا، دەستەبەردەکا و رۆسۆ لەو پەیوەندییەدا ئیدعا دەکا کە "بەرپرسیارەتی و ئەرکی پیاو و ژن یەکسان نین و ناشبن. ژن تەواو لە هەڵەدایە ئەگەر سکاڵاو گازندە بکا لە نایەکسانیی زاڵمانەی پیاو بە نیسبەت خۆی، چونکە پیاو ئەم نایەکسانیەی نەخوڵقاندووە [بەڵکو کاری سروشتە] هەروەها بەپێی عەقڵ و [شەرع] ئەم نایەکسانییە بۆ ژن شتێکی خراپ نییە چونکە یەکێک لە رەگەزەکان کە سروشت منداڵەکەی بەو [پیاو] ئەسپاردووە

دەبێ وەڵامدەربێ."[٣١] بە واتایەکی روونتر پیاو بەپێی یاسای سروشت ژن ئاوس دەکا و ئەم مافە بۆ ئەو پارێزراوە کە وەکو مێرد چاوی بەسەرە هاوسەرکەیەوە بێ کە لەکەسی دیکە منداڵی نەبێ.

رۆسۆ ئەمجارە لە "نامە بۆ دالامێر" Letterto dalembert دا دەنووسێ: ئەگەر هەموو ئەرکە تاقەت پرووکێنەکان لەسەرشانی ژنان لەبەر ئەم حەقیقەتەیە کە منداڵ دەبێ باوکی هەبێ" [دیاربێ کێ باوکێتی][٣٢] چۆن دەکرێ یاسایەکی ئەخلاقیی هاوشێوە بۆ ژن و پیاو داوا کرابێ؟ لە حاڵێکدا پێویستە ژنان داوێن پاکی و ئابڕووی خۆیان بپارێزن، بەڵام ئەوە بۆ پیاوان پێویست نییە. ئەو مێردە بێوەفایەی پەیوەندیی سێکسی دەگەڵ کەسانی دیکەدا هەیە بە دڵنیاییەوە زۆر بێبەزەییانە و زاڵمانە دەگەڵ ژنەکەی خۆیدا دەجووڵێتەوە و هەڵسوکەوت دەکات، بەڵام ژنێک کە "زیناح" دەکاو خۆی دەخاتە دۆخێکەوە کە لە پیاوێکی دیکەی جیا لە مێردەکەی خۆی منداڵی بێ. بەدڵنیایی. بە خەیانەتکار و سپڵە لە قەڵەم دەدرێت و دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی بنەماڵە و پەیوەندییە سروشتییەکانی ژنان لە بەریەک دەبا[٣٣]. دیارە کە گرنگترین هۆیەک کە رۆسۆی هێنایە سەر ئەوەی پەروەردە و بنەما ئەخلاقییەکانی ژنان لە پیاوان جوێ بکاتەوە ئەوە بوو کە پیاوان پێویستە دڵنیابن لەوەی کە منداڵەکانیان لە خۆیانن و لە تووی کەسی دیکەنین.*

## حەزە سێکسییەکان

لێرەدا پێویستە بگەڕێینەوە سەر بیروباوەڕەکانی رۆسۆ سەبارەت بە حەزە سێکسییەکان بۆ ئەوەی باشتر بتوانین لەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانە تێبگەین کە ئەو بۆ "ژنی سروشتی" لەبەر چاوی گرتوون. جان جاک رۆسۆ لە کتێبی ئێمیلدا بۆ پەروەردەکردنی سوفی وەبیر دێنێتەوە کە لە تەواوی ئەو بەشانەدا وا پەیوەندیی بە تایبەتمەندی و خەسڵەتە سێکسییەکانەوە نییە ژن وەک پیاو وایە؛

* لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٨ دا گەندەڵی ئەخلاقی لە بنەماڵەی ئەریستوکراتەکانی فەرەنسادا لەوپەڕی خۆی دابوو. لەوکاتدا ژنان بەدەگمەن رێدەکەوت ئەرکی ژن و مێردایەتی و وەفاداریی خۆیان بەمێردەکانیان بەجێ بێنن (وەرگێڕی فارسی).



واتە ژن خاوەنی ئەم لەش و ئەندامانەیە کە پیاو هەیەتی ئەو خاوەنی ئەم توانایی و پێویستییانەیە کە پیاو هەیەتی." رۆسۆ لە درێژەی وتارەکەیدا بە هێمنی و لەسەرخۆیی دەڵێ کە: "بەڵام لەو شوێنانە کە باس لە تایبەتمەندی و خەسڵەتە سێکسییەکانی ژن و پیاو دێتە گۆڕێ، ئەوان وێڕای ئەوەی کە تەواوکەری یەکن، لە هەموو شتێک لێک جیاوازن و بەراوردکردنیان پێکەوە ئەستەمە، چونکە ئەو شتەی لە زاتی ژن دایە جیاوازە دەگەڵ ئەو شتەی لەزاتی پیاودایە[٣٤] و تواناییەکانی رەگەزی نێر و مێو لێک جیاوازن.

ئەوەی لەم وتارەدا بە جوانی دیارە و زەین و مێشکی رۆسۆی تەواو بە خۆیەوە خەریک کردووە مەسەلەی ژنە لە باری تایبەتمەندییە جەستەییەکەیەوە. رۆسۆ لەم پەیوەندییەدا؛ لە چەند رستەی کورتدا دەڵێ: "لە تەواوی ئەو شتانەدا کە پەیوەندیی بە رەگەزەوە نییە ژن وەک پیاو وایە"و بەو دەرەنجامە دەگا کە: ژن و پیاوی کامڵ ئەگەرچی لە روخساردا لێک ناچن، بەڵام لەباری فیکرییەوە وەک یەکن". کاتێک رۆسۆ سەبارەت بە رۆڵی ژن و ئەرکە سێکسییەکانی و ئەرکی دایکایەتییەکەی لە بنەماڵەی باوک مەزندا؛ قسە دەکا لەسەر ئەم باوەڕەیە کە کەسایەتی و ئاکاری ژن لە ئاکار و کردەی سێکس و ئەرکەکانییەوە سەرچاوە دەگرن و لەڕاستیدا دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی ئەم ئاکار و ئەرکانە پەروەردە بکرێ. پێویستە بزانین چۆنە وا بیروبۆچوونی رۆسۆ لەسەر حەزە سێکسییەکان تووشی گۆڕان بووە. ئەو لە لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا دەڵێ: حەز و ویستەسێکسییەکان، کردەیەکی وارسکەیی و چالاکییەکی پێویستن و بەپێی ئەم کەفوکوڵ و خرۆشانانە دەکرێن کە بە ئازادی لە نێو ژن و پیاودا بەڕێوەدەچن، بەڵام دواتر لەم باوەڕە پاشەگەز دەبێتەوە و دەڵێ: کردەی سێکس ئاکارێکە؛ کە دەبێتە هۆی ئەوەی پیاو رۆڵی هێرشبەر و ژن رۆڵی بەرگریکەر ببینێ. ئەم پێداچوونەوەیە بە راو بۆچوونەکاندا سەبارەت بە حەزە سێکسییەکان لە فۆرمە کۆمەڵایەتییەکەیدا بووە هۆی ئەوەی کە رۆسۆ لە دوو روانگەی دژوازەوە خەسڵەتگەلێکی وەک شەرم و حەیا و بێ ورەیی و بێ هێزی بۆ ژنان وێنا بکا و فێری "سوفی"یان بکا. رۆسۆ قەت نکوڵی ناکا لەوەی کە ژنان و پیاوان پێداویستی و حەزی سێکسیی وەک یەکیان هەیە. ئەو

لە یەکەم پێداچوونەوەکەیدا سەبارەت بە حەزە سێکسییەکان دەڵێ کە پیاو ئەوکاتە هەستە سێکسییەکانی دەورووژێن و چێژ وەردەگرێ کە ژن خۆی بۆ ئەم برازێنێتەوە و بەناز و خۆنواندن و بە لەنجە و لار و خۆ بەدەستەوە نەدان و خۆبواردن لە کردەی سێکس؛ تاسەی پیاو ببزوێنی و لە داوی بخا. بەواتایەکی دیکە روانگەی رۆسۆ لەسەر ئەویندارییی دوولایەنە، ئازاد، یەکسان و (غیرارادی)ی کۆمەڵگای سەرەتایی سروشتی- کە لە "نامەبۆدالامبر"دا رەنگی دابۆوە- بەگشتی دەگۆردرێ و دەبێتە ئەم رەوانگەیەی کە؛ ورووژان و بزووتنی هەستی سێکسیی پیاو پەیرەوی ئاکار و کردەی سێکسیی ژنە. ئەگەر ژن پێش بە ویستە دەروونییە (شهوانی)کانی و حەزە سێکسییەکانی نەگرێ یا لانی کەم لە بەرامبەر ویستە سێکسییەکانی پیاودا بەربەرەکانی نەکا، ئیدی "شەهوەت و گڕی دەروونیی پیاو دادمرکێ و هەرگیز هەستە سێکسییەکانی ناورووژێن و نابزوێن"[٣٥]. هەروەها بێجگە لە سەرکوتی حەزە سێکسییەکانی پیاو ئەم راستییەش لە گۆڕێدایە کە "داوێن پاکی و شەرم و حەیای ژنان هەستی سێکسیی پیاوان دەورووژێنێ". چونکە هێزی سروشتیی پیاو بۆ ورووژاندن و بزواندنی هەستی سێکسی لاوازە" بەواتایەکی دی، رۆسۆ لەو شتانە بەو دەرەنجامە دەگا کە هیچ پێویست ناکا پیاو هەستی سێکسیی ژن دامرکێنێتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە "ژن بە تایبەت بۆ دامرکاندنەوەی کوڵ و کۆی سێکسیی پیاو خولقاوە" و باشترین شێوەی ورووژاندن و دامرکاندنەوەی ئەو هەست و حەزەی پیاو ئەوەیە کە ژن بە هونەری داوێن پاکی لەبەرامبەر ویستەکانی پیاودا راوەستێ.

رۆسۆ وێڕای تیۆریی حەزە سێکسییەکان کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن لە لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکان"دا رەدی دەکاتەوە و وارسکەیی و سروشتیی بوونی حەزە سێکسییەکان بەگریمانەیەکی سەلمێنراو دادەنێ و لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: "ئەوە یاسای سروشتە کە پێشینەیەکی دوور و درێژتری هەیە لە ئەویننداری و [حەزە سێکسییەکان] بەرهەمی هاوکێشە کۆمەڵایەتی و گۆڕانە کەلتوورییەکان نین"[٣٦]. بەڵام وێڕای ئەوەی کە حەزە سێکسییەکانی مرۆڤ بەشتێکی سروشتی و سەلمێنراو زانراوە، رۆسۆ لە ئێمیلدا



ئاماژە بە گەلێک شت دەکا کە بە تەواوەتی دەگەڵ ئەم روانگەیە ناتەبان. بەپێی بۆچوونێکی رۆسۆ کە تەواو دژوازە دەگەڵ بۆچوونەکەی پێشووی؛ هێزی هەستە سێکسییەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی سامناک بێ سنوورن. ئەو باوەڕی وایە کە خودا "شەهوەتێکی بێ سنووری" داوە بەژن و پیاو و لە هەمانکاتدا بۆ دامرکاندنەوەی ئاگری شەهوەتی پیاو؛ عەقڵی پێداوە و شەرم و حەیای بە ژنان بەخشیوە.[٣٧] رۆسۆ لێرەدا خۆڕاگریی ژنان و بەربەرەکانێی ئەوانی لە بەرامبەر ویستە سێکسییەکانی پیاواندا بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانیان بە شتێکی زۆر پێویست زانیوە لە حاڵێکدا لەوەو پێش بۆ فریودان و بزواندن و ورووژاندنی هەستی سێکسی پیاوان؛ باسی لەم هەڵوێستەی ژنان کردبوو. ئەو لە ئێمیلدا بەم شێوەیە باس لە دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانی پیاوان لە لایەن ژنانەوە؛ دەکا:

١- هەر بە شێوەی سروشتی هێزی خاوکردنەوە و دامرکاندنەوەی هەستە سێکسییەکانی پیاو لە هەموو ژنێکدا بە شاراوەیی هەیە.

٢- پیاو کە مرۆڤێکی هێرشبەرە پێویستیی بە بزواندن و ورووژاندنی سێکسی لە لایەن ژنانەوە هەیە. گەلێک مانا لەو دوو رووبەڕووبوونەوە پاردۆکسەدا هەن و رۆسۆ لە خۆڕا و بەبێ هۆ؛ ئەو رووبەڕووبوونەوە دژوازەی نەخستۆتە نێو بۆچوونەکانی خۆیەوە. بە واتایەکی دیکە لە فەلسەفەی رۆسۆدا، لەلایەکەوە ژن دەبێ دڵفرێن رەزا سووک، بزۆز و هەست بزوێن بێت و لەلایەکیشەوە بوونەوەرێکی ئێجگار داوێن پاک و بەشەرم و حەیا بێ، بۆ ئەوەی بتوانێ هەستە سێکسییەکانی پیاو دامرکێنێتەوە. ئەم دژوازییە لە "ئەرکە سروشتی"یەکانی ژناندا؛ لە ئاکامدا رۆسۆی بەرەو دوو تراژیدیای ئایدیالی ژن پەلکێش کردووە کە یەکێکیان چارەنووسی سۆفییە لە ئێمیلدا و ئەوی دیکەش ژولی لە هێلوییزی نوێدا. ئەو لایەنە پەیوەندییانەی رۆسۆ سەبارەت بە پیاوان و ژنان هێناونێتە گۆڕێ خوێنەر پەلکێش دەکا بەرەو ئەو بابەتەی کە ئەم لایەنانە بەرهەمی کەلتووری سەدان ساڵەی باوک مەزنی و بەستراوەیی کۆمەڵایەتی- ئابووریی ژن و منداڵەکانین بە پیاوەوە.

رۆسۆ بەڕاشکاوی دەڵێ: تایبەتمەندییەکانی رەگەزی و ژنێتی بۆ ژنان شتێکی سروشتین و لە چاو تایبەتمەندیی پیاوێتی بۆ پیاوان واقعێکن کە ژن ناتوانێ لێی دەربازبێ لەبەر ئەوەی "ژنان لە تەواوی ژیانی خۆیاندا یا لانی کەم لە سەردەمی گەنجێتییاندا وەکو ژنێک دەمێنێنەوە و دەژین".[٣٨] لە حاڵێکدا هەروا کاتی خۆیان بۆ بەخێوکردنی منداڵ تەرخان دەکەن، "هەستی سروشتیی ژن بوونیان هەر تێدایە"، بەڵام بە وتەی رۆسۆ ژن "وەها مەبەست و بڕیارێکی هەیە."[٣٩] بەواتایەکی دیکە رەگەزی نێرینە لە تەواوی ژیانیدا لەوانەیە سەردەمێکی کورت وەک "پیاو" بژی و هەست بە پیاوێتی بکا. بەڵام رەگەزی "مێو" هەر لە منداڵی و ساواییەوە دەبێ فێربێ کە ئەو ئافرەتێکە و وەک ژنێک دەمێنێتەوە. رۆسۆ باوەڕی وایەکە پەروەردە و راهێنان دەبێ بە پێی یاساو ڕێسا گەلێک بێ کە بە شێوەی سروشتی لە مرۆڤدا هەن و ئەو ڕێسا سروشتییە لە ژناندا ئاوایە: "ژنان بابەتی چێژوەرگرتن و دامرکاندنەوەی هەستی سێکسی پیاوانن و بۆ ئەم مەبەستەش خوڵقاون" و "سروشت وای داناوە و وا هەڵدەگرێ کە ژنان ملکەچ و پەیڕەوی پیاوان بن و لە قسەی پیاوان دەرنەچن"[٤٠].

دیارە کە ئەم مەسەلە و بڕیارانە بەتەواوەتی بەستراونەتەوە بە راستی و وردیی گریمانەکەی رۆسۆ سەبارەت بە "دۆخی سروشتی"ی ئەو. هەر ئەوەندەی ئەم گریمانە و مەسەلە و بابەتانە سەلمێنران و وەرگیران دەتوانێ داکۆکی بکا لە روانگەکانی خۆی سەبارەت بە "حەزی سروشتی سێکس" و "بنەماڵەی سروشتیی باوک مەزنی". کە ئەرکی ژنان و پەروەردەیان بەپێی پێکهاتە و پێگەی سروشتییان لە کۆمەڵگادا پێناسەکراوە. میتۆدی رۆسۆ بۆ ژولی لەو کاتەدا کە نامە دەنووسێ بۆ گراوییەکەی خۆی واتە سەن پێرۆ* راست ئەو میتۆدەیە کە ئەو لە فەلسەفەی ئەفلاتوون سەبارەت بە هێرش و بەرگری وەری گرتووە بە واتایەکی دیکە، ئەفلاتوون باوەڕی بەوەبوو کە بوێری و چاونەترسیی بۆ پیاو هاتووە و حەیا و شەرم بۆ ژنان. یەکێکیان زاتێکی هێرش بەری هەیە (پیاو) و ئەوی دیکە بەرگێڕەوەیی (ژنان). بەڵام رۆسۆ رای وایە کە ئەم بۆچوونانە بۆچوونگەلێک نین کە فەیلەسووفان (ئەفلاتوون و ئەرەستۆ) خۆیان لەسەری

* saint preuk



رێککەوتبێن، بەڵکو ئەوانە بنەماگەلێکی سەلمێنراون کە سروشت بە ئاسانی شرۆڤەی کردوون."[٤١] ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئەگەر پەروەردە و فێرکردنی ژنان بەپێی سروشتەکەیانە، کەوایە ئەم ئیدعایەی رۆسۆ راست نییە کە دەڵێ: ئەوە پەیمان و بەڵێنی بوو وا ئەوی ناچارکرد بنەمای پەروەردە و فێرکردن بۆ سوفی شی بکاتەوە.

## پێگەی سروشتیی ژن

رۆسۆ؛ کەسایەتی سۆیی بە جۆرێک داڕشتوە کە بواری کەفوکوڵی سێکس بۆ پیاو واتە ئێمیل برەخسێنێ و هەروەها دەبوایە بێ ئەملاو ئەولا وەکو ژنێکی داوێن پاک، ملکەچ و بەدڵی ئێمیل پەروەردە بکرێ لەبەرامبەردا ئێمیل پیاوێکە کە بۆ حەزەکانی خۆی پەرەوەردە دەکرێ. رۆسۆ، ئەمجۆرە فێرکاری و پەروەردە کردنانە هەم بۆ سۆفی و هەم بۆ ئێمیل بە پێی سروشتەکەیانە. گرینگترین روانگەکانی رۆسۆ سەبارەت بە "سروشتی ژن" لە نێو جیهانی باوک مەزنیدا لە سەرەتای کتێبی پێنجەمی ئێمیلدا بەکورتی؛ بەمجۆرە هاتووە:

"ژن و پیاو بۆ یەکتر خوڵقاون، بەڵام بەستراوەیی و پێویستیی هەرکام بە یەکتر یەکسان نییە. پیاوان بە هۆی ویست و حەزە [سێکسی] یەکانیانەوە چاو لە دەستی ژنان و ژنان بە هۆی دوو شتەوە؛ واتە حەزە [سێکسی] یەکانیان و پێداویستییەکانی ژنان [ماددی] پێویستیان بە پیاوان هەیە. ئێمەی پیاو باشتر و ئاسانتر دەتوانین بەبێ ئەوان بژیین لە چاو ئەوەی کە ئەوان بەبێ ئێمە. بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی ژنان دابین بن و لە دۆخێکی خۆشدا بژین دەبێ هەرچی پێویستیان بێ ئێمە بۆیان دابین بکەین. بەڵام دەبێ بمانهەوێ و حەزمان لێ بێ جا بیاندەنێ، واتە ئێمە دەبێ ئەوان بە شیاوی ئەو بەخشینە بزانین. ژیانی ژنان بەو بەهایەوە بەستراوەتەوە کە ئێمە پێیانی دەدەین و بەوگرینگی و بایەخەی بە جوانی و داوێن پاکیی ئەوانی دەدەین. بەپێی یاساکانی سروشت، ژنان [هەم بەنیسبەت خۆیان و هەم بۆ منداڵەکانیان] ملکەچ و گوێڕایەڵی داوەریی پیاوانن"[٤٢].

دیارە لێرەدا وشەکانی بۆ دەربڕینی چەمک و واتای کارپێکەریی (کاربردی) سروشت بە جۆرێک هەڵبژێردراون کە ئەو شتەی نووسەر پێیوایە بۆ مرۆڤ

باش و بەکەڵکە؛ بە شێوەی پەسند و رەوا خۆبنوێنێ. هەڵبەت رۆسۆ لەبەرامبەر جۆن لۆکدا و بۆ هێرش بۆ سەر بۆچوونەکانی ئەو؛ ئەم بەڵگانەی هێناوەتەوە. ئەو هۆیانەی کە سروشت بەپێی ئەوان ژنان بە پیاوانەوە دەبەستێتەوە پێچەوانەی ئەو بەڵگە و هۆیانەیە کە رۆسۆ لە "دۆخی سروشتی"ی ژن و پیاوو شێوەی ژیانیاندا دەیخاتەڕوو کە لێک جیاکردنەوەیان ئەستەمە. چەمکەکانی دۆخی سروشتیی پیاوەمزنی، سەردەمی زێڕینی دووره پەرێزیی بنەماڵەکان، جیاوازیی ئەرکەکان بەپێی رەگەز و خاوەنێتیی سەرەتایی، هەمووان ئەم چەمک و خاڵانەن کە رۆسۆ بۆ پێناسەی "ژنی سروشتی" بەکاری هێناون و ئەوەش لە حاڵێکدایە کە بە پێی دانپیانانی خۆی ئەم پێناسەیە بەبێ سەرنجدان بە خوله مێژووییەکانی گۆڕانکاریی ژنان؛ کراوە. بە واتایەکی دیکە رۆسۆ لە پەیمانە کۆمەڵایەتییەکاندا دەڵێ: هەموو مرۆڤەکان یەکسان و ئازاد خوڵقان و ئازادی تەنیا لەبەر ئەو باشییەی کە هەیەتی بە مرۆڤەکان بەخشراوە."[٤٣] ئێستا لەوانەیە کەسێک لە رۆسۆ بپرسێ: لە بنەماڵەیەکی پیاوەمزندا کە تەواوی یەکسانی و ئازادییەکانی ژنان فیدای ویست و حەزەکانی پیاو دەکرێ ئەم پرەنیسپە چۆن لەبەرچاو دەگیردرێ؟

رۆسۆ وای هەست دەکرد کە بۆ یەکەمین گریمانەی خۆی واتە یەکسانیی هەموو مرۆڤەکان، پەیمانێکی سەرەتایی پێویستە و هەر بۆیەش لە لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانییەکاندا دەڵێ: "مرۆڤەکانی کۆمەڵگای سەرەتایی کە بە هۆی هەبوونی ئامرازە سەرەتاییەکانیانەوە پیاوانێکی نەبەز و شانازی خوڵقێن بوون؛ پێویست نەبوو بۆ ئاسایشی گشتی (امنیت عمومی) خۆیان بخەنە باوەشی ئاغا زۆردارەکانەوە."[٤٤] سەبارەت بەوەش دەبێ لە رۆسۆ بپرسین: ژنان کە لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا یەکسان و ئازاد خوڵقاون، چۆناوچۆن و بۆچی دەبوایە خۆبخەنە باوەشی پیاوە زۆردارەکان و گوێڕایەڵیان بن؟ بە هەرحاڵ، مەسەلەی بنەماڵەی باوک مەزنی "سروشتی بێ" یا ئەوەی کە بە پێی دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان بێ؛ جێی خۆیەتی رەخنەی بنەڕەتی لە رۆسۆ بگیردرێ سەبارەت بە مەسەلەی پێگەی سروشتیی ژن.[٤٥]

رۆسۆ لە لێدوان سەبارەت بە نایەکسانییەکان و لە ئێمیلدا ویستوویەتی ئەوە بخاتەڕوو کە سەرەڕای هەبوونی داب و نەریتی جۆراوجۆری زگماکی، رەگەزی،



جۆرەکانی فرەمێردی و فرەهاوسەری عەشیرەگەرێتی هاوبەش، دایک مەزنی و کۆمەڵگاکانی سەر بە خزمانی دایک؛ ئەو توانیویێتی نەژادی مرۆڤ کە بەپێی سروشت خوڵقاوە بناسێتەوە. ئەو لەم دوو کتێبەدا بەو دەرەنجامە گشتییە دەگا کە بنەماڵەی باوک مەزنی، واقعێکی سروشتییە و نەبوونی بۆ نییە.

بەو پێیە دەگەڵ ناسکرنی* نەژادی مرۆڤ، ئیتر سەیر نییە رۆسۆ بۆ پێناسەکردنی "پیاوی سروشتی" و "ژنی سروشتی" لە دوو سەرچاوەی زەینیی جیاواز کەڵک وەردەگرێ. بەواتایەکی دیکە بەڕای رۆسۆ، "پیاوی سروشتی" لە "دۆخە سەرەتاییە سروشتییەکەیدا" پیاوێکە کە لە سەرپێی خۆی وەستاوە و هیچ فیز و لووتبەرزییەکی نییە بەسەر خەڵکدا، هەروەها تژییە لەو مەزناهی و چاکە و خەسڵەتە باشانەی کە سروشت لە ناخیدا خوڵقاندوویەتی. بەڵام لە بەرامبەردا، "ژنی سروشتی" بوونەوەری کە گوێڕایەڵ، ملکەچ و کەسێکە لێوڕێژ لە شەرم و حەیای سروشتی. نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە ژنە لە "چاخی زێڕین"ی بنەماڵەی پیاومەزندا بەدی دەکرێ.

کورتی ببڕینەوە. لەڕوانگەی رۆسۆوە، پێودانگە کۆمەڵایەتییەکان، میتۆدەکانی ناسین، ئاکارەکان، تایبەتمەندییەکان و ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانی ژن و پیاو تەواو لێک جیاوازن. لێرەدا پێویستە مەسەلەیەک وەبیربێنینەوە، ئەویش ئەوی کە رۆسۆ سەبارەت بە "دۆخی سروشتیی" ئافرەت کە وای کردووە ژن بوونەوەرێکی ژێردەست و گوێڕایەڵ باربێ، دووجاران بە گومانەوە قسەی کردووە. ئەو جارێکیان لە سەرەتای وتاری "سەبارەت بە ژنانsur les femmes " دا و جارێکی دیکە لە "نامە بۆ دالامبێر" دا لەو بابەتە دواوە. هەڵبەت شک و گومان لە دۆخی سروشتیی چاو لە دەستیی ژن، نەک لەلایەن نووسەرەوە (رۆسۆ) بەڵکو بە شێوەی لێدوان و وتووێژدا خراوەتەڕوو. ئەو لە سەرەتای وتاری "سەبارەت بە ژنان"دا نووسیویێتی: "سەرەتا ئیزن بدەن با وای دانێین کە ژنان بە دەست پیاوانی زۆردار و زێدەڕۆ، لە ئازادییەکانی خۆیان بێبەری کراون و هەموو شتێکیان هەر لە تاج و تەختی دەسەڵاتەوە بگرە هەتا سەرۆکایەتی و فەرماندەیی سوپا بە دەست پیاوانی دەسەڵاتدارەوە بووە. من تێناگەم ئەوان چۆناوچۆن هەر لە کۆنەوە

* ناسکردن. کرمانجی ژوورو – (شناسایی کردن.)

بەشێک لەو مافە سروشتییانەیان بۆ خۆیان پاوان کردووە؟"[٤٦] هەروەها تیۆریی کۆمەڵگەی سروشتیی پیاومەزن، کە بەپێی جەوهەری رەگەز (ئەو جۆرەی رەگەزیان هەڵیدەگرێ) ئەرک بەسەر ژن و پیاودا دابەش دەکا لە نووسراوەکانی سەردەمی گەنجێتی رۆسۆدا بوونیان نییە و بە ئاشکرا دیارە کە ئەو دواتر بەم بۆچوونە پاردۆکسیکاڵانە گەیشتووە. رۆسۆ لە "نامە بۆ دالامبێر" دا نارەزایەتیی خۆی بەنیسبەت بەربەست کردن و بەرتەسک کردنەوەی ژنان لە ماڵێدا، دەردەبڕێ و ئەم کردەیە بە دەمارگرژیی گشتی بەنیسبەت داوێن پاکییەوە لە قەڵەم دەدا و دەنووسێ: بەرتەسک کردنەوە و قەتیسکردنی (ژنان) لە ماڵێدا یاسا و پەیمانێکی کۆمەڵاتییە کە بۆ پارستنی مافی مێردەکان و باوکان و هەروەها راگرتنی هێندێ دەستوور و بڕیاری بنەماڵەکان دانراوە.[٤٧]

رۆسۆ لە بیر خۆی دەباتەوە کە ئەو لە سەرەتادا بەتێروتەسەلی باسی لەوە کردبوو کە ئەوە سروشتی ژنە وادەخوازێ ئەوان داوێن پاک و بەحەیاو شەرم بن. ئەو بەبێ سەرنجدان بەم ئیدعایە کە زۆریش قایلکەر و پوخت نەبوو، کتوپڕ دەچێتە سەر باس و تیۆریی بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی. تەنانەت ئەگەر نکوڵی لە خەسڵەتی داوێن پاکیش بکرێ کە دانسقە و تایبەت بەژنانە، ئایا دەکرێ نکوڵی لە چارەنووسی ئەوان لە کۆمەڵگادا بکەین؟

چارەنووسێکی چوارچێوەدار لە ماڵێدا و ژیانێکی دوورە پەرێز کە لەسەر بنەمای پرەنسیپە دانسقەکانی کۆمەڵگایە؟ ئەگەر ئەو داوێن پاکی و بێ خەوشییەی کە سروشتی ژنان دەیخوازێ و هەڵگریەتی خۆی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی بێ کەواتە لەبەرژەوەندیی کۆمەڵگادایە کە ژنان توانیویانە ئەم چلۆنایەتی و خەسڵەتانە وەدەست بێنن و پەرەی پێبدەن. ئەگەر بێت و هەر ژنێک خۆ لەم خەسڵەتانە [داوێن پاکی و بێ خەوشی] ببوێرێ، لە راستیدا خۆی لە ئاکاری چاک (رەوشت پاکی) بواردەووە.[٤٨]. لەوانەیە نەکرێ بڵێی رۆسۆ لە بەرچی سەرنج و بایەخی بەم باسە ئەخلاقییەداوە؛ بەڵام دیارە لەو دیوی ئەم پرسە ئەخلاقییەی ئەو لێی دەدوێ؛ هانەیەکی (انگیزە) بنجدار هەیە کە ئەویش هەر ئەو گریمانە مێژووییەی ئەوە، سەبارەت بە مەسەلەی "پیاوی سروشتی" و "ژنی سروشتی" کە ئەویش ئێجگار لێک جیاوازن. لەداوەریی جان جاک رۆسۆدا، کۆمەڵگا چاو لە دەستی بنەماڵەی



باوک مەزنە. بەو پێیە ئەو ناچارە بۆ پێناسە کردنی ژنی سروشتی نەک هەر پێناسەیەکی جیاواز لە چەمکی پیاوی سروشتی بخاتەڕوو بەڵکو دەبوایە، خوێنەریش بگێڕێتەوە بۆ بیروڕا مێژووییەکانی رابردوو.
خاڵێکی کە لەجێگەی خۆیدا زۆر گرینگە و پێویستە سەرنجی بدرێتێ شێوەی بەڵگاندنی رۆسۆیە سەبارەت بە "تیۆریی بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی بۆ داکۆکی کردن لە ماف و ئازادییەکانی تاک". ئەو میتۆدە بە تەواوی دژوازە لەگەڵ میتۆدە فەلسەفییە گشتییەکەی ئەو و تەنیا خاڵی وێکچوویی هاوبەشی نێوانیان مەسەلەی "کۆیلەداری" یە[٤٩]. ئەو لە بۆچوونە فەلسەفییەکانیدا کۆیلەداریی قبووڵ نەکرد. ئەو کۆیلەدارییەی کە مانەوەی کۆماری ئایدیال لە یۆناندا بەوەوە بەسترابۆوە و لە پێداویستییە سەرەکییەکانی خەڵکی یۆنان بوو؛ بەڵام قبووڵ نەکردنی "کۆیلەداری" لەلایەن رۆسۆوە نەک بەپێی تیۆرییە گشتییەکەی واتە یاسا کۆمەڵایەتییەکان، بەڵکو بەپێی بەرژەوەندیی کۆمەڵگا بووە. ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە رۆسۆ لە پێشنیار و هێنانە ئارای هەر چەشنە تیۆرییەک سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ، کە پێوەندییان بەرگەزەوە هەیە خۆ ببوێرێ. ئەگەر بەو جۆرەی رۆسۆ ئیدعا دەکا کە کۆمەڵگا بەپێی پێویست لەسەر بنەمای دەزگای بنەماڵە دامەزراوە و یاساکانی (بنەماڵە) بە دەست پیاوان داڕێژراون، بەو پێیە دەبێ ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی ژنان لەبەرچاو بگیردرێ کە بۆ پێکهێنانی دەزگای بنەماڵە کردوویانە.

## کاریگەریی ژینگە لەسەر مرۆڤ

دووهەمین شێوەیەک کە رۆسۆ بۆ ناسینی "مرۆڤی سروشتی" بەکاری هێناوە جوێ کردنەوەی خەسڵەتە زاتییەکانی مرۆڤە لەو خەسڵەتانەی کە لەڕێگەی پەروەردە و فێرکردنەوە دەستەبەر دەبن. دیسانیش بەڵگەهێنانەوەی رۆسۆ سەبارەت بە پیاوان گەلێک جیاوازە لەو بەڵگانەی لەسەر ژنان دەیهێنێتەوە. لە بەرهەمەکانی رۆسۆدا بەتایبەت لە "لێدوان سەبارەت  بە سەرچاوەی نایەکسانی" دا؛ گەلێک نموونە هەن کە دەیسەلمێنێ رۆسۆ باوەڕێکی قووڵ و پتەوی هەیە بە کاریگەریی ژینگە لەسەر گۆڕینی توانا و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ.

رۆسۆ لە ئێمیلدا بە پشتبەستن بە هۆی ماددیی بنەما ئەخلاقییەکانی مرۆڤ دەڵێ: "لە سەدەی ئێمەدا زیاتر کەڵکی بێ جێ لە فەلسەفە وەرگیراوە"(٥٠) و بۆ پشتراستکردنەوەی بواری ماددیی ئەخلاق و هێزی شوێندانەریی ژینگە لەسەر مرۆڤ دەنووسێ: "دیتنی ئەو جیاوازییانەی مرۆڤ لێک جیا دەکەنەوە کارێکی زۆر ئاسانە. بەشێکی ئەم جیاوازییانە کە ناوازەن لە سروشتەوە سەرچاوە دەگرن و هێندێکی دیکەش کە "حاڵەتی گشتی" یان هەیە لە کۆمەڵگا هەڵقوڵیون و ناسکێتی، پتەوی یا لەرزۆکیی ئەوان هەمووی بە کۆمەڵگاوە بەستراونەتەوە. زۆربەی سیفەت و خەسڵەتەکان لەو میتۆدە ئاسان یا دژوارانەوە پێک دێن کە هەر کەسەی لە قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆیدا دەگەڵیان دەستەویەخەیە. دیارە ئەم شتانە بەهێزی و وردیی ئەقڵیش دەگرێتەوە، واتە ئەوە زانستە کە دەبێتە هۆی جیاوازیی نێوان پەرەگرتن و دابەزینی عەقڵ و هەروەها جیاوازیی رەهەندە کەلتوورییەکانی لێدەکەوێتەوە."(٥١)

رۆسۆ باوەڕی وایە کە بە گشتی هەڵەی ئێمە لەوەدایە کە دەمانهەوێ جۆری مرۆڤی ژیاری (متمدن) لە نێو جۆرەکانی دیکەدا وەک مرۆڤی نموونە بناسێنین. شارستانییەت و کۆمەڵایەتی بوون وەک نزمی و لاوازیی مرۆڤ وایە. ئەو لە "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی"دا دەنووسێ: "ئەسپ و پشیلە لە دارستان (سروشت)دا بەهێزتر و چالاکترن هەتا لە ماڵێدا. ئەوان نیوەی هێز و بڕست و چۆنایەتیی (جەوهەر) خۆیان بە هۆی ماڵی بوونیان لە دەست دەدەن. ئەو پرسە مرۆڤیش لەخۆدەگرێ کە دەیهەوێ شارستانی و کۆمەڵایەتی بێ. چونکە ژیانی سیڤیل و شارستنیانە، بەهێزی و بوێریی مرۆڤەکان لە ناودەبا(٥٢). ئەو لە درێژەی وتارەکەی خۆیدا دەڵێ: "منداڵانی شاری، لە منداڵانی دیکە [منداڵانی دوور لەشاروژیار] لاوازترن و درەنگتر لەسەرپێی خۆیان رادەوەستن."(٥٣) لەلایەکی دیکەوە ئەو کەسانەی پەروەردە دەکرێن زووتر دەگەنە تەمەنی خۆناسین (بالق بوون) لەچاو ئەو کەسانەی کە لە پەروەردە بێبەشن. لەبەر ئەوەی کە کاریگەرییەکانی پەروەردە دەبنە هۆی ئەوەی تواناییەکان بپشکوێن و زووتر لە کاتی سروشتیی خۆیان گەشە بکەن.(٥٤).



هەروەک دەبینین هێزی کارتێکەریی ژینگە لە هێزی سروشتی پترە و رۆسۆ لە نووسراوەکانی دیکەیدا ئەوشتانە زیاتر دووپاتە دەکاتەوە. بەرچاوترین نموونەیەک کە لە پەیوەندی دەگەڵ باوەڕی رۆسۆ سەبارەت بە کاریگەریی ژینگە لەسەر مرۆڤ لەبەردەست دایە، باس و لێدوانی ئەو سەبارەت بە کۆیلەدارییە. رۆسۆ لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا دەنووسێ: "ئەرەستۆ لە هەڵەدابوو کە کۆیلەدارێتیی بە شتێکی سروشتی دەزانی و دەیگوت هێندێ کەس بۆ کۆیلەتی خوڵقاون و هێندێکی دیکە بۆ ئاغایەتی و سەروەری. کۆیلە دەگەڵ جەوهەرە و ویستی سروشتی یەکناگرێتەوە، چونکە سەرەتا ئەوە دەسەڵات بوو کە بووە هۆی کۆیلەیی و کۆیلەکان لەبەر ترس و لاوازیی خۆیان ئەو هەلومەرجەیان رەخساند(٥٥). دیارە لە شوێنێکدا کە مرۆڤ گەشە دەکات، بەتایبەت ئەگەر ئەو ژینگەیە لە ژینگەکانی دەوروبەری خۆی جیاوازبێ دەبێتە هۆی ئەوەی کە، ئەو توانایی و سیفەتە زاتییەکانی خۆی بۆ وەدەستهێنانی مەزنایەتی و لەناوبردنی ئەوانی دیکە پەرەپێبدا و هیچ سنوورێکی تایبەتیش بۆ ئەم پەرەپێدانە دانەنێ. رۆسۆ لە سەرەتای کتێبی ئێمێلدا ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە "من هیچ فەیلەسووفێکم پێ شک نایە کە بوێرانە و بەبێ هەڵسەنگاندن، سنوور و ئاستەنگێک بۆ مرۆڤ دابنێ و بڵێ؛ ئەم خاڵە خاڵێکە، کە رادە و ئاستی مرۆڤ دەسنیشان دەکا و ئیتر ئەو ناتوانێ لەو خاڵە بەولاوە بچێ. هیچ کام لە ئێمە ناتوانین ئاستی سنوورەکانی مرۆڤێک بەنیسبەت ئەوی دیکەوە دیاری بکەین".(٥٦). بەو پێیە ئێمە ئالترناتیڤێکی دیکەمان نییە مەگەر ئەوەی کە بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە سنووری تواناییەکانی مرۆڤەکان نەناسراوە. بەپێچەوانەی بیروباوەڕی گشتی، مەبەست لە روونکردنەوەی ئێمیل؛ ئەوە نییە ئاکار و میتۆدێک بۆ پەروەردە و فێرکردنی پۆزێتیڤ و پراکتیک بخرێتەڕوو بەڵکو رەخنەیەکی قووڵە لە ژیار و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکانی هاوچەرخ کە هەتا ئێستاش بە پێچەوانەی ویستی سروشتیی مرۆڤ دانراون.

## پەروەردە و فێرکردنی ژن و پیاو

لە دەزگای هزریی رۆسۆدا ئێمیل کەسێکە، کە بەپێی سروشت و لەڕێگەی پەروەردە و راهێنان و شێوازەکانی پەروەردەوە لەو دەمارگرژی و باوەڕە

تایبەتانە دوورە کە لە هەموو شوێنێکاتێکدا هەن. ئەو بۆ درندەیی پەروەردە ناکرێ. ئەم میتۆدە وای لێدەکا: "ئەو جیا لە مرۆڤێک کە لە دەست سروشتدا گەشە دەکات و هەڵدەدا بەولاوە شتێکی دیکە نەبێ"[٥٧]. هەر لە دەسپێکی کاری ئێمیلدا، رۆسۆ بە مەبەستی پەروەردە و بارهێنانی مرۆڤ؛ بە شێوەی بەربلاو ئینتمای بەرەو هێزێک دەبێ کە لە سیستەمی پەروەردە و فێرکردن دەکەوێتەوە. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە "مرۆڤەکان بە هۆی پەروەردەوە بیچم دەگرن هەروەکی چۆن گژ و گیاکان بە داچاندن و پێراگەیشتن پێدەگەن.....

ئەو کاتەی لە دایک دەبین لاوازین و پێویستیمان بەهێز هەیە. ئێمە لە هەموو شتێک بێبەشین و چاو لەدەستی ئەوانی دیکەین. ئێمە بە نەزانی لە دایک دەبین و پێویستیمان بە لێک جیاکردنەوە و داوەری هەیە. هەرچی لە کاتی لە دایکبووندا نیمانە کە گەورەبووین پێویستمانە و لەڕێی فێرکردن و پەروەردەوە پێیان دەگەین...[٥٨].

بەرپرسیارەتیی نووسەر [رۆسۆ] لە هەمبەر منداڵدا [ئێمیل] هەرهەمان بەرپرسیارەتیی مامۆستای تایبەتییە، کە دەبێ لە هەموو قۆناغەکاندا وریای بێ و لەو دەمارگرژیی چەواشەکارانەیە بیپارێزێ کە لە دەوروبەریدا هەن. ئەرکی مامۆستای تایبەت (ماڵێ) ئەوەیە کە منداڵ بەپێی ئەو حەز و ویستە سروشتیانە بەتایبەتی هەستی کونجکۆڵی و وریاییە پەروەردە بکات کە لە جەوهەر و زاتی منداڵ دایە، و جۆرێکی باربێنێ کە بتوانێ بە سەربەخۆیی داوەریی بکا و بڕیاربدا. یەکێک لە پرەنسیپە پەروەردەییەکان لە ئێمیلدا ئەوەیە کە نابێ هیچ کاتێک بە شێوەی بەرپەرچدانەوە و فەرمان بەسەردالێدان؛ دەگەڵ منداڵ بجووڵێنەوە. بەڵام دەبێ یارمەتیی منداڵ بدرێ لەوەدا کە خۆی "چاک و خراپەی" مەسەلەکە لێکجیا بکاتەوە. بەڕای رۆسۆ مرۆڤ هەر بە شێوەی سروشتی بیرمەندە، بەڵام زۆر نا، لەبەر ئەوەی کە بیرکردنەوە لە کارەکانی دیکە دژوارترە. من دەزانم پیاو و ژن دوو ڕەگەزی لێک جیاوازن، واتە کەسانێک هەن کە بیر دەکەنەوە و کەسانێکیش هەن کە، وانین. جیاوازی و ناتەبایی ئەم دوو گرووپە تەواو بەرهەمی ئەو پەروەردە و راهێنانەیە کە ئەوان هەیانە[٥٩].



رۆسۆ باوەڕی وایە کە تەنیا لەڕێگەی ڕێنوێنی و بایەخ پێدانی وردەوەیە کە دەکرێ منداڵ لە دەمارگرژیی گشتی و بێ لۆژیک بپارێزرێ. "سەرنج دان و بایەخ پێدانێکی بچووکی مامۆستا دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ (قوتابی) هێزی عەقڵ و هزریی خۆی پەرەپێبدا و پێشی ئەوەی لێ بگرێ بەخۆی و بە ئەوانی دیکە (خەڵک) بێ متمانەبێ. لەبەرامبەردا ئەگەر ئێوە نەهێڵن بەڵگەبێنێتەوە و بیر بیربکاتەوە بەڵکو خۆتان بێن شتەکانی لە مێشکی بئاخنن بەبێ ئەوەی ئەو بیری لێ بکاتەوە، ئەو منداڵە هیچکات ناتوانێ سەربەخۆیی هزری وەدەست بێنێ و لە باری هزرییەوە سەربەخۆبێ. بەڵکو بەردەوام دەبێتە گاڵتەجار و ئامرازی دەست بیر و بۆچوونی خەڵکانی دیکە.[٦٠] تەرخانکردنی وزە و هێز بۆ چاودێریی ئێمیل و دوور راگرتنی لە دەمارگرژیی ژینگە و دەوروبەرییەکانی؛ مەبەست گەلێکن کە بۆ گەشەکردنی سروشتیی پیاو پێویستن، بەڵام لەوە گرینگتر؛ بردنە سەرێی هێزی عەقڵانییەت و سەربەخۆیی لە داوەریکردن دایە.

ئەوەی گرینگ و جێی سەرنجە ئەوەیە کە رۆسۆ جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە یاسادانەران و ئەوانەی بەرپرسیارەتیی قورسیان لە هەمبەر حکوومەتدا لە ئەستۆیە، دەبێ پەروەردەکرابن. "ئەگەر ئێوە کەسانێکتان دەوێ حکوومەت بکەن؛ دەبێ ئەو کەسانە پەروەردە بکەن و رایان بێنن". لە راستیدا پەروەردە و فێرکردن پێشەکییەکە بۆ "پاراستنی کۆمارێک". رۆسۆ هاوکات دەگەڵ بایەخ پێدان بە پەروەردەکرانی دەسەلاتداران، لە" لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانیدا" دەڵێ. "تەنیا رێگا بۆ پەروەردەکردنی هاوولاتیی باش؛ پەروەردەیەکە، کە ئەم هاوولاتییە دەبێ هەر لەسەردەمی منداڵییەوە پێی رابێ، چونکە مرۆڤ دوای ئەوەی هەڵیدا و گەورەبوو ئیتر فیزلێدان و خۆبەزلزانی و عادەتەکان تێیاندا بەهێز و سەقامگیردەبن و درەنگ دەبێ بۆ ئەوەی بەرەو حەزە سروشتییەکان بگەڕێندرێنەوە."[٦١] لەخۆوە نییە کە رۆسۆ بۆ کۆمەڵایەتی بارهێنانی منداڵانی سەرەتایی، پێشنیاری ئەوە دەکا کە ئەوانە دەبێ هەر لە منداڵییەوە فێری داوێن پاکی و شێوازە گشتییەکانی بیرکردنەوە بکرێن کە ئەویش لە رێگەی پەروەردەوە مەیسەل دەبێ[٦٢].

رۆسۆ پیاوانی سەردەمی خۆی بە سووک و هیچ و پووچ لە قەڵەم دەدا، بەڵام پێی وانەبوو کە ئەم سووکی و هیچ و پووچییە لەو پیاوانەدا شتێکی زاتی و جەوهەری بێ چونکە باوەڕێ وابوو کە سەرچاوەی ئەو شتانە، ژینگە و شێوەی پەروەردە و فێرکردنێک بوو کە هەیانە. بەڵام بۆچی پیاوانی سەردەمی رۆسۆ بە سووک و بێ قیمەت لە قەڵەم دەدران؟ لەڕوانگەی رۆسۆوە؛ ئەوانە لە سۆنگەی هەڵسوکەوت دەگەڵ ژنان؛ خەسڵەتەکانی پیاوێتی خۆیانیان لەدەست دابوو و بە جێگەی ئەوە خەسڵەتی ئافرەتانەیان گرتبوو. ئەم دانوستانە بووە هۆی ئەوەی کە ژنان دەسەڵاتیان بەسەر پیاواندا هەبێ و پیاوان وەک تولەی دەستەمۆ* لێبکەن. بۆیەش رۆسۆ بە داخە بۆ حاڵی ئەم جۆرە"پیاوە گەندەڵانەی سەردەمی خۆی" و ژنانیلەیی* و گەندەڵیی ئەوان بە ئاکامی ئەو پەروەردە و فێرکارییە دەزانێ کە هەیانبووە".[٦٣] بەو پێیە؛ بەباوەڕی رۆسۆ "هێزی پەروەردە و فێرکردن کە دەتوانێ هەموو شتێک بگۆڕێ"، واتە پەروەردە و مامۆستا بەواتای بەربڵاوی خۆی، بەرپرسیارن لەبەرامبەر ئەو ئاکار و خەسڵەت و تایبەتمەندییانەدا کە لە پیاوانی بەتەمەندا بەدی دەکرێن و ئەوەش کە ئەگەر، جیاوازییەک بەدی دەکرێ لە نێوان خەڵک لە شوێن و سەردەمە جیاوازەکاندا بەرهۆو بەرهەمی شێوەی فێرکردن و پەروەردەکرانیانە. بەڵام ئەو دەبێ سەرنج و گرینگی بە گریمانە سروشتییەکەی خۆیشی بدات و هەروەها بە بیروڕاکانی دیکەشی کە پێوەرێکی "یەکە" لەواندا بۆ پەروەردە و فێرکردن بەکارناهێنێ. رۆسۆ باوەڕی بەوە نییە کە ژنان بە هۆی پەروەردە و راهێنان دەتوانن بگەن بە پلەکانی سەروو. بەواتایەکی دیکە، رۆسۆ لە هێنانە گۆڕێی میتۆدگەلی یەکسان و هاوشێوە بۆ پیاو و ژن بە مەبەستی پەروەردە و فێربوونی زانست خۆ دەبوێرێ و باوەڕی وایە کە هۆشیاری و هێزی عەقڵانییەت و بیرکردنەوە لە ژناندا شتێک نین کە بکرێ بە میتۆدەکانی پەروەردە و راهێنان گەشەیان پێ بدرێ، چونکە

* تولەی دەستەمۆ: لەڕاستیدا نووسەر لە دەقە فارسییەکەدا دەڵێ ژنان ئەو پیاوانەیان وەک "سەگی چووکەی دەستەمۆ" لێکردووە و ئەمن بەجێی ئەم دەستەواژەیە ئەوەم بەگونجاو زانی. وەرگێڕ
* ژنانیلە: بەو پیاوانە دەگوترێ کە ئەدا و ئەتواری ژنانەیان هەیە و لە کۆمەڵگای پیاومەزندا ئەم سیفەتە سووکایەتییە بە پیاوان.



ئەوانە لەژناندا زاتی و جەوهەرین. رۆسۆ دواتر بە روونی ئاماژە بەم هۆشیاری و هێزی عەقڵانییەتە زاتییەی ژنان دەکا.[٦٤]. رۆسۆ ئەوە قبووڵ ناکا کە تواناکان، ئاکار و ئەرکەکانی کچان لەبەرامبەر کوڕاندا دەبوایە بە شێوەی یەکسان و لەژێر کاریگەریی ژینگە دابێ. چونکە ئەو هەر لەپێشدا، پێڕستێکی دوور و درێژی لە خەسڵەت و چۆنایەتی و ئاکارە زاتییەکانی ژنان کۆکردۆتەوە. بۆ وێنە بەڕای رۆسۆ، خەسڵەتگەلێکی وەک شەرمێونی، شەرم و حەیا، هۆگریی بە خشڵ و زێڕ و زیو، خۆ جوانکردن و خۆ نواندن بە ئەدەب و نەزاکەت و رووخۆشی لە بەرامبەر خەڵکدا و هەروەها دووڕوویی، خەسڵەتگەلێکن بە شێوەی زاتی لە ژناندا هەن و ئەوان بەو خەسڵەتانەوە لەدایک دەبن[٦٥]. لەلایەکی دیکەوە ئەو خەسڵەتە لە زاتی کوڕاندا نین چونکە "سروشت ئەوانی بەم خەسڵەتانەوە نەخولّقاندووە و ئەوان لە زاتی خۆیاندا دژی ئەم خەسڵەتگەلەن.[٦٦]

رۆسۆ جیا لەوەی کە نە تەنیا نەی دەتوانی بیروڕای خۆی سەبارەت بە سروشتی بوونی کۆیلەیی گرێ بداتەوە بەو دەرەنجامەی پێی گەیشتبوو لە سەر ئەوەی تەواوی ژنان بە شێوەی زاتی ژێردەست و ملکەچن؛ بەڵکو بە پێداگری و سووربوونێکی "کوێرانە و لاساییکەرەوەیی، رادەگەیەنێ کە بۆ ژنێک باش نییە بێجگە لەوشتەی هەیەتی داخوازیی دیکەی هەبێ. بەواتایەکی دیکە، وەدەست هێنانی تەواوی ئەم پوانانەی پیاوان بە شێوەی زاتی یا لە رێگەی پەروەردە و زاڵبوون و هێژمونی کەلتووری پیاومەزنیدا وەدەستیان هێناون؛ بۆ ژنان باش نییە. رۆسۆ لەوکاتدا و لە دوایین قۆناغی دەرەنجامی بیروڕاکانیدا، باوەڕێکی پتەوی بەوە هەبوو کە خەسڵەتگەلێکی وەک دووڕوویی و خۆڕاگری و دان بە جەرگ داگرتن لە بەرامبەر نایەکسانییەکاندا لە زاتی ژناندان؛ چونکە دۆخی کۆمەڵایەتیی ئەوان جۆرێکە کە ژێردەستەی کردوون و وەها ژیانێکی کۆمەڵایەتییان پێ براوە. بۆ وێنە، کاتێک ژنێک عاشق دەبێ لە قۆناغی عاشق بووندا حەزەکانی لە حەزی پیاودەچن، بەڵام ئەو مافەی پیاو بۆ دەربڕینی ئەو جۆرە حەزانە هەیەتی، ژن لێی بێبەرییە. ژن دەبوایە بۆ دەربڕینی حەزەکانی خۆی بەزمانێکی دیکە تەیاربێ بۆ ئەوەی بتوانێ لەم زمانە وەک ئالترناتیڤ کەڵک وەرگرێ و بە شێوەی ناراستەوخۆ کەفووکوڵ و حەزە راستەقینەکانی خۆی

بخاتەڕوو؛ چونکە ڕۆسۆ پێیوایە "ژن بۆ پیاو خوڵقاوە و تەنانەت قبووڵی ئەوەشی کردووە کە دەگەڵ پیاو یەکسان نییە" هەروەها "ژن بەپێی توانایی زاتیی خۆی؛ دەست دەکا بە ناز و ئەدا، بۆ ئەوەی بکەوێتە بەر دڵی پیاو؛ هەڵبەت ئەم [توانا زاتییە] بە قازانجی ژنە."[٦٧]

لە وتەکانی ڕۆسۆدا سەبارەت بە "ئەو شتەی زاتی و سروشتییە" و هەروەها لەمەڕ "شێوازی ژیانی ژن" گەلێک پارادۆکسی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا بەدی دەکرێن. بۆ وێنە، بۆچی پیاوان و کوڕان بەو ڕێگایانەدا دەڕۆن کە بۆ خۆیان هەڵیدەبژێرن و دەشتوانن هەرکات حەزیان لێ بێ بیگۆڕن؟ بۆچی ڕۆسۆ مافی وەها حەز و هەڵبژاردنێک بە ژنان نادا و ئاکار و خەسڵەتەکانی ئەوان وەک حەقیقەتێکی مسۆگەر و نەگۆڕ لە قەڵەم دەدا؟ وێڕای ئەوەی کە دانی بەوە دادەنا کە ژنانی سپارتە بە هۆی مەشقی جەستەییەوە بەهێز و ساخ بوون، دەڵێ: "ئەم ژنانە [ژنانی سپارت] دەگەڵ ژنە فەڕەنسییەکانی سەدەی هەژدەهەم جیاوازییەکی زۆریان هەیە". ڕۆسۆ نکولی لەوە دەکا کە ژنان بە هۆی پەروەردەی پێویستەوە دەتوانن ئەوکارانە ڕاپەڕێنن کە لە ئەستۆی پیاوانن و هەروەها دەتوانن لە دەرەوەی ماڵێش ئیش بکەن و ئەرک وەئەستۆ بگرن. بەڵام بەجێی ئەوە بە شێوەیەکی گاڵتە جاڕانە وێنەی ژنێک دەکێشێتەوە کە "لەبەر لەرزۆکی و بێهێزی، هیچ کات نەهاتۆتە بەر تاوێ و نازانێ لە تەمەنی پەنجاساڵیدا بەڕێدا بڕوا و هەوڵ دەدا لە ژنێکی لاواز و بێهێزەوە خۆی بکاتە سەربازێک."[٦٨]

ڕۆسۆ لە هەوڵێکی بێ سەمەری دیکەدا بۆ پێشاندانی ئەوەی کە کوڕان و کچانی منداڵ حەزیان لە کایە و ڕابواردنە هەلومەرجێکی ئازاد و دڵخواز بۆ منداڵە وردەکان لەبەرچاو دەگرێ لە حاڵێکدا کە کچە منداڵەکانیش بە شێوەی زاتی حەزیان لەو جۆرە کەرەستانەیە. ئەو لە ئێمیلدا دەنووسێ: "کوڕان هەر لە منداڵییەوە حەزیان لە جموجۆڵ و بزۆزی و قریوەقریوە. لە حاڵێکدا کچانی منداڵ حەزیان لەو کەرەستە و ئامرازانەی کایەیە کە تایبەتی بۆ ئەوان سازکراون و ئەو حەزەش سەرچاوەیەکی زاتیی هەیە و مەبەست و ئامانجەکانی ژیانی داهاتوویان دیاری دەکا". هەروەها کچان هەر لە سەرەتای منداڵییەوە حەزیان لە



خۆ جوان کردن و خشڵ و زێڕ و زیوە و هەر ئەوەندەی بزانن خەڵکی چۆنیان باس دەکەن هەول دەدەن بەپێی قسەی خەڵک خۆ بڕازێننەوە؛ ئەوەش ئامرازێکە کە دەکرێ کچانی پێ کۆنترۆڵ بکەی. بەڵام لەبەرامبەردا گەمژەییە ئەگەر بیانهەوێ هەر لەم ئامرازە بۆ کۆنترۆڵی کوڕانی منداڵ کەڵک وەرگرن، لەبەر ئەوەی کوڕان زۆر گوێ نادەن بە باوەڕی خەڵک و ئەوەی کە ئەوان چۆنیان باس دەکەن.[٦٩] وێدەچێ ئەم بەشەی قسەکانی ڕۆسۆ کە مەودای نێوان ڕەگەزەکان دێنێتەگۆڕێ، هەوڵێک بێ بەمەبەستی دووره پەرێزکردنی ئێمیل بۆ ئەوەی خۆی دوور ڕاگرێ لە کارتێکەریی باوەڕی ئەوانی دیکە. هەروەها ئیدعاکەی ڕۆسۆ سەبارەت بەزاتی بوونی ئەم خەسڵەتگەلە کە لە کچانی منداڵدا هیچ شتێک ناسەڵمێنێ؛ تەنیا ئەم حەقیقەتە پشتڕاست دەکاتەوە کە کچان زۆر زوو سەرنج دەدەنە ئەو شتانەی دڵخوازیانە و دەبێتە هۆی جوان بوونیان. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو دەرەنجامانەی ڕۆسۆ سەبارەت بە ناتەبایی نێوان ڕەگەزەکان خستوویەتەڕوو، لەسەر بنەمایەکی لاواز و لەرزۆک دامەزراوە چونکە ئەو بۆ سەلماندنی ئەم ناتەباییە داوا لە خوێنەر دەکا سەرنج بداتە کوڕ و کچی منداڵی خوار تەمەنی شەش ساڵ، بۆ ئەوەی تێ بگا ئەوان لەو جگەلەی بۆیان هەڵدەکەوێ و تێیدا دەبن، چۆناوچۆن ئاکاری جیاوز دەنوێنن.[٧٠]

هەروەکی پێشتریش ئاماژەی پێکرا، ڕۆسۆ سەرەڕای ئەوەی پێدادەگرێتەوە لەسەر کاریگەریی ژینگە و پەروەردە بەسەر ڕەگەزەکانەوە؛ بەڵام لە هێندێ شوێنی باسەکەیدا؛ لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئەم کاریگەرییانە ژنان لەخۆ ناگرن. ئەو ڕەفتار و ئاکاری ژنان لە بەراورد دەگەڵ پیاواندا، بە شێوەی دژواز، بە ئاکارێکی سەقامگیرو نەگۆڕ دەزانێ کە سروشت لە زاتیاندا خوڵقاندوویەتی. بۆ وێنە ئەو لە "نامە بۆ دالامبێر"دا بەڕاشکاوی دەڵێ: "ژنان بەگشتی حەزیان لە هیچ هونەرێک نییە و هیچی لەسەر نازانن، چونکە ئەوان بێبەرین لە هزری "نبوغ" و خوڵقاندن و داهێنەری و تەنیا خەریکی کاروبارێکی وەک خۆ ڕازاندنەوە و ئارایشت دەبن کە خێرا مەیسەل دەبن و پێویستیان بەتێفکرین و بیرکردنەوە نییە. هەڵبەت جار و بارێک هێندێک هۆگری بەنیسبەت لۆژیک و فەلسەفەوە لەخۆ نیشان دەدەن، بەڵام بەربڵاو نییە. ژنان بێبەرین لە "هەست بەرزی" و

"خولقێنەری و داهێنان."[٧١] ڕۆسۆ بۆ جێگیرکردنی بۆچوونەکەی خۆی لەسەر ئەوەی کە خەسڵەتەکانی ژنان بە شێوەی زاتی نەگۆڕن، سەرەتا دەڵێ: ژنان لە چاو پیاوان لەباری هێزی بیرکردنەوە و ژیرێتییەوە لە ئاستێکی نزمتردان و دواتر بەو گریمانەیە دێتە سەر ئەرکی ژنان لە کۆمەڵگادا. بەواتایەکی دیکە بەپێی توانا فیکرییەکانی ژنان، هەر لە پێشدا ئەرکە گونجاو و سروشتییەکانی ئەوان وەک: دابینکردن و دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانی پیاو، ماڵدارێتی داوێن پاکی و منداڵ بەخێوکردن دەستنیشان دەکرێن.

## توانایی ژنان

ڕۆسۆ بێ ئەوەی بەڵگەیەک بۆ قایل کردنی ئێمە یا لانیکەم خۆی بدا بەدەستەوە هاتبوە سەر ئەوەی کە ژنان بە شێوەی زاتی: لەڕووی عەقڵ و تێگەیشتنەوە لە خوار پیاوانەوەن و لە پیاوان کەمترن و ئەوەش هۆیەکە بۆ زاڵبوونی پیاوان و ژێر چەپۆکە بوونی ژنان. لەو پەیوەندییەدا دەبێ ئاماژە بە چەند خاڵێکی گرینگ بکەین:

بۆچوونە سەرەتاییەکانی ڕۆسۆ سەبارەت بە تواناکانی ژنان زۆر جیاوازن لە بیروڕاکانی دواتری. بۆ وێنە؛ ئەو لە وتاری "سەبارەت بە ژنان"دا دەڵێ: "ئەگەر مێژوو بەدەستی پیاوە دەمارگرژەکان نەنووسرابایە، لەلاپەڕەکانیدا گەورەیی و مەزنایەتیی پاڵەوانانی پیاو بەسەر پاڵەوانانی ژندا نەدەبینرا یا لانیکەم هاوسەنگیی نێوانیان دەپارێزرا.

ئەگەرچی هەلومەرجەکە وای کردبوو کە پیاوان لە ژنان گەورەتربن بەو حاڵەشەوە ئێمە دەبینین کە ژنان لە فۆرمگەلی ژیارییانە و ئەخلاقیدا؛ زۆرجاران لە پیاوان بەرزتر و باشترن[٧٢] و "ئەو جیاوازییە گشتییەی کە لە نێوان پیاوان و ژناندا هەبوو، لەبەر ئەوە بوو کە دەرفەتی کەمتر بۆ ژنان ڕەخسا بوو کە بتوانن خۆیان لە شوێن و پێگەی ڕێبەری، بوێری و فیداکاریدا نیشان بدەن. هەڵبەت لە نێو ژنانیشدا هەڵکەوتوون کەسانێک کە ئەم سەرکەوتنانەیان وەدەست هێناوە". ڕۆسۆ لە دوایین دەرەنجامی بیروڕاکانیدا دەڵێ: "من دووپاتی دەکەمەوە کە ژنان دەتوانن بگەن بە قۆناغ و پلەکانی هەست بەرزی و داوێن پاکی تەنانەت لە



پیاوانیش بەرزتر. ئەگەر نادادپەروەرییەکان و زوڵمەکان لابردرێن و لە هەموو بوارەکاندا ئازادییان پێی بدرێ و دەرفەت و هەلی یەکسان بۆ هەردوو لایان بڕەخسێ، ئەوکات لێوەشاوەیی ژنان دەبێتە هۆێ سەرسوڕمانی خەڵکی جیهان"[٧٣].

بەتایبەت ئەو دان بەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە ژنانی ڕۆشنبیرو نووسەر دادەنێ کە خۆی پشتڕاستکەرەوە و سەلمێنەری تواناکانیانە. بەگشتی ڕوانگەی ڕۆسۆ بەنیسبەت ئافرەتەوە لە سەرەتادا ئەوەیە کە ئەگەر لە درێژایی مێژوودا ناتەباییەک هەیە لە نێوان ژنان و پیاواندا، دەرەنجامی نەبوون یان دەگمەن بوونی دەرفەتگەلی گونجاوە بۆ ژنان.

ڕۆسۆ بە پێچەوانەی جۆن لۆک[٧٤] کە باوەڕی وابوو بە هۆی لاوازی و بێ توانایی ژن دەبێ ڕۆڵی سەرەکی و دەسەڵاتداریتی لە بنەماڵەدا بە پیاو بسپێردرێ؛ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە "دەبێ ئۆتوریتەی یەکێک بەسەر ماڵەوە هەبێ، دەی جا سروشتییە ئەم زاڵێتی و ئۆتوریتەیە، ئۆتوریتەی پیاوە لەبەر، ئەوەی ژنان زۆر جاران بە هۆی ئەرکی دووگیانی توانایی و ئامادەیی وەها ئۆتوریتەیەکیان نییە". بەو پێیە "ئۆتوریتە لە بنەماڵەدا لە ئەستۆی پیاوە" لەبەر ئەوەی کە "کاتێک کە هاوسەنگی و هاوکێشییەکی زۆر باش لە بنەماڵەدا هەیە، لەوانەیە ژن کتوپڕ ئەو هاوسەنگییە بشێوێنێ".[٧٥] لێرەدا ئەوە سەیرە کە ڕۆسۆ، کە بۆ خۆی هێزی ژیرێتی و بیرکردنەوەی ژنان بە شێوەی زاتی بەکەمتر لە هی پیاوان دەزانێ، بەڵام سەرنجی خوێنەرانی بەرەو هاوسەنگی ڕادەکێشێ.

وێڕای ئەم دوو بابەتە گرینگەی ئاماژەمان پێدان، ڕۆسۆ لە ئێمیل و "نامە بۆ دالامبێر"دا دەڵێ: "بەسەرنجدان بەو نەریتە کۆنەی کە لانیکەم لە ئەرەستۆوە هەتا ئێستا درێژەی هەیە و ئەو نەریتانە ئێستاکەش زیندوون، هێزی عەقڵ و ژیرێتی ژنان لاواز و نزمە و دەگەڵ هێزی عەقڵانییەتی پیاو جیاوازیی هەیە. عەقڵی ژنان بۆ بیرۆکەی بێخەوش و ڕەبەن (محض)، داهێنان و خوڵقاندن، بڕستی نییە و کەموکورتیی هەیە.[٧٦] ڕۆسۆ لەم بارەیەوە لە ئێمیلدا ئەوە بیر دەخاتەوە کە: "عەقڵی ژنان عەقڵێکی پراکتیکی و ئەزموونییە و ئەو عەقڵە هێز و توانایی دۆزینەوە و درکی حەقیقەتەکانیان پێ نادا. بەڵام لەبەرامبەردا بەرەو تێگەیشتن لەو بابەتانە ڕێنوێنییان دەکا کە خۆیان لە شتەکان وەردیدەگرن."[٧٧]

هەروەها دەڵێ: "وەکی پیاوان دەتوانن دەستیان بە یاسا و پرەنسیپەکان رابگا، ژنان ناتوانن دەستیان پێیان رابگا. ئەگەرچی ئەوان باشتر لە وردەکارییەکان تێدەگەن" رۆسۆ لە ئێمیلدا بەراشکاوی دەڵێ: "لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی رووت و تیۆریی پرسە بەڵگەنەویستەکان و یاساگشتییەکان لە زانستدا، بە تەواوەتی لە بیاڤی هزریی ژناندا جێی نابێتەوە. لەبەر ئەوەی کە تاوتوێکردنی ئەوانە پەیوەندیی بە کاروباری کردەیی (پراکتیک) و ئەزموونییەوە هەیە. ژنان ئەوەیان لەسەرە کە ئەو یاساگشتییانە قبووڵ کەن و دەکاریان بکەن کە پیاوان دۆزیویاننەتەوە."[٧٨]

هەڵبەت لە روانگەی رۆسۆوە: "هونەری بیرکردنەوە بۆ ژنان شتێکی سەیر و سەمەرە نییە، کەچی ئەوانە واباشترە بە شێوەی رووکەشیانە زانستی لۆژیک بخوێنن"[٧٩]

لە تەواوی نووسراوەکانی رۆسۆدا ئەو راستییە بەدی دەکرێ کە قسەکردن لەسەر تواناییەکانی ژنان شتێکی بێ بنەمایە، بەڵام ئەوەی کە بە شێوەی گشتی گرینگ دەنوێنێ و واباشترە سەرنجی بدرێتێ، ئەو بابەتەیە کە لەڕوانگەی رۆسۆوە ژن هەم لە باری زەینی و هەم لەڕووی جەستەییەوە دەبێ گوێڕایەڵ و پەیڕەوی پیاو بێ و بەدڵخوازی ئەو بجووڵێتەوە. یادداشتەکەی ژولی بۆ سەنپێرو بێگومان هەڵوێست و تێڕوانینی رۆسۆ لە هەمبەر ئەرکەکانی ژنان بەنیسبەت پیاوان و هۆی ئەم ئەرک و بەرپرسیارەتییانە روون دەکاتەوە و هەروەها نکوڵی دەکا لەم بۆچوونەی ئەفلاتوونیش کە پێی وابوو "ئەگەر جیاوازیی نێوان ژنان و پیاوان کەمە؛ واباشترە ئەوان پەروەردەیەکی یەکسانیان هەبێ ". رۆسۆ لە زمانی ژولییەوە نارەزایەتیی خۆی بەنیسبەت بۆچوونەکەی ئەفلاتوون دەردەبڕێ و بۆ گراوییەکەی خۆی دەنووسێ: "ئاشکرایە" مەبەست لە سروشت و "مەبەستی خوڵقێنەر" ئەوەیە کە نابێ دوو رەگەز یەکسان و وەک یەک بن، چونکە "خودا" و "سروشت" وایان لە چارەی ژن نووسیوە کە ئەوان بۆ هاوسەرێتی، منداڵ بەخێوکردن و ماڵداریی بخوڵقێن و پیاوانیش بۆ کارکردن لە دەرەوەی ماڵ. هەروەها رۆسۆ لە هێلۆییزی نوێدا دەڵێ: "لاساییکردنەوەی رەگەزێک لە رەگەزێکی دیکە ئەوپەڕی گەمژەیی و نەزانییە... و ژن و پیاوێکی



کامڵ و پێگەیشتوو؛ چ بە شێوەی دەروونی و چ بەشێوەی رواڵەتی؛ نابێ پێکەوە یەکسان و وەک یەک بن.[٨٠]

جان جاک رۆسۆ لە سەردەمی پێگەیشتوویی خۆیدا زۆری حەز لەو باسانە نەبوو کە"توانا سروشتییەکانی ژنان ئەو هێزەیان پێنادا بگەنە مەبەست". بەڵام لە لایەکی دیکەوە سەرنجی خوێنەرانی خۆی بەرەو رۆڵی ئافرەت وەک بوونەوەرێکی گوێڕایەڵ و ژێرچەپۆکە رادەکێشێ کە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پیاوی بنەماڵەی باوک مەزنە و پارێزگاری دەکا لە گەوهەری کچێنی (بکارت)ی خۆی. ئەو سەرەتا سەبارەت بە ئاوەزو عەقڵی کچانی کەم تەمەن (منداڵ) دواوە کە ئاوەزی ئەوان لە چاو تەمەنیان لە کوڕان بەهێزترە و بەخێرایی دەگەڵ ئەرکەکانیان ئاشنایان دەکا. هەروەها کچان هەر لە سەرەتاوە دەزانن کە چۆن گەوهەری کچێنیی خۆیان بپارێزن کە سروشت پێی بەخشیون. بۆ وێنە ژولی دەڵێ: "ئاوەزمەندیی لە ئافرەتاندا زووتر دەپشکوێ و خێراتر دەژاکێ وەک پەلکی گوڵە بەرۆژەیەک کە ناسک و لاوازە. لاوازییەکەی پەلکی گوڵەبەڕۆژە لەوەدایەکە خێرا هەڵدەدا و زوو لە ناو دەچێ. لەبەرامبەردا، داری بەڕوو وانییە، [پیاوان بەداری بەڕوو شوبهێندارون. و. ک]. ئێمە ئافرەتان لە سەرەتاوە تێگەیشتین کە گەنجینەیەکی پڕمەترسی لە زاتی ئێمە دایە کە پاراستنی ئەم هەستە؛ هەستی جیاکەرەوەیی و ناسینمان زووتر رادەپەڕێنێ."[٨١]

"کاتێک عەقڵی ئافرەت بەڕادەی پێویست گەشەی کرد؛ پێویستە تێ بگا کە چۆن بەهەر نرخێک بێ کچێنی خۆی بپارێزێ. ژنان دەبێ تا ئەو دەمەی دڵنیا دەبن لەوەی کە بوونەتە دایکێکی بەرپرسیار و هاوسەرێکی باش، گەوهەری کچێنی خۆیان بپارێزن. کاتێک ئەو پرسیارە دێتەگۆڕێ کە؛ ئایا ژنان عەقڵێکی بێخەوش و پتەویان هەیە؟ دەمودەست پرسیارگەلێکی دیکەش هەروژم دێنن کە "ئایا پەروەردە و گەشەی عەقڵ بۆ ژنان پێویستە؟ ئایا پەرەپێدانی (عەقڵ) بۆ ئەم ئەرکەی لە ئەستۆیانە، قازانجی هەیە؟"[٨٢] رۆسۆ لەم پرسیار و وەڵامانە بەو دەرەنجامە دەگا کە ئەگەر ژنان هێزی بیرکردنەوە و عەقڵانییەتیان هەیە؛ واباشترە تەنیا بۆ ئەوە پەروەردە بکرێن کە ئەرکەکانیان بەباشی بەڕێوە بەرن (پاراستنی کچێنی یەکێکە لەو ئەرکانە).

هەروەها رۆسۆ دوو ڕەگەزی پیاو و ژن لە باری عەقڵی و ئەخلاقییەوە بە تەواوکەری یەکتر دەزانێ. ئەو لە ئێمیلدا دەڵێ: "تاک بە تەنیا بوونەوەرێکی تەواو و کامڵ نییە، ژن و پیاو بە یەکەوە دەتوانن بوونەوەرێکی رێکوپێک و تەبا و کامڵ پێک بێنن. "ژنان زیاتر ملکەچن و پیاوان پتر خوڵقێنەر. ئەوان چاولێکەرن، بەڵام پیاوان هزرڤان و بیرمەند. بەو پێیە ئاکامی ئەم هاوکارییە گەیشتنی نەژادی مرۆڤە بەزانستی کامڵ و تەواو."[٨٣]. بەڵام ئەو شێوە تێڕوانینەی رۆسۆ کاتێک دەچێتە نێو بیاڤی ئەخلاقییەوە؛ دەبێتەوە تەعبیرێکی نادروست. بۆ وێنە ئەو لە ئێمیلدا دەنووسێ: "پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی رەگەزەکان شتێکی سەیر و سەمەرەیە. لە هاوکاری و پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی ژن و پیاو بەو دەرەنجامە دەگەین کە ژن بوونەوەرێکی ئەخلاقییە، ژن وەک و چاوە و پیاو وەک و شان و باهۆ. بەستراوەیی یەکێکیان بە ئەوی دیکەوە ئەوەیە کە پیاو ئەو شتە فێری ژن دەکا کە دەبێ ببینێ و ژن ئەو شتە فێری پیاو دەکا کە دەبێ بەڕێوەی بەرێ.[٨٤] هەروەها زەماوەندکردنی ژولی دەگەڵ ئۆلمارwolmar سەرسوڕهێنەرە، چونکە ژولی لەم بارەوە دەڵێ: "ئێمە عەقڵێکین لە دوو جەستەدا، ئەو [پیاو] تێدەگا و من هەست پێدەکەم".[٨٥] ژولی بە پیاو رادەگا و ئیلهامدەر و پاڵنەرێتی، کەچی ئۆلمار بیردەکاتەوە و بڕیاردەدا. هەروەکی جودیت شکلار Judith shklar ئاماژەی پێکردووە، رۆسۆ خۆ دەبوێرێ لەوەی: "ژیانی هاوبەش تەواوکەری ژن و پیاوە" و شتێکە پەیوەندیی بە نەریتەوە هەیە."[٨٦] چونکە رۆسۆ باوەڕی وایە کە "ئەگەر ژنان و پیاوان بە شێوەی سروشتی تەواوکەری یەک نەبوایەن؛ زەماوەندکردن کە خۆی کۆڵەکەی بەردەوامیی هەر کۆمەڵگایەکە، دەکەوتە مەترسییەوە. ئەگەر پیاوان و ژنان هەرکام خاوەنی عەقڵێکی کامڵ و تەواو بوایەن بەجێی بەستراوەیی بەیەکترەوە و بەجێی ئەوەی پێویستیان بە یەکتر هەبێ، لە ناتەباییەکی نەبڕاوەدا دەژیان و هیچ پەیوەندییەک لە نێوانیاندا پێک نەدەهات.[٨٧]

رۆسۆ نکوڵی دەکا لەوەی کە: "یاساکانی سروشت بەو جۆرەی کاریگەرییان بەسەر پیاوانەوە هەیە ئاوا لەسەر ژنانیش گاریگەرن". هۆی حاشالێکردنەکەشی ئەوەیە کە باوەڕێکی پتەوی بە بنەماڵەی باوک مەزنی هەیە. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ژنان لە هەموو ئەندامانی بنەماڵە پتر بەملکەچ و چاو لە دەستی



پیاو لەقەڵەم بدا و بڵێ: "باسکردن لەسەر یەکسانی و نایەکسانی باسێکی بێسەمەرە چونکە جارێک؛ کەسێک (سروشت) ئەوەی فێر ژن کردووە کە حەزی لەو شتەبێ کە بتوانێ بە مەبەستی کردەی سێکسی سروشتی و دایکایەتیی خۆی بەڕێوەی بەرێ[٨٨].

رۆسۆ دوو سیستەمی پەروەردەیی و راهێنانی لێکجیا و جیاوازی بۆ کوڕان لەبەر چاو گرتووە. سیستەمێک بۆ ئەو کوڕانەی دەیانهەوێ وەک هاووڵاتییەک بژین و سیستەمێکن بۆ ئەوانەی حەزیان لێیە لە داهاتوودا ببنە پیاوێکی سروشتی و سەرخۆ.

بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا تەنیا یەک جۆر سیستەمی پەروەردەیی بۆ کچان پێشنیار دەکا کە شیاوی ئەوان بێ. هەروەکی لە داهاتوو (لاپەڕەکانی دوایی)دا دەیبینین رۆسۆ جۆرە سیستەمێکی پەروەردەیی لەبەر چاوە کە لە راستیدا سیستەمی پەروەردەیی تایبەت بە "ژنی سروشتییە" و بابەت و وانەکانیشی بریتین لە؛ پاراستنی داوێن پاکی، شەرم و حەیا و ملکەچی و چاو لەدەستی و باوەڕە زاڵ و باوەکانی سەردەم. رۆسۆ هیچ دەستکەوتێکی لەم جۆرە سیستەم و شێوەی پەروەردەیە نەبوو. بۆ وێنە پەروەردە و راهێنانی سۆفی کە پەروەردەیەکی بەر چاوتەنگانە و پاوانخوازانە و لە پێناو بەرفەرمی ناسینی تەنیا مافێک بوو بۆ ئافرەت، تووشی شکست و هەرەس هات. پێشتریش ئاماژە بەو بابەتەکرا کە مەسەلەی ئێمیل تەنیا شێوەی پەروەردە و فێرکردن نییە، بەڵکو رەخنەگرتنە لەو ژیارەی کە شێوەی ژیانی "پیاوی سروشتی" تووشی گەندەڵیی کردن. رۆسۆ دەنووسێ "ئەوەی لەلایەن خوڵقێنەرەوەیە باش و دڵخوازە؛ بەڵام کاتێک شتەکان دەکەونە بەردەستی مرۆڤ، گەندەڵ دەبن.. مرۆڤ توانیوێتی سەگ، ئەسپ و... لە حاڵەتی سروشتیی خۆیان بێنێتە دەرێ بۆ ئەوەی گوێڕایەڵیان بکا و بیانکاتە کۆیلەی خۆی. مرۆڤ خۆیشی وەک ئەسپ بارهێناوە و پەروەردەکردووە، وەکوو دارێک کە لە باخدا پەروەردە دەکرێ.[٨٩]

بەڵام ئێمیل کوڕێکی ناوازە و لەش ساخە. ئەو لە ژینگەیەکی دوور لە دەمار گرژیدا پەروەردە دەکرێ نەک لە شوێنێکدا کە لە چاکە و راستییە سروشتییەکان بەتاڵی بکەنەوە و بیکەنە بوونەوەرێک کە وەڵامدەری ویست و حەزەکانی

ژیارێکی گەندەڵ بێ. تەنیا ڕێگای دەرباز بوون ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە منداڵ دەگەڵ تواناکانی خۆی ئاشنا کەین و چاوگەی سەرەتایی خۆی واتە سروشتی وەبیر بێنینەوە و هانی بدەین پەرەبدا بە هێزە سروشتییەکانی.

پێناسەی ڕۆسۆ لە پیاوی سروشتی، پێناسەیەکی ناکۆتایە چونکە بەڕای ئەو پیاو مرۆڤێکە؛ کە هەتا ئەو جێیەی بخوازێ و بتوانێ، ئازادە.

## ئەرکی ژنان

لە دەزگای هزریی ڕۆسۆ و لە پرسی مرۆڤی سروشتیی ئەودا، بوونەوەرێک بە ناوی ژن بەدی ناکرێ و نییە. چونکە پێگەی ئەو بوونەوەرە لە ریزی ئەو شتەدایە کە بەدەست پیاوەوەیە و هی پیاوە. ڕۆسۆ لە ناتەبایی و دژوازییەکی تەواو دەگەڵ پیاودا پێناسەی ژن دەکا و دواجار بەپێی ئەو واقیعەی کە هەیە وای لێدەکا دەگەڵ ئامانجەکانی ژیانی پیاو یەکبگرێتەوە. بۆ وێنە؛ پەروەردەی ژن دەبێ بە تەواوەتی دەگەڵ ئەو ئەرکانە یەک بگرێتەوە کە لە ژیاندا خراونەتە ئەستۆی، ئەرکگەلێک کە بۆ ئەو گەلاڵەی داڕێژراوەو پێی گوتراوە.

باسی پێویستیی کۆمەڵایەتیی بنەماڵەش لەبەر ئەوەیە کە ڕۆسۆ بێگومان، پێویستیی ڕەوشی ملکەچبوون و گوێڕایەڵیی ئافرەت لە بنەماڵەدا بەشتێکی بنەمایی دەزانێ و وەک پرەنسیپێک لێی دەڕوانێ و ئەم دەرەنجامەی لێ وەردەگرێ کە میتۆد و بڕیارە پەروەردەییەکانی پەیوەندیدار بە ژنان، ڕاستەوخۆ پەیڕەوی ئەم پرەنسیپە واتە ئەسڵی گوێڕایەڵی دەکا. هەروەکی لەلایەن چەند قوتابییەکی ڕۆسۆوە ئەم مەسەلەیە پشتڕاست کراوەتەوە پەروەردەی ژنان بەپێی پرەنسیپگەلێکە کە ڕاستەوخۆ دژە دیوی (متضاد) ئەم پەروەردەیەیە کە ڕۆسۆ بۆ پیاوان خستوویەتەڕوو.[٩٠] لە فەلسەفەی ڕۆسۆدا؛ دژوازی و ناتەبایی پەروەردەی ئێمیل، لەسەر توانا نەناسراوەکانی پیاو دامەزراوە، کەچی سۆفی بەپێی ئەو ئەرکانە پەروەردە دەکرێ کە لەوەپێش بۆی دیاریکراوە. ئەم ئەرک و بەرپرسیارەتیانەش لە کتێبی ئێمیلدا بەروونی هاتوون و بەمجۆرەن: "تەواوی پەروەردە فێرکارییەکانی ژنان دەبێ لە پەیوەندی دەگەڵ پیاواندابێ، بۆ حەساندنەوە و چێژبەخشین بە پیاوان. پەروەردەی ئەوان دەبێ پەروەردەیەک



بێ کە بۆ پیاوان بە کەڵکە و دیارە بەکەڵک بوونی ژن پەیوەندیی بە دابینکردنی ویستەکانی پیاوەوە هەیە. جێیی متمانە بوون و ئەمانەتدار بوون بۆ پیاوان، پەسندبوونیان لە بەردڵی پیاوان و پەروەردە کردنی پیاوان لە منداڵییەوە، چاودێری و پاراستنیان لەسەردەمی پیریدا، دڵدانەوەیان و بەچێژکردنی ژیانیان؛ تەواوی ئەوانە ئەرکگەلێکن کە لە هەموو کاتێکدا لە ئەستۆی ژنانە. [بۆیە] دەبێ هەر لە سەردەمی منداڵییەوە دەگەڵ ئەم کارانە ڕایانبێنن. هەتا ئەو دەمەی ئێمە ئەم بنەما و پرەنسیپانە لە بەرچاو نەگرین هەروا دوور دەبین لە ئامانج و مەبەستەکانمان و هەر بڕیار و پەروەردە و ڕاهێنانێکیش کە بەمەبەستی بەختەوەریی ژنان و بەختەوەریی خۆیشمان فێری ژنانی بکەین، بێ کەڵک و بێ سەمەر دەبێ.[٩١]

پێشگرتن لە هەر چەشنە پەروەردەیەکی ڕۆشنگەرانە و تەنیا بەکارهێنانی پەروەردەیەک کە دەگەڵ "ئەرکە سێکسییەکانی" ژنان یەک بگرێتەوە؛ تەواوی فەلسەفەی گشتیی پەروەردە و فێرکردنی ڕۆسۆ لە خۆ دەگرێ. ئەو بۆیە ئەم میتۆدەی پەروەردە و ڕاهێنانی هێنایە گۆڕێ، چونکە باوەڕی وابوو کە ئەم میتۆدە تەنیا ڕێگاچارەیەکی ڕەزامەندی هێنەرە کە دەتوانێ ژنان لە گەندەڵییە کۆمەڵایەتییەکان دەربازبکا. بەواتایەکی دیکە؛ لە ڕوانگەی ڕۆسۆوە ژێر دەستەبوون، ملکەچ و گوێڕایەڵ بوون، قبووڵکردنی ئۆتوریتە و هێژموونیی ڕەهای مێردو تەرخانکردنی ژیان بۆ بەخێوکردنی منداڵ، ئەرکگەلێکی سروشتین کە ژن لە ژیانی خۆیدا لە ئەستۆیەتی و بەرعۆدەیانە.

## بیروڕای گشتی و ویژدان

مەسەلەیەکی گرینگی دیکەی کە ڕۆسۆ ئاوڕی لەویش داوەتەوەو بایەخی پێداوە ویژدان و بیروڕای گشتییە.

ڕۆسۆ باوەڕی وایە کە ژن دەبێ لە باری ویژدانییەوە پەروەردە بکرێ و بخرێتەوە بەرجۆرە پەروەردەیەکی ویژدانییەوە هەتا لە بەرامبەر زانستی باوی نێو ئەم سیستەمە مەدەنیەی هەڵیدەفریوێنێ و هەستی دەمارگرژیی دەبزوێنێ و دواجار بەلاڕێیدا دەبا، بیپارێزرێ. بەواتایەکی دیکە ژن دەبێ بۆ ئەوە پەروەردە

بکرێ کە فێربێ چۆن ویژدانی خۆی دەگەڵ بیروڕای گشتی واتە "داوەریی گشتی لەسەر رەفتارەی ئەو" رێکبخات و هاوتەریبی بکا. ئەگەر بیروڕای گشتی لە دژی ویژدانی ژن بێ؛ دیارە کەموکوڕییەک لە ئاکاری ئەودا هەیە کە دەبێ دەمودەست چارەسەر بکرێ. رۆسۆ بەبێ لەبەر چاوگرتنی "گەشەپێدانی زەین و عەقڵی ژن"[٩٢] ئەم جۆرە پەروەردەیە بەکارێکی ئەستەم دەزانێ.

لە بەشی هەشتەمی ئەم کتێبەدا کە لەسەر چارەنووسی دوو پاڵەوانی رۆسۆیە؛ درێژە بەم باسە دەدەین و دەریدەخەین کە رێکخستن و پێکهێنانی ویژدانی تاک و بیروڕای گشتی کارێکی نەکردەیە ناکرێ.

## پێگەی شیاوی ژن لە کۆمەڵدا

رۆسۆ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە پێگەی شیاو و گونجاو بۆ ژنان لە نێو کۆمەڵدا چییە؟ و کوێیە؟ دەڵێ: "تەنیا وەڵامی پڕبەپێست؛ میتۆدی یۆنانییەکانە"[٩٣] کە پرسیارەکانیش لە خۆ دەگرێ. ئەو لە "نامە بۆ دالامبێر"دا دەنووسێ: "لەباری ئەخلاقییەوە باش نییە کە ژن لە دەرەوەی ماڵێ بژی."[٩٤] رۆسۆ وێڕای پشتڕاستکردنەوەی ئەسڵی پریکلێس سیاسەتڤانی ئەسینی، سەربارەت بەوەی کە ژنی باش دەبێ بەردەوام بێدەنگ بێ؛ بۆچوونەکەی ئەرستۆ لە زمان خۆیەوە بەمجۆرە دەگێڕێتەوە کە: "هەروەکو فەیلەسووفانی رابردوو (ئەفلاتوون و ئەرستۆ) گوتوویانە، ژنی رەبەن دەبێ خۆی دەگەڵ لایەنی ژیانی نێوماڵێ رابێنێ و لە ماڵێدا بمێنێتەوە و هەرکات ئەو کەشە بوو بەهی خۆی (شووی کرد) دەبێ لە ژێر یاسای زاڵی پیاودا درێژە بە ژیانی خۆی بدا[٩٥].

رۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە گەلاڵەی گۆشەنشینیی تەواو لە ماڵێدا و قەتیسمانەوە لە نێوماڵدا؛ "میتۆدی ژیانێکە کە سروشت و عەقڵ بۆ رەگەزی مێینەی دەستنیشان کردووە."[٩٦] بەو پێیە سروشت نەک هەر متێودی پەروەردە و فێرکردن و شێوازی ژیانێکی تەواو لێک جیاوازی بۆ دوو رەگەزە کە دەستنیشان کردووە بەڵکو جەختی کردووەتەوە کە ئەوان دەبێ زۆربەی ژیانی خۆیان بە جوێ لە یەکتر تێپەڕکەن.



## هەڵاواردنی* ژن لە پیاو

رۆسۆ لە نامە بۆ دالامبێردا دەنووسێ: "ئێزن بدەن بەپێی حەز و ویستەکانی سروشت بڕوینەپێش، ئێزن بدەن باس لە بەختەوەریی کۆمەڵ بکەین. ژن و پیاو پێویستە جاروبار پێکەوەبن [بۆ کردەی سێکس]، بەڵام بە شێوەی ئاسایی دەبێ بەجوێ لە یەکتر بژیین."[٩٧]. ئەوە هەمان ئەو سیستەمە کۆنەیە کە تاریف و پەسنی دەکراو رۆسۆ داکۆکیکاری بوو و بووە هۆی ئەوەی کە تاریفی "تەلاری پیاوانە "ژێنێڤ" یەکان بکا، چونکە لە روانگەی ئەمەوە؛ "ژێنێڤ" یەکان، رێ و شوێنێکییان دۆزییەوە کە بە پێی ئەو پیاوان دەتوانن؛ بە ئازادی و بە دوور لە قریوە و چەنەلێدانی ژنان، پێکەوەبن. پیاوان دەتوانن سەبارەت بە شتەگرینگەکان پێکەوە راوێژ بکەن، لە حاڵێکدا ژنان، بەو پشتەسەرقسەکردنەی (غیبت کردن) کە فێری بوون خەریکی رابواردنی خۆیانن لە ماڵێدا". رۆسۆ باوەڕی وایە کە هاوژینیی بەردەوامی دوو رەگەز، نەک هەر دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی پیاون لە بنەما ئەخلاقییەکان بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی پیاوەتییەکەشیان لە دەست بدەن. ئەو لە "نامە بۆ دالامبێر" دا لە مەڕ ئەم مەسەلەیەوە دەنووسێ: "ئەوان [پیاوان] لە هاونشینی و تێکەڵاویی دەگەڵ ژناندا ناتوانن خۆیان وەک پیاو پەروەدە بکەن، بەڵام ژنان دەتوانن ئێمە بێنە سەر بیچم و شێوازی خۆیان."[٩٨]

رۆسۆ لە وەڵام بۆ جوابە جەنگێی کەسێک بە تەلاری ژێنێڤییەکان، دەنووسێ: "رێگەیەکی دیکە بدۆزنەوە بۆ ئەوەی پیاو بتوانێ بەجیا لە ژن؛ بژی."[٩٩] لە هیلیۆییزی نوێدا، بنەمای "ئەخلاقی شیاو"[١٠٠] لە ژیانی جیا لەیەکتردا گەشەی کردووە. لە وێدا، ژولی و مێردەکەی تا ئەو کاتە پێکەوە دەژیین کە سروشت بە پێی ئەرکی جیاواز ویست و حەزی پێ بەخشیون؛ بەڵام ئەوان هەرگیز کارێکی وا بەڕێوەنابەن کە وەک یەک بچن (کاری وەک یەک ناکەن). [١٠١] هەر دووکیان واتە ژولی و ویلمار ئەو شێوازە ئەرکی جۆێی بوون و ئەرکی تەواو لێک جیاوازەی هەیانە؛ پێیان باشترین شێوەی سروشتیی ئەویندارى و ژیانی هاوبەشی و ژن و لە شێوازی. بە پێی بنەمای "رەوشت پاکی" (ئەخلاق پسندیدە) تەنانەت خزمەتکارەکانیش بێجگە لەوکاتەی چێشت دادەنێن یا لە میواندارێتیدا

* هەڵاواردن: جوێ کردنەوە – جیاکردنەوە

خەریکی خزمەتن دەبێ تەواو لە یەکتر جوێ بن و بەپێی ڕەگەزی خۆیان بە جیا بژین بۆ ئەوەی بەو جۆرە بکرێ دڵنیابین لە داوێن پاکی و بێخەوشی، کە بەشێکن لە بنەما ئەخلاقییەکان و پێویستە بپارێزرێن. ڕۆسۆ ئەم ڕێکوپێکییەی لە کلارێنس clarens دا هەیە بەباش دەزانێ و پەسنی دەکات و باوەڕی وایە کە: "لە بنەماڵەیەکدا کە پلان و بەرنامەکانی ڕێکوپێکبن ژن و پیاو دەبێ کەمتر پەیوەندییان پێکەوە هەبێ."[١٠٢]. زۆر جێی سەرنجەکە لە زمانی پێرو؛ گراوییەکەی ژولییەوە تاریفی شێوەی ژیانی بە تەنیای وێلمار (مێردی ژولی) دەکاو دەڵێ کە بێجگە لە فەرەنسا و چەند وڵاتێکی دیکەی لەم چەشنە؛ "ئەم جۆرە ژیانە بۆتە نەریتێکی جیهانی بۆ خەڵک و ئەم دەرەنجامەی لێوەردەگرێ کە ئەم شێوە ژیانەی نەریتێکی جیهانیی لێدەکەوێتەوە زۆر سروشتییە و لەم وڵاتانەشدا کە لێکدانەوەی خراپیان بە نیسبەت ئەم میتۆدەوە هەیە؛ نیشانە گەلێکیان لە ژیانی بەجوێ بەمیتۆدی جۆراوجۆر هێناوەتە گۆڕێ." باسێکی تەواو نائاساییە، چونکە ئەو پێشتر سەبارەت بە ئیدعاکەی جۆن لۆک کە بنەماڵەی بەواقعێکی سروشتی دەزانی گوتبووی :"سروشت، بێجگە لە سروشتی بوونی بنەماڵە؛ هەروەها کۆمەڵگای شارستانی، هونەرەکان، بازرگانی و هەرچی بۆ مرۆڤ باش و بەکەڵکە دەیخولقێنێ و دروستی دەکا."[١٠٤]

لە کۆتایی دا دەبێ باس لەوە بکەین کە ڕۆسۆ سەبارەت بە هەردووک لێدوانەکەی خۆی کە لەسەر ژنان کردوونی، واتە بەکارهێنانی پێناسەی "پیاوی سروشتی" کە پیاو لە بنەماڵەدا ڕۆڵی باوک مەزنی دەبینێ و ژنیش کە ملکەچ و گوێڕایەڵە و هەروەها لەو باسەشدا کە لەسەر ڕۆڵی ژن و ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتیانەی سروشت بەپێی تایبەتمەندییە ڕەگەزییەکان خستوویەتە ئەستۆی؛ تووشی شکستێکی گەورە دێ. ڕۆسۆ هەروەکی ئاماژەمان پێ کرد بە شێوەیەکی فێڵبازانە و دووڕوویانە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانی خۆی ئاماژە بە ئەزموونگەلێک دەکا کە لە جیهاندا بە نیسبەت میتۆدی ژیانی ڕەبەنی و لێک جوێ بوونی ژن و پیاو لە ئارادان و باون. ئەو هەروەها لە خستنەڕووی تیۆریی پەروەردەو ڕاهێنانەکەیدا کە لەوێدا ژنان وەک بوونەوەرگەلێکی ژێردەستە و پلەدوو دەناسران و لە هێنانە گۆڕێی تیۆریی لێوەشاوەیی و



شیاویی ژیانی لێکجودای ژن و پیاوو هەروەها ئەوەی کە ژنانی پەروەردە کراویش تەنانەت شیاوی ئەوەنین هاوەدەمی ژیانی ڕۆژانەی ئەو پیاوانەبن وا کۆمەڵگا پێویستیی پێیانە، تووشی کوێرەڕێ (بن بست) و دۆخێکی دژوار دەبێ. ئەو بە ناچاری بۆ دەربازبوون لەم کێشە و گرێ کوێرەیە پێشنیاردەکا کە جوێ کردنەوەی ژن و پیاو لەیەکتر؛ لە زۆربەی کاتەکاندا، نەک هەر ویست و بەرژەوەندیی کۆمەڵگای لە پشتە، بەڵکو ئەوە ژیانێکی سروشتییە وا دەخوازێ.

# بەشی دووەم:

## ئازادی و یەکسانی بۆ پیاوان

بابەتی ئەم بەشە؛ تاوتوێکردنی روانگەی جان جاک رۆسۆیە سەبارەت بە ئازادی و یەکسانی وەک دوو بەهای زۆر گرینگ و پڕ بایەخ و باو لە فەلسەفەی سیاسیی ئەودا. لێرەدا، بەڵام دەبێ ئاماژە بە خاڵێکی زۆر ورد بکەین؛ ئەویش ئەوەی کە رۆسۆ تەنیا بۆ پیاوان ئەم دوو تایبەتمەندییە بەنرخە بەپێویست دەزانێ؛ کەچی بەگشتی سەبارەت بەژنان هەر لەبەرچاوی ناگرێ؛ لەبەر ئەوەی کە رۆسۆ باوەڕی وایە کە بەپێی زات و سروشتی ژنان؛ ئازادی و یەکسانی توخمگەلێکن کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ژیانی ژنانەوە نییە و ئەوان ناگرنەوە.

یەکێک لەو بابەتانەی رۆسۆ بەردەوام لە بەرهەمەکانیدا دەی هێنێتەوە؛ مەسەلەی نایەکسانیە، کە لە کۆمەڵگای ئەوکاتدا بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئارادا بوو و بووە هۆی ئەوەی کە بۆ رۆسۆ ببێتە مەسەلەیەکی گرینگی فەلسەفی و لە رێگەیەوە بتوانێ بەپێک هێنانی سیستەمێکی سیاسی و بەنووسینەوەی یاسا؛ رادەی نایەکسانیی نێوان کەسەکان بەنزمترین ئاستی خۆی بگەیەنێ. رۆسۆ لە نایەکسانی بێزاربوو.

بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی ئەم بێزارییەش؛ دەبێ ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆی تاوتوێ بکەین.

جودیت شکلێر دەڵێ: نایەکسانی بەلای رۆسۆوە ئەزموونێکی کەسێتی (شخصی) و ئەستەم بوو، چونکە ئەم واقیعە لەلایەک نواندنێک (نمایش) بوو لە جڤاتێکی بێ بەزەو لە لایەکیشەوە وەڵامێک بوو، بۆ سووکی و بێ کاکڵیی کۆمەڵگا و ترسەکانی.[1] ترس لەو جامەلۆسکێ* یەی کە سەرەتا وەک قوتابی و

* جامەلۆسکێ: ریایی کردن، دەم تەڕی. (و. ک)



دواتر وەک خزمەتکار خرابووە ئەستۆی. رۆسۆ لە دانپیانانەکانیدا sontession سەبارەت بە سەردەمی منداڵیی خۆی دەڵێ: "لە ژیان و چالاکیی کۆمەڵایەتیدا نایەکسانی هەر هەیە و زیانی ئەم نایەکسانیەش هەمیشە وە لات* و لاوازەکان دەکەوێ."[٢] بەمجۆرە ئەو وای هەست دەکرد کە دیوی تاریکیی نایەکسانییە هەناوەکی (درونی)یەکانی ناسیوە، هەر بۆیەش لێیان بێزار بوو.

بەواتایێکی دیکە؛ رۆسۆ لە سەردەمی منداڵییدا، سەرەتا وەک شاگرد و دواتر وەک خزمەتکارێک ناچار بوو لەبەرامبەر ئەو دۆخە نایەکسان و تاقەتپرووکێنەدا کە گەورەکان بۆیان پێک هێنابوو؛ بکەوێتە جامەلۆسکێ و دەمتەڕی و ئەم دۆخە کە سەرباره بە باش و جوان لەقەڵەم بدا. بابەتی کتێبی "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی؛ لە راستیدا پەرچەکرداری رۆسۆیە بەنیسبەت ئەو نایەکسانییەی مرۆڤەکان لەبەرامبەر یەکسانیی سروشتیدا دایانهێناوە[٣]. بێ گومان بە شێوەی سروشتی لە نێو مرۆڤەکاندا جیاوازیی هەیە. بۆ وێنە: پێکهاتەی جەستەیی هێزی زەین و مێشک ورادەی ئەو هۆشیارییەی مرۆڤەکان هەیانە لێک جیاوازن و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پلانی کارو پەروەردەیان لێک جیاوازبێ. دەگەڵ پێکهاتنی پەیوەندییە سیاسی- کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان لە نێو مرۆڤەکاندا، نایەکسانیی نێوان کۆمەڵگاکانیش پتربوون و بووە هۆی ئەوەی کە کەسانێکی وەک رۆسۆ بۆ کەمکردنەوە و دۆزینەوەی چاوگەی نایەکسانی لە کۆمەڵگادا دەست بکەن بەلێکۆڵینەوە.

هەروەکی باسکرا؛ بە بۆچوونی رۆسۆ: "دڵگرترین و بەردەوامترین چاخ و باشترین بارودۆخ بۆ مرۆڤ" چاخی زێڕین بوو کە یەکسانیی زاتی و سروشتی، بنەماو یاساکانی ئەو سەردەمە بوون. ئەو پێی وابوو کە هێندێ رووداوی تێکدەر و کاولکەر بوونە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ لەم دۆخی (راستەقینە و یەکسانییە هەمیشە) یەیدا بێتە دەرێ و نایەکسانیی هەمیشە و نەبڕاوەی نێوان مرۆڤی لێبکەوێتەوە.[٤] لە روانگەی رۆسۆوە خاوەندارێتیی تایبەت، دابەشینی کار، دەستاو دەست کردنی کاڵا بەشێکن لەو رووداوانە و ئەو شتە کاولکارانەی کە

* لات: لە کوردیدا واتە زەعیف. دەڵێن: ئەوەندە لاتە سەگ کلکی لێدا دەکەوێ. (ک. و)

بوونە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەک لە پیاوان ببنە خاوەنی ئەو شتانەی خەڵکی دیکە پێویستیان پێیەتی و بە هۆی ئەوانەوە ببنەخاوەن سامان و هێز. بەواتایەکی دیکە، نایەکسانیی ئابووری لە نێو مرۆڤەکاندا (پیاوان) بووە هۆی ئەوەی کە یەکسانیی سەرەتایی و سروشتیی مرۆڤ لە ناوبچێ.

بەشی دووهەمی کتێبی " لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی" لە سەر نایەکسانیە سیاسییەکانە. بەو شێوەیە کە دەوڵەمەندان گرێبەست و یاساگەلێکی درۆیین بۆ خەڵەتاندنی خەڵک دادەڕێژن و لە ئاکامی بەڕێوەچوونی ئەو یاسایانەدا چینێک بەناوی هەژاران لە کۆمەڵگادا سەرهەڵدەدا و ڕۆژبەڕۆژ کۆت و بەندی کۆیلەیی هەژاری توندتر دەبێ. جەماوەری لە بنە نەهاتووی هەژاران لە فریوێکی مەزنی کۆمەڵایەتیدا، وادەزانن کە ئەم یاسایانە بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ئازادی و یەکسانی بۆ ئەوان داڕێژراون و دانراون. کەچی، لەراستیدا ئەم گرێبەست و یاسایانە بەدەستی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان تەنیا بۆ چەوساندنەوەو کارلێ کێشانی ئەوان دانراون و بوونەتە ئامرازێک بۆ ڕەوایی بەخشین بە بوونی دەوڵەمەندان لە کۆمەڵگادا. ڕۆسۆ لەم بارەیەوە ئەو دەرەنجامە وەردەگرێ کە: "ئەوەیە سەرچاوەی ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتی و یاسایانەی کە کۆت و زنجیرگەلی نوێی بۆ لات و هەژاران بە دیاری هێناوە و لە بەرامبەردا، هێز و گوڕێکی نوێی بە دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندان بەخشیوە. ئەم یاسایانە؛ ئازادیی سروشتییان بۆ هەموو سەردەمەکان لە ناوبردووە و یاسای هەمیشەیی خاوەندارێتییان داناوە. هەروەها ئەم یاسایانە؛ پێ شێل کردنی مافی یەکسانیی مرۆڤەکانیان کردووە بە ماف و یاساگەلێکی بێ ئەملاو ئەولاو نایەکسان بۆ تاقمێک پیاوی زێدەخواز؛ ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بێجگە لە کۆیلەیی و ژێر چەپۆکەیی و چارەڕەشی؛ بەرهەمێکی دیکەی لێنەکەوێتەوە."[٥]
ڕۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە هەموو دەوڵەتەکان وێڕای ئەو هەموو ئیدعایەی لەسەر ڕەوایی بوونیان هەیانە؛ دیسانیش لەسەر بنەمای فێڵ و گزە پێک هاتوون و بەپێچەوانەی کۆمەڵگا شارستانییەکان کە وادەنوێنن یەکسانیی پووچ و بۆشی مافی کەسەکانیان،[٦] کردۆتە واقیعییەت؛ تەنانەت نەیانتوانیوە ئەم یەکسانییە دەستەبەر بکەنەوە کە لە چاخی زێڕیندا هەبووە. چونکە لە راستیدا



دەسەڵات بەدەست ساماندار و دەوڵەمەندەکانەوەیە و ئەوانی والێکردووە بەوشێوە ڕواییەی هەیانە زوڵم لەهەژار و نەداران بکەن. بەو پێیە زۆرینەی جەماوەری خەڵک بەردەوام دەبنە قوربانیی ویستەکانی کەمایەتییەکان و بەرژەوەندیی تایبەت(تاک) دەکەوێتە پێش بەرژەوەندیی گشتییەوە. وشەگەلی "حەقیقی" و بەجێ وڕێی وەک عەدالەت و گوێڕایەڵی، بەردەوام وەک ئامرازەکانی سەرکوت، زوڵم و بێداری کەڵکیان لێوەردەگیردرێ. ئەم وشەو دەستەواژانە بەپێی ویستی چینە دەسەڵاتدارەکان و لە پێناو بەرژەوەندییەکانی ئەواندا پێناسەدەکرێن. ئەوان ئیدعا دەکەن کە لە خزمەتی خەڵکدان و لە بەرژەوەندیی ئەوان دان. بەڵام لەراستیدا هەڵیان دەخەڵەتێنن.[٧]

ڕۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕەیە کە سامان و دەسەڵات؛ مافی یاسایی دەگەڵ خۆیان دێنن چونکە هیچ مرۆڤێکی بەزیپکوزاکون (مقتدر) ئەوەندە بەهێز نییە کە بتوانێ دەسەڵاتێکی هەمیشەیی هەبێ؛ مەگەر ئەوەی کە لە ڕێگەی دووڕوویی و گزەوە، هێز و دەسەڵاتی خۆی بکاتە مافێکی ڕەوا و ملکەچ بوون و گوێڕایەڵی لەبەرامبەر دەسەڵاتەکەیدا بکاتە ئەرکی سەرشانی خەڵک. هیچ کەسێک لەسەر ویستی خۆی سەر لەبەر زوڵم و زۆر دانانوێنێ بەڵکو سەردانەواندن و قبووڵ کردنی ستەم خۆپاراستنە یا ئەوەی کە داسەپاوە و لە ناچاریە. بەو پێیەناکرێ ملکەچبوون لەبەرامبەر زۆرەملیدا بە ماف و حەق لە قەڵەم دەین[٨]. ڕۆسۆ لە درێژەی باسەکەدا دەڵێ: "هیچ کەسێک بە پێی سروشت مافی دەسەڵات کردن بەسەر ئەوەی دیکەیدانییە و هیچ دەسەڵاتێکیش نابێ لە زۆرەملییەوە سەرچاوە بگرێ." ئەو لەم بابەتانەوە بەو دەرەنجامە دەگا کە ڕێگەچارەی کێشەکانی دەسەڵاتی سیاسی؛ ڕەوایی پێ بەخشین و یاسامەندکردنێتی و ئەوەش لە ڕێگەی گرێبەندە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکانەوە دەکرێ و بەوشێوەیە دەسەڵاتی (حاکمیت) خەڵکی مسۆگەر دەبێ.

بەبێ وەها گرێبەندێک "سیستەمی سیاسی، حکوومەتێکی زاڵمانەیە کە لە ژێردەسەڵاتی ئەودا؛ بە ئاشکرایی دەستدرێژی دەکرێتەوە سەر مافەکانی خەڵک و کەڵکی خراپی لێوە دەگیردرێ."[٩]

ڕۆسۆ لە کتێبی یەکەمی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا لەم بارەوە ئەنووسێ: "پەیمانی کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینە (حقیقی) نابێتە هۆی لەناو چوونی ئازادیی سروشتی

بەڵکو لە بری ئەو نایەکسانییە جەستەیی و دەروونیانەی سروشت لە مرۆڤەکاندا پێکی هێناوە؛ جۆرە ئازادییەکی ئەخلاقی و (عورفی) دادەنێ. بەمجۆرە ئەو کەسانەی لە باری هێز و تواناوە لە ئەوانی دیکە جیاوازن پاش ئەم گرێبەستە دەبنە خاوەنی مافی کۆمەڵایەتیی یەکسان."[١٠]

سیستەمێکی سیاسی لەرێگەی رەوایی و ئەو هێزە یاساییەی کە هەیەتی دەتوانێ یەکسانیی سروشتی لە نێو مرۆڤەکاندا دابین بکا و کۆمەڵگایەکی شارستانیانە پێک بێنێ.

بەو جۆرە رۆسۆ ئامۆژگاریی ئەم "پۆلۆنی" یانە دەکا کە لە پەرلماناندا نوێنەرایەتیی خەڵکی خۆیانیان لە ئەستۆیە و دەڵێ: هەتا ئەو کاتەی زۆرینەی خەڵک قەرە* و رەعیەتن، نوێنەرایەتی کردنیان لەوەها دۆخێکی نایەکسانی سیاسیدا لە پەرلمان قەت رەوایی نییە و نابێ.

هەڵبەت رۆسۆ دان بەم راستییەش دادەنێ کە ئازادکردن و رزگارکردنی خەڵکی رعیەتیش کارێکی هێندە ساکار نییە. ئەو سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێ: "یاسای سروشت یاسایەکی نەمرو پیرۆزە......... ئەم یاسایە ئیزنی ئەوەمان پێنادا کە بەکەڵک وەرگرتن لە هێز و دەسەڵاتی خۆمان یاساگەلێک دانێین بە زیانی ئەو هەژارانەی مافی دەنگدانیان نییە و بەمجۆرە مافەکانیان پێ شێل بکەین."[١١] و هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: "قەرە و رەعیەتەکان، کەسانێک بوون کە تەواو ژێرچەپۆکەی بەگزادە و ئاغاوەتان و خاوەن کارەکانیان تەواو دەسەڵاتیان بەسەریاندابوو، ئەم رەعیەتانە لەپێشدا دەبێ لەباری رۆحی و جەستەییەوە لە کۆت و زنجیری ئەوان رزگار بکرێن و بەتەواوەتی بگەن بەمافی سیاسیی یەکسان".

بەپێی ئەو شتانەی گوتران وادیارە رۆسۆ بەزەحمەت و بە پارێزەوە؛ کۆیلەتیی بەشتێکی تەواو ناڕەوا"[١٢] زانیوە؛ ئەگەرچی ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە

* قەرە: لە سیستەمی ئاغا و رەعیەتیدا خەڵک دوو دەستەبوون (قەرە وجووتبەندە) جووت بەندە خاوەنی زەوی بوون و لەسەر زەویی خۆیان کاریان دەکرد. بەڵام قەرە کرێکاری ئاغاوەتان بوون و وەک کۆیلە دەژیان جیاوزییان دەگەڵ کۆیلە هەر ئەوەندەیە کە ئەوانە (قەرە) نەدەفرۆشۆان. (قەرە: رەشایی)



کە کۆیلەتی وێڕای ئەوەی سووکایەتییە بە یاسای سروشت؛ جەوهەرە و زاتی مرۆڤیش کە بریتییە لە ژیانی ئازاد؛ دەداتە دەست ئەوانی دیکەو مرۆڤ گەندەڵ دەکا. نابێ ئەو مرۆڤەی سروشت بە سەربەخۆی خولقاندووە و ویژدانی خۆی لە پەیوەندیی دەگەڵ ئەخلاقی ئەوانی دیکەدا کردوویەتە بەرپرسیاری رەفتار و ئاکاری خۆی؛ بێبەشی کەین لە مافی سەربەخۆیی و ئازادی. هەر وەکی لە پێشدا باسیکرا[١٣] پارادایمی یۆنانییەکان کە لە پێناو گەیشتن بە یەکسانی و مافی مەدەنیدا دەبووە هۆی کۆیلەکردنی ژمارەیەکی ئێجگار زۆری خەڵک؛ بەلای رۆسۆوە پارادایمێکی دڵخواز و باش بوو هەر بۆیەش ئەستەمە قبووڵی ئەوە بکەین کە رۆسۆ باوەڕی بەلابردنی یەکجاریی سیستەمی کۆیلەیی هەبووە. جان جاک رۆسۆ خۆی باش ئاگاداری ئەم واقعییەتەیەکە "کۆمەڵگای شارستانی (ژیاری)یش هەروەک زۆربەی شتەکانی دیکە لەو کاتەدا کە لە سروشت دادەبڕێ، گەلێک خەساری وێدەکەوێ و بەداخەوە یەکێک لەو زیانانە دامەزراندنی حکوومەتێکە کە تاقمێک بە چەوساندنەوە و کۆیلەکردنی ئەوانی دیکە دایدەمەزرێنن و دۆخێکی نادڵخواز و تاڵ پێک دێنن." رۆسۆ لە درێژەی ئەم وتارەدا دەڵێ: "لەم بارەیەوە خەڵک تەنیا بۆ پاراستنی ئازادییەکانی خۆیان؛ ئازادیی ئەوانی دیکە زەوت دەکەن و کیسە بۆ کۆیلەیی ئەوانی دیکە هەڵدەدوورن، هاووڵاتییان کاتێک دەتوانن تەواو ئازادبن کە کۆیلەکان بە تەواوەتی ئەرکەکانی خۆیان بەرێوەبەرن"[١٤]. دەبینین رۆسۆ هیچ کێشەیەکی دەگەڵ ئەم بیروبۆچوونە نییە کە تایبەتی یۆنانییەکان بوو. کاتێک دەگەینەسەر لێدوانەکانی ئەو سەبارەت بەژنان، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو بێبەزەییانە بەنیسبەت ژنانەوە کەڵکی لە پرەنسیپ و یاساکانی کۆیلەداریێتی یۆنانییەکان وەرگرتووە. چونکە ئازادی و یەکسانیی هاووڵاتیانی سپارتە؛ گرێدراوییەکی تەواوی بەکۆیلەکانەوە هەبوو، هەروەک چۆن لە سیستەمی باوک مەزنیدا ئازادی و یەکسانی پیاوان وەک گەورەی ماڵێ؛ بەستراوەیی و پەیوەندیی بەژنانەوە هەبووە. لە کۆماری ئایدیالی رۆسۆدا، ئازادی و یەکسانی بۆ پیاوان هەیە و ژنان لەوێدا نەک هەر مافی سیاسی و کۆمەڵایەتییان پێنەدراوە بەڵکو بەردەوام سەرکوتیش دەکرێن.

ئەو خاڵە لە روانگەی رۆسۆوە بایەخدار و گرینگە کە تەواوی یاساو بنەماکانی یەکسانی و ئازادی؛ دەگەڵ دەرکەوتەکانی و هەروەها رەوایی ئەم حکوومەتانەی لەسەر بنەمای ویستی گشتی پێک دێن وەک: دیاریکردنی مافی هاووڵاتی و یاسادانەری و دانانی گرێبەندە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان؛ هەر هەمووی بەدەست پیاون. لە بەرامبەردا ئەوەی کە ئەو بۆ ژنان لەبەر چاوی دەگرێ؛ بریتییە لە:

ژنان ئامرازێکن بۆ دامرکاندنەوەی هەستی پیاوان و کردەی سێکس دەگەڵ پیاوان و ئەوان دەبێ وەک کۆیلەیەک لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی سەرپەرشتیارەکەیان (پیاوان) دابن.[١٥]

ئەوان "زەعیفە" گەلێکن کە نازانن و تێناگەن مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان چییە و لە بن باڵی پیاودا نەبێ ناتوانن بژیین. لە خۆڕاوە نییە کە سروشت هۆشیارییەکی تایبەتی پێداون بۆ ئەوەی کەڵک لە جوانی و دڵڕفێنی و دڵگریی سێکسیی خۆیان وەرگرن و بتوانن بە مجۆرە و بە هۆی ئەو شتانەوە قەرەبووی ئەو هێزە بکەنەوە کە نییانە. هەڵبەت رۆسۆ هیچ کات سەبارەت بەو پیاوانەی لە خەڵکی دیکە لاوازتر و کەمتواناترن؛ نەیگوتووە کە ئەوان بۆ قەرەبووکردنەوەی خاڵە لاوازەکانی خۆیان پێویستییان بە عەقڵ و هۆشیاریی سروشتیی تایبەت هەیە چونکە بەڕای ئەو ، ئەوە پەیمانە کۆمەڵایەتییەکانن بە یەکسانییە مەدەنییەکان نایەکسانییە سروشتییەکانیان بۆ پیاوان؛ قەرەبوو دەکەنەوە. ئەگەر ژنان دژی ئەو زوڵم و زۆرەی لێیان دەکرێ؛ ناڕەزایەتی دەربڕن و نکوڵی لە دەسەڵات و ئۆتوریتەی پیاوان بکەن، بە سەربزێوو لادەر دەناسرێن و بەو پێیە دەبێ سزا بدرێن. رۆسۆ پێیوایە سروشت هێزی باڵاتری بە پیاوان بەخشیوە هەتا لە رێگەیەوە زاڵ بێ بەسەر ژناندا و بتوانێ بەخێویان بکا.

دووهەم_ رۆسۆ نکۆڵیی لە سەربەخۆیی و یەکسانیی مافی سیاسی_ کۆمەڵایەتیی ژنان کردووە؛ لەبەر ئەوەی کە رۆسۆ قەت لەسەر ئەم باوەڕە نەبووە کە ژنانیش وەک هاووڵاتییەک دەتوانن لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداری بکەن و مافی دەنگدانیان هەبێ.



هەڵبەت ئەو جارێک ئاماژە بە ژنانی "رووخۆش و چاکەکاری ژێنێڤی" دەکات کە بۆ وەدەسهێنانی پوان و وەک ئامرازێکی رەوا کەڵکیان لە پێگەی هاوسەرەکانیان وەرگرت و بۆ دەستەبەرکردنی ویست و پوانە گشتییەکان دەنگیان هەڵبڕی. لە وەها هەلومەرجێکدا هیچ پیاوێکی پێشکەوتوو (شارستانی) لە بەرامبەر دەنگی ناسکی هاوسەران و ئافرەتە بەنازەکاندا خۆی پێ راناگیرێ، هەر بۆیەش لە پێناو بەختیاریی دەوڵەت و دڵخۆشیی کۆمەڵگادا ویستەکانیان دابین دەکا.[١٦] لە کۆماری ئایدیالی رۆسۆدا، ژنانی "رووخۆش و چاکەکار"لە رێگەی پەیوەندیی ژن و مێردایەتییەوە کە تێیدا (کردەی سێکسی رۆڵێکی گرینگ دەبینێ) هەستی مێردەکانیان دەبزوێنن و بە نوێنەرایەتیی ئەوان لە کۆمەڵگادا، هێندێ پوان و پلە وەردەگرن. لەم کۆمارەدا هیچ گرێبەندو پەیمانێک لەسەر بنەمای یەکسانیی هاووڵاتییان دانەمەزراوە و لە گۆڕێدانییە بۆ ئەوەی ژنان لەو رێگەیەوە بتوانن بە مافە کۆمەڵایەتییەکانیان بگەن. بە پێچەوانەی قەرەکانی پۆڵۆنی؛ داوێن پاکی و چاکەکاریی ژنان هیچ مافێک بۆ ئەوان دەستەبەر ناکا کە بە پێی ئەو بتوانن لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان و وەدەستهێنانی هێزی سیاسیدا کەڵکی لێوەرگرن؛ چونکە یاسای پیرۆز و نەگۆڕی سروشت وا دەخوازێ کە ژنان مەرجە پێویستەکانی بەدەستەوەگرتنی هێزی سیاسی و تەنانەت نوێنەرایەتیشیان نییە و ئەم مافە بەتەواوەتی بۆ پیاوانە.

سێهەم: کاتێک رۆسۆ قسە لەسەر بنەماڵە دەکا راشکاوانەتر نکوڵی دەکا لە مافی یەکسانی ژن و پیاو. ئەو وەکو پێشینیانی خۆی "ئەرەستۆ، لۆک، هیگل، وەک دەزگایەکی سروشتی لە بنەماڵە دەڕوانێ و رای وایە بەپێچەوانەی دامودەزگا سیاسی_ کۆمەڵایەتییەکان، کە لەسەر بنەمای گرێبەست و ماف و ئەرکی دوولایەنە دامەزراون؛ بنەماڵە لەسەر بنەمای هەست و سۆزداری پێکهاتووە و بەمجۆرە لە دامودەزگاکانی دیکە جیاوازە. ئەم کەسانە ئیدعای ئەوە دەکەن کە، یەکەم بنەما و بنچینەی ئۆتوریتە و دەسەڵاتی سیاسی بۆ زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگادا، لە نێو بنەماڵەی باوک مەزندا هەیە. بەواتایەکی دیکە، ئۆتۆریتەخوازان؛ رۆڵی دەسەڵاتی زاڵی خۆیان بەسەر هاوسەرەکانیاندا؛ بە

بەراوردێکی هەڵخەڵەتێنەر دەگەڵ ئوتوریتەی سیاسی لە کۆمەڵگاکاندا بە یەک شت زانیوە و وەک رەوت و تەکووزێکی (نظم) سروشتی لێیان روانیوە.

رۆسۆش لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە تاقمێکی تایبەت وەک بنەماڵە؛ بە ئۆتۆریتەو دەسەڵاتێکی تەوەردارەوە باشتر دەتوانێ ئەو شتەی بە قازانجی خەڵکییە وەک داوایەکی گشتی بیهێنێتە بەر باس. ئەو سەبارەت بە بنەماڵە دەڵێ: "یاسای سروشت لەسەر ژنانی فەرزکردووە کە گوێڕایەڵی پیاوان بن" و "ژنان دەبێ ملکەچی یاسا و دەسەڵاتی پیاوان بن.[١٧] و هەروەها ئەو هێز و دەسەڵاتەی ژن لە ماڵێدا هەیەتی، لە راوێژ و دەستڕۆیشتوویی مێردەکەیەوە سەرچاوە دەگرێ؛ بۆیە دەبێ ئەم هێز و دەسەڵاتەی ژن لە پێناو دڵخۆشی و رەزامەندیی مێردەکەیدا بێ.[١٨]

رۆسۆ بۆ سووکایەتیکردن بە پڕ بایەخترین بنەماکانی خۆی واتە ئازادی و یەکسانی، سێ هۆ دێنێتەوە و ئێمەش بە هاسانی تێدەگەین کە ئەویش و ئەوانی دیکەش بۆ پاساودانی بۆچوون و تیۆرییەکانی خۆیان، چۆناوچۆن پەنا دەبەنە بەر "سروشت".[١٩] ئەو هۆیانەی رۆسۆ لەم پەیوەندییەدا، بۆ پێویست بوونی؛ هەبوونی بنەماڵەی باوک مەزن هێناونێتەوە بریتیین لە :

یەکەم: ناکرێ ئوتوریتە و دەسەڵات لە بنەماڵەدا؛ بەسەر باوک و دایکدا، دابەش بکەین چونکە ئەگەر هات و جیاوازییەکی بیروباوەڕ لە بنەماڵەدا هاتەگۆڕێ دەبێ کەسێک هەبێ کە قسەی ئاخر بکا و کەس لە قسەی دەرنەچێ، کەسێک کە کاروبارەکان راپەڕێنێ؛ دیارە ئەو کەسە؛ پیاوی ماڵە.

دووهەم: یەکێک لەو پاساوانەی رۆسۆ بۆ بوونی بنەماڵەی باوک مەزن دەیهێنێتەوە ئەوەیە کە ژن لە قۆناغگەلێکی ژیانی خۆیاندا وەک: قۆناغی دووگیانی و منداڵبوون، تووشی کەمتوانایی و بێهێزی دەبن و هەر ئەم هۆیەش بەسە بۆ ئەوەی کە ژنان لە رۆڵی بڕیاردەر و دەسەڵاتدار لە بنەماڵەدا؛ بێبەش بکا "و پیاو بکاتە دەسەڵاتدار و بڕیاردەر و یاسادانەری نێو ماڵێ". لەو نێوەدا پێویست بە گوتن ناکا کە رۆسۆ هیچ هۆیەک بۆ لاوازیی پیاوان ناهێنێتەوە. بۆ وێنە؛ پیاوان لەوانەیە لەبەر زۆر هۆ، تووشی نوقستانی بێن و ئیفلیج بن یا لە هەلومەرجێکدا توانایی بڕیاردان و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان نەبێ.



بەڵام بەڕای ئەو؛ ئەو شتانە پیاو بێبەری ناکەن لە بڕیاردان و چاودێری و کۆنترۆڵ کردنی کاروبارەکان. بێگومان بێبەریکردنی ژنان لە مافی بڕیاردان و بەڕێوەبەری؛ ئەویش بە هۆی ئەوەی کە دەکەوێتە قۆناغگەلێکی جۆراو جۆر لە ژیاندا وەک دووگیانی و زاوزێ کردن؛ کارێکی لە خۆباییانە و گەمژەییە. ئێمە تەنیا لەم باسەدا بەو دەرەنجامە دەگەین کە رۆسۆ بەلایەوە گرینگ بووە کە پیاوان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و گەورەیی بنەماڵە بەشیاو و لێوەشاوە بزانێ و بەتەواوەتی نکوڵی بکا لە بوون و دەوری ژنان.

سێهەم؛ بێگومان ئەم هۆیە یەکێک لەو بەڵگە گرینگانەیە کە بەردەوام دووپاتەی کردۆتەوە.[٢٠] ئەو دەڵێ: "مێرد دەبێ توانایی چاودێری کردن و کۆنترۆڵی هەڵسوکەوت و ئاکاری ژنەکەی خۆی هەبێ. چونکە ئەم چاودێرییە بۆ پیاو ئێجگار پێویستە بۆ ئەوەی دڵنیابێ ئەو منداڵانەی کە دەبێ بەخێویان بکا لە تۆو و تۆرمەی خۆین و لە کەسی ترنین.[٢١] رۆسۆ دڵنیایی لە سەرچاوەی رەچەڵەک، وێڕای شتەکانی دیکە وەکو دامودەزگا پیرۆزەکان، خاوەندارێتی تایبەت و میرات؛ لە کۆمەڵگادا وەک بڕیارگەلی نەگۆڕ پشت راست ناکاتەوە، بەڵام ئێجگار بە پێویستی دەزانێ کە پیاو لە کۆمەڵگادا دڵنیابێ لەوەی کە منداڵەکانی لە تۆوی خۆیین. رۆسۆ لە بەرامبەردا راشکاوانە، تەواوی ئەو شتانەی کە بۆ رێز و حورمەتی ژن و لەبەر چاوگرتنی مافەکانی کۆمەڵگا پێویستن وەکو یەکسانی و سەربەخۆیی؛ نەک هەر پشتگوێی خستوون بەڵکو هەبوونی ئەم مافانەی [بۆ پیاو] بە پێویست زانیوە.

بەکورتی هەڵسوکەوت و کرداری کەسێنی رۆسۆ و هەروەها ئاکاری پرسوناژگەلی نێو بەرهەمەکانی ئەو وەکو: ئێمیل و بارن ئێتۆی Barnn Fto (باوکی ژولی) سەلمێنەری ئەوەن کە ژن و منداڵی ئەم پیاوانە لەو سەروبەندەدا کە پێکەوە دەژیان و لە بنەماڵەی باوک مەزنیدا هەستێکی سروشتی لە گۆڕێدا بوو رێزوحورمەت و ئاسایشیان نەبووە. ئێمیل منداڵە بێ تاوانەکەی خۆی تاوانەکەی بە شیاوی ئەو سزایە دەزانێ کە لەوانەیە لە داهاتوودا دایکی بەهەڵە تووشی بێ و بیکاو لەم بارەوە دەڵێ: "حەزدەکا مەرگی منداڵە ساواکەی خۆی بە چاو ببینێ، بەڵام نەبینێ و نەبیستێ کە سۆفیی ژنی، ئەو منداڵەی لە کەسێکی

دیکە گرتووە". هەروەها باوکی ژولی، بە پێی عادەتی هەمیشەیی خۆی هەر دەگەڵ ژنی بەمێرد جووت دەبێ. لە ماڵەوەش بەو پەڕی توندوتیژییەوە دەگەڵ خێزانی هەڵسوکەت دەکا و بەزۆرەملێ دەیهەوێ کچەکەی خۆی بدا بە پیاوێک کە ئەو حەزی لێی نییە و باوکیشی هەڕەشەی کوشتنی لێدەکا چونکە پێیوایە کچێنی خۆی دۆڕاندووە. هەروەها خودی جان جاک رۆسۆ بەپێچەوانەی ڕەزامەندی و ویستی ژنەکەی؛ راپۆرتێک لەسەر منداڵان Thorese le vassur ئامادە دەکا و بێ گرنگیدان بە مافی دایک بەسەر منداڵەکانییەوە تەنانەت بەنیسبەت داهاتووی منداڵانەوە؛ دەیان نێرێتە هەتیوخانە و بە شێوەیەکی زۆر زاڵمانە دەگەڵیان دەجووڵێتەوە[٢٢]. رۆسۆ لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەو بەبێ ئەوەی ویژدانی ناڕەحەت بێ یا پەژیوان بێتەوە لەبەر ویستی گشتی و بەرژەوەندیی کۆمەڵگا وەها کارێکی کردووە."[٢٣] بێگومان رۆسۆ زۆر باش ئاگاداری نایەکسانییە سیاسییەکان و ئاکاری بەرپرسانی کۆمەڵگایە و دەشزانێ: کە بەگشتی ئەوە گەمژەییە ئێمە چاوەڕوانیمان لەو کەسانە هەبێ وا بەسەر کۆمەڵگا رادەگەن و بەرپرسی کاروبارەکانن کە بێن بەرژەوەندیی خەڵک بخەنە پێش بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە. ئەمە پرەنسیپێکی زاڵمانەیە کە لە هەر جێگەیەک بەرژەوەندییەکانی خەڵک و دەسەڵات رووبەڕووی یەکتر بوونەوە؛ بەرژەوەندییەکانی خەڵک لەلایەن دەسەڵات و حکوومەتەوە ڕاماڵدرێ و تێدابچێ.[٢٤] بەڵام رۆسۆ لە نووسراوەکانی خۆیدا نکوڵی دەکا لەم دژبەرییەی بەرژەوەندییەکان و ئاکامە زاڵمانەکانی ئەم دژبەرییە سەبارەت بە بنەماڵەی باوک مەزن (ئەو نموونەیەی خۆی خستوویەتەڕوو) ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پیاوا لە ماڵێدا ببێتە خاوەنی مافێک کە هەر چەشنە باوەڕو بۆچوونێکی دادپەروەرانە و یەکسانخوازانە سەرکوت بکا.

لە نووسراوەکانی ئەودا گەلێک بەڵگە هەن کە دەیسەلمێنن رۆسۆ بە راشکاوی و لەڕووی ئاگاییەوە بنەماو یاساکانی یەکسانی کە خۆی باوەڕی پێیان بوو بەنیسبەت ژنان پێیان بێ باوەڕ بوو. ئەو ترسی لەوە بوو کە ئەگەر بێتو پیاوان ژنان نەخەنە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆیانەوە؛ ئەوان لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە بەسەر چارەنووسی پیاواندا زاڵ دەبن. رۆسۆ لەم بارەیەوە



دەڵێ: کاتێک ژنان تێگەیشتن لەوەی کە دەتوانن حەزە سێکسییەکانی پیاوان بوروژێنن و کۆنترۆڵیان بکەن و هەروەها بۆیان دەرکەوت کە پیاوان قەت بە تەواوەتی ئاوری هەوەسیان دانامرکێتەوە و ئەوەش کە سروشت هێزێکی ئەوتۆی بەژنان بەخشیوە بەربەرەکانێ بکەن لە بەرامبەر حەزە سێکسییەکانی پیاواندا و ئەو هێزەش لە راستیدا پوانێکە، کە سروشت پێیداون؛ لەو کاتە بەدوواوە پێداویستە سێکسییەکانی پیاوان کە ملکەچی یاسایەکن بەبێ هیچ فرەییەکی سروشتی؛ ئیتر چاو لە دەست و ئاتاجی ویست و حەزە سێکسییەکانی ژنان بوون.[٢٥] هەروەکی لە "نامە بۆ دالامبێر"دا دەنووسێ" باوەڕی وایە کە "عیشقبازی [کردەی سێکس] هەرێمی تایبەتی ژنانە و ئەوە ئەوانن کە دەتوانن یاسا دارێژن. بەسەرنجدان بەوەی کە سروشت هێزی بەرەنگاریی سێکسیی بەژنان بەخشیوە، ئەگەر بێتو پیاوان ئەم بەرەنگارێتییە تێک بشکێنن و دەست بەسەر ئەم قەڵایەدا، بگرن، دەبێ لە ئازادیی خۆیان نرخی بۆ بدەن و واز لە ئازادییەکانیان بێنن.[٢٦] بەو پێییە هەروەکی رۆسۆ تێگەیشتبوو، ژن ئەو هێزەی هەیە بەکەڵک وەرگرتن لە ژیانی قەیرانیی پیاو بە سەریدا زاڵ بێ. کاریگەرێتیی هێزی سێکسیی ژنان بەسەر پیاواندا بووە هۆی ئەوەی کە رۆسۆ بڵێ: "ئەوان مافی پیاوان زەوت دەکەن." بەواتایەکی دیکە نابێ لەم بورانەدا کە بە شێوەیەکی نەریتی تایبەت بە پیاوانن؛ یەکسانیی بۆ ژنان قایل بین؛ چونکە ئەگەر وابێ و پیاوان چاوپۆشی لە چلۆنایەتی و مەزنایەتییە زاتی و سروشتییەکانیان بکەن و خۆیان بە هاوشانی ژنان بزانن ئیدی چۆن دەکرێ یاسای سروشتی روون بکەینەوە و پاساو بۆ سنووری دەسەڵاتی مێرد بەسەر هاوسەرەکەیدا بێنینەوە[٢٧].

رۆسۆ لە نامیلکەی "سەبارەت بە ژنان" دا دەڵێ: "ژن توخمێکی کوشندە و چەواشەکارە، هەم خۆشم دەوێ و هەم لێی بێزارم؛ ژن پیاو کۆیلە دەکا؛ کاتێک پیاو لێی قەڵس دەبێ و سکاڵای لێ دەکا ئەو پێی پێدەکەنێ. پیاو ئەو دەترسێنێ؛ ژن هێزی باڵادەستیی خۆی دەردەخا و کاتێک کە پیاو بەهێندەی ناگرێ و پشت گوێی دەخا، ژن زەجری دەدا، ژن تۆفان و لافاوان وەڕێدەخا بۆ ئەوەی تۆرەمەی مرۆڤ لە زەجر و ئازاردا بهێڵێتەوە."[٢٨]

ترس و نیگەرانی لە هێزی ژنان و باسکردن لەوەی کە ئەوان لە جیهانی شارستانیدا سەرچاوەی شەڕ و خراپەن، ترسێک نییە تەنیا تایبەت بە ڕۆسۆ بێ؛ بەڵکو لە سەردەمی هسیۆدەوە واتە لە "چاخی زێڕینی نەبوونی ژن" دا و لە سەردەمی ئەفلاتوون لە "پیاوی سیاسی و تیمایوس"دا- کاتێک کە یادی باخی بەهەشتیان (بەر لەخوڵقانی حەوا) دەکردەوە، ئەم ترسە هەر هەبووە و تەواوی ئەم باس و خواسانە لە وەسفی جیهانێکە کە ژن و خراپەی تێدا نەخوڵقابوو. ئەوە مەسەلەیەکە، کە لە باو و باپیرانەوە بە ڕۆسۆ گەیشبوو، لە کتێبەکەی خۆیدا "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانیەکان" دا دەگەڕێتەوە بۆ رابردووە دوورەکان و لە تیۆریی "چاوگەی یەکەم و دۆخی سروشتی" دا باس لە جیهانێکی وادەکا کە بوونی تێیدا ئاشکرا و بەرچاوە. ئەو لە گریمانەکەی خۆیدا رابردوویەکی مێژوویی بۆ مرۆڤ وێناکردووە کە تێیدا میتۆدی ژیانی تاکەکەسی (رەبەنی) باو بوە و بێجگە لە کاتی پێداویستییە سێکسیەکاندا، هیچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان ژن و پیاودا نەبووە.

لەو سەردەمەدا ژنان، بێ ئەوەی چاو لە دەستی پیاوان بن، بە ئازادی و سەربەخۆیی دەژیان، ڕۆسۆ هەروا بە تاسەی ئەو رۆژانەوە بوو؛ باوەڕیشی وابوو کە ئەم قۆناغە دەگەڵ دەرکەوتنی بنەماڵەی تاکەژنی کە لە سەرەتای "چاخی زێڕین" دا سەری هەڵدا کۆتایی پێ هات و بەستراوەیی ئابووریی و چاو لە دەستیی ژن هاوکات دەگەڵ بەستراوەیی و پێویستیی پیاو لە باری سێکسییەوە بە ژن دەستپێکرد. ئەو هێزەسێکسییەی ژن بەسەر پیاودا هەیەتی دەکرێ وەکو ئامرازێک کەڵکی لێوەرگیردرێ بۆ هاوسەنگیی دەسەڵات یا لانیکەم بۆ پووچەڵکردنەوەی دەسەڵاتی زاڵی پیاو.

ڕۆسۆ بەپێچەوانەی لایەنگرانی «مانی» کە باوەڕیان وابوو مرۆڤ لە دوو هێزی چاکە و خراپە پێک هاتووە و خراپەکانیان دابەش دەکرد بەسەر رەگەزی نێر و مێ دا، ئەو باوەڕی بەو شتانە، نەبوو. باوەڕی بە سەرچاوەی یەکەم دۆخی سروشتیی مرۆڤ و کردەی ئازاد و وارسکەیی سێکس هەبوو؛ لە خۆبایی بوون و بەرزەدەماخیی مرۆڤیشی بە دەرکەوتە و دەرەنجامی ژیانی هاوبەشی نێوانیان دەزانی کە دەگەڵ عەشق و کردەی سێکس کۆنترۆڵ کرابوو، هەروەها



دەیگوت؛ ژیانی هاوبەش دیاردەیەکی تێکدەرە کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئێرەیی و شەڕو تێکهەڵچوون و کوشت و کوشتار و گەلێک خراپەی دیکە.[٢٩]

ڕۆسۆ هاوڕا لەگەڵ تیۆرییەکەی پیرئاوگۆستین* ڕووداوێکی مێژوویی وەک دەرکرانی (هبوط)ی ئادەم؛ بە گریمانە دێنێتەوە بۆ ئەوەی سەربردەی ئادەمیزاد لە هەستێکی ئازادانەی سێکسییەوە بۆ بەردەوامبوونی تۆرەمەی مرۆڤ بکاتە هەستێکی بەتین و ئاگرینی ناخ کە لەگەڵ ئێرەیی و تاوان و ترس و گوناح تێکەڵاوە و بەناچاری لە شێوەی ژیانی مرۆڤی تەنیا و سەرەتاییەوە بیهێنێتە سەر شێوە ژیانی هاوبەشی کۆمەڵایەتی کە تێیدا توخمی ئەخلاقی دەکەوێتە بەرامبەر توخمی ماددیی عەشقەوە. ژن لەم سەبردەیەدا بەوە تاوانبارە کە دەیهەوێ لە هێز و توانای عەشقبازی و کردەی سێکس ئامرازێک ساز بکا بۆ زاڵبوون بەسەر پیاودا.[٣٠] بەواتایەکی دیکە؛ ژن بۆیە تاوانبارە چونکە دەیەوێ بۆ زاڵبوون بەسەر پیاودا هەستە سێکسییەکانی بوروژێنێ.

ڕۆسۆ سەبارەت بەو ژنانەی بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر پیاودا کەڵک لە هێزی سێکسی خۆیان وەردەگرن، دەڵێ: کە زاڵبوونی رووهەڵماڵداراوانەو هەوەسبازانەی ژنە فەرەنسییەکان تەنیا ئاستی چلۆنایەتیی دەست راگەیشتن بەزانستەکان دانابەزێنێ بە لکو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گەندەڵی و خراپە کۆمەڵایەتییەکانیش. لەم پەیوەندییەدا ڕۆسۆ لە کتێبی "نامە بۆ دالامبێر" دا گرینگترین مەسەلەی خۆی تەرخان کردووە بۆ کاریگەریی خراپەکارییەکانی ژن لەسەر کۆمەڵگا. ئەو هیچ کات حەولی نەداوە نموونە گەلێکی واقیعی لە ژنانی داوێن پاک و گەورە بخاتە روو، کەچی لەولاوە وەک بوونەوەرێکی سامناک و مەترسیدار باسی کردوون کە بەردەوام خەریکن بۆ فریودان و بەلاڕێدابردنی پیاون داو و تەپکە دەنێنەوە.

* پیر ئاگۆستین: (اگوستین قدیس). لێرەدا وشەی پیر لە بڕی "قدیس" هاتووە. "قدیس" کە زۆر جاران لە کوردییەکەیدا پیرۆزیان بۆ داناوە؛ پیرۆز بۆ ئەم وشەیە پڕ بە پێست نییە. بەڵام لە زمانی کوردیدا وشەی پیر و وەکو "پیرشالیار، پیرخدر، پیر محەمەد و..." تەنانەت بەر لە هاتنی ئیسلامیش بە پیاوچاکان گوتراوە بۆیەش ئەمن بۆ پیاوچاکی مەسیحی (ئاوگوستین) "پیرم" بەکارهێناوە (و. ک)

رۆسۆ بێزار بوو لە ژنانی خوێندەوار و روناکبیری کۆمەڵگای پاریس، چونکە باوەڕی وابوو کە ئەوان بە رووهەڵماڵدراوی و سووکی دەیانهەوێ خۆیان وەک پیاوان بنوێنن. لەڕوانگەی ئەوەوە لەوانەیە ئەمجۆرە ژنانە؛ ئاواڵێکی رووگەش و باش بن، بەڵام هیچ کات نابنە هاوسەر و کەیبانوویەکی باش و دڵخواز[٣١]؛ چونکە ئەوان ئەم ئەرکانە بەسووکایەتی بەخۆیان دەزانن و زۆر ئەستەمە قایل بن ئەم کارانە بەڕێوەبەرن[٣٢]. رۆسۆ لە ئێمیلدا بە راشکاوی دەڵێ: "پیاوان بۆ ناسین و دەستنیشان کردنی چاکە و مەزناهییەکانی ژنان لە هەموو کەس پتر جێی متمانەن."[٣٣] ئەو پێی وابوو زۆربەی ژنانی هەرزەکار و خراپەکار دەورەیان داوە و رەوشێکی شووم و نگریسیان بۆ ئەو پێک هێناوە هەر بۆیەش هەوڵی دەدا لێیان دوور بکەوێتەوە و لە دووروپەرێزیدا بژی. هەر بۆیەش رۆسۆ هەوڵی ئەوەی بوو کە ئێمیلی گەنج بە تەنیا (سەڵت) بهێڵێتەوە و نەهێڵێ توخنی ژنانی بەمێرد و سۆزانییەکان بکەوێ بکەوێ کە ئەو پێی وابوو هەمووان لە قوماشێکن. بەرای رۆسۆ کۆمەڵگای فەڕەنسا گەندەڵ بوو، هەر بۆیەش ئەو، هەموو ژنە بەمێردەکانی بەسۆزانی دەزانی. ئێمیل لەسەر تێبینیی رۆسۆ؛ ئیزنی ئەوەی پێدرابوو کە تەنیا هاموشۆی ئافرەتی رەبەن واتە کچان بکا.[٣٤] چونکی ئەوان لە هەموان باشتر و شیاوترن.

بەهەرحاڵ؛ رۆسۆ تاوانی تەواوی خراپە و ناراستییەکانی کۆمەڵگای دەخستە ئەستۆی ژنان. ئەو لە نامەکانی خۆیدا بۆ دالامبێر و لەنامەیەکدا بۆ خاتوو لێنیپس mmelenips بەرروونی باس لەوەدەکا کە ژنان لە خراپکردن و گەندەڵ کردنی کۆمەڵگادا؛ تەنیا خۆیان تاوانبارن. بۆ وێنە کاتێک خاتوو لێنیپس رەخنەی لێدەگرێ و دەڵێ: "خەتای ژنان نییە کە کۆمەڵگا تووشی گەندەڵی و لاڕێ دێ، بەڵکو ئەوە پیاوانن کە ئەوان بەرەوگەندەڵی و لاڕێ پەلکێش دەکەن"، رۆسۆ لە وەڵامدا دەڵێ: "بەڵام من کتێبەکەمم بەو مەبەستە نووسیوە کە پێشانی دەم ژنان چۆناوچۆن لە پێک هێنانی گەندەڵی لە کۆمەڵگادا تاوانبارن."[٣٥] بەو پێیە رۆسۆ پێیوایە ژنان بە شێوەیەکی خراپ کەڵک لە توانا سێکسییەکانیان وەردەگرن بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە نەک هەر پیاوان تووشی فەساد و لاڕێ بکەن بەڵکو ببنە هۆی کاول بوونی ئەخلاقی گشتییش.



لە پەروەردەکرنی ئێمیلدا بە جوانی هەست بە دڕدۆنگی و ڕاڕایی بوونی رۆسۆ دەکەین لەبەر ئەوەی کە ئایا ژنان بە تەنیا خۆیان لە گەندەڵ کردنی کۆمەڵگادا تاوانبارن یا هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان و دامودەزگاکان ناچار بەم کارەیان دەکەن، هەر بۆیەشە ئەو جار نەجارێک ناچارە ئاماژە بە هەر دووک هۆکارە کە بکا و بڵێ: لە ژێر دەسەڵاتی دامودەزگا بێ نێوەڕۆکەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا، ژن بێجگە لەوەی کە بووەتە هۆی ئازار و خراپە بۆ ئێمەی پیاو، دەبێ بەردەوام ژیانێکی پڕ لە شەڕ و ململانێ دەگەڵ ناخی خۆیدا تێپەڕ بکا.[٣٦] دیارە رۆسۆ لێرەدا لە رووی شەرعییەوە وەک بوونەوەرێکی قوربانی کراو لە ژن دەڕوانێ و پێیوایە وەک ژنانی ئەفسوون جادوگەر، شیاوی ئەوەن لە ئاگردا بسووتێنرێن یا ئەوەی کە وەک دایکە حەوا، لە بەهەشت بڕەتێندرێن؛ لە لایەکی دیکەشەوە هەروەک چۆن لەوکاتەدا کە پاڵەوانی چیرۆکەکەی "ژولی" لە دۆخێکی تاڵی بێ هیواییدا دەژی؛ ئەو دڵخۆشیی دەداتەوە. رۆسۆ لە هێلۆیزی نوێدا دەڵێ: ئەگەر ژنێک لە رێگەی داوێن پاکی و حەیا و شەرم هەتڵەو چەواشەبوو؛ تاڕادەیەکی زۆر ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خراپ کەڵک وەرگرتنی ئەو هێزەی چاودێریی بەسەردەداکا؛ بەتایبەت بۆ باوک، چونکە باوک کچەکەی خۆی ناچار دەکا بە مەبەستی وەدەست هێنانی ماڵ و سامان و پێگەی کۆمەڵایەتی مل کەچ بکا بۆ ژیانێکی هاوبەشی نابەدڵ. ئەگەر کچەش ئەم مێردکردنە قبووڵ نەکا و عاشقی کابرایەکی دیکەبێ، ئەوا دەکەوێتە بەر توانج و لۆمەی کۆمەڵایەتی و هەروەها ئەو پیاوەش کە دڵی ئەم کچەی رفاندووە؛ کارێکی خراپی کردووە." لۆرد بامستۆن پیاوێک کە مەحرەمی رازو جێی متمانەی سەن پێرۆیە بەسەرنجدان بەو سروودانەی دژی ئەو پیاوانە نووسراون کە مافی ئەوەیان هەبووە کچەکانیان بە نابەدڵی بەشوو بدەن دەڵێ: "لەم وڵاتەدا، ژنان لە رێگەی یاساوە زوڵمیان لێ کراوە و خراپ دەگەڵیان رەفتارکراوە و سەیر نییە کە ئەوان بیانهەوێ بە ئامرازی ئەخلاقی؛ بێ بەزەییانە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە"[٣٧]. رۆسۆ لەوەڵامی خاتوو لێنپسدا کە بەنارەزایەتییەوە گوتبووی بیروبۆچوونی رۆسۆ لەسەر ئەخلاقی ژنانی بەمێرد لە تۆمەت و بوختان بەولاوە شتێک نییە؛ دەڵێ: "سەبارەت بە ژنان دەبێ بێ لایەن بی. ئاکارە خراپەکانی ژنان چی وای لە خراپەی دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکان کەمتر نییە"[٣٨]

ئەو هەروەها دەڵێ: هەستەوەرییە سروشتییەکان ناهێڵن نایەکسانیی سەرەڕۆیانە لە کۆمەڵگادا سەرهەڵدا و سەرەڕۆیی باوکان کە "هەستەوەرییەکی ناسروشتییە" دەبێتە هۆی بەلاڕێداچوونی منداڵەکانیان. لێرەدا پێویستە خاڵێک لە روانگەکانی رۆسۆ سەبارەت بەخراپەکارییەکانی ژنان بهێنینەوە یاد: ئەو پێی وابوو؛ ئەو ئاکارە گەندەڵیهێنەر و فەساد خوڵقێنەی کە لەسەر کۆمەڵگا شوێن دانەردەبێ؛ بەهیچ شتێ ناگۆڕدرێ و هیچ رۆچنەیەکی هیوا بۆ بەرەبەرەکانێ دەگەڵ ئەم کاریگەرییە تێکدەرو کاولکارانەیە لە گۆڕێدا نییە. هەروەها رۆسۆ لە پارادۆکسێکی ئاشکرادا، لەوتارێکدا سەبارەت بە هونەر و زانستەکان ئاوڕ لەم خاڵە دەداتەوە و دەنووسێ: "من لەسەر ئەو باوەڕەنیم کە زاڵبوونی ژنان بەسەر پیاواندا لە رێگەی تایبەتمەندییە رەگەزییەکانی ژنایەتییانەوە ئەویش بە شێوەی زاتی شتێکی خراپی لێ بکەوێتەوە، بەڵکو من ئەوە بەدیارییەک دەزانم کە سروشت پێی بەخشیون و تۆرەمەی مرۆڤیش حەزی لێیەتی ئێستاکە ئەم شتە؛ جیا لە زیان هیچ شتێکی بۆ مرۆڤ لێ ناکەوێتەوە، بەڵام بە چاودێری و کۆنترۆڵ کردنی، دەکرێ دۆخی دڵخوازی لێ ساز بکرێ.[٣٩] بەواتایەکی دیکە؛ ئەگەر ژنان لە بەکارهێنانی هێزی سێکس کۆنترۆڵ بکرێن بۆ ئەوەی بە شێوەی گونجاو کەڵکی لێوەرگرن، کاریگەرییەکی باش؛ هەم لە ئاستی تاک و هەم لە ئاستی گشتیدا لەسەر کۆمەڵگا دادەنێ. بەکورتی: "ئەو ژنانەی بەحەیا و شەرم و داوێن پاکن [واتە بە شێوەیەکی شیاو و گونجاو کەڵک لە هێزی وروژێنەری سێکسی خۆیان وەردەگرن] لەلای ئێمەی پیاو خۆشەویست تردەبن و دەتوانن لەسەر ئێمە شوێندانەربن."[٤٠]

رۆسۆ بۆ ئەوەی ژنان کاریگەرییەکی دڵخوازیان لەسەر پیاوان هەبێ، تەنیا یەک رێگە چارە پێشنیار دەکا، ئەویش داوێن پاکی و شەرم و حەیایە. بەواتایەکی دیکە، ژنان هاوسەر و دایکێکی داوین پاک و خۆبەختکەرن کە دەتوانن ئۆتۆریتەو دەسەلاتێکی باش و بەکەڵکیان بەسەر پیاوانەوە هەبێ. لە روانگەی رۆسۆوە؛ کە فەیلەسووفێکە لایەنگری یەکسانییە، رەگەزی ژنان هۆکارێکە، بۆ رەوایی بەخشین بە رەفتار و ئاکارە نایەکسانەکان. لە بەرهەمەکانیدا دەستەبەرکردنی ئازادییەکی هاوتەریب دەگەڵ یەکسانی



دەخرێتەڕوو؛ ئەم دوو بابەتەش تەواو هاوشێوەن. ئەو بەردەوام شێلگیرە لەسەر بەهای ئازادی و سەربەخۆیی فیکری و دەڵێ: "ئازادی بەهای مرۆڤێکە (پیاو)، دەستەبەرکردنیشی بەر پرسیارەتییەکی گرینگی سەرشانی ئەوە" و "وازهێنان لە توخمی ئازادی بەواتای وەلانانی مرۆڤایەتییە و ئاشکرایە کە نکوڵی کردن لە ئازادی دەگەڵ سروشتی مرۆڤ یەک ناگرێتەوە، چونکە لە راستیدا، وازهێنان لە ئازادی؛ بێبەری کردنی مرۆڤە لە تەواوی ئاکارە ئەخلاقییەکان."[٤١] لە هەر دووک بەرهەمی رۆسۆدا، واتە بەشی یەکەمی لێدوان سەبارەت بەسەر چاوەی نایەکسانی، کە تێیدا گریمانەی سەرچاوەی سەرەتایی سروشتی خراوەتەڕوو. هەروەها لە کتێبی ئێمیلدا، سەربەرخۆیی و ئازادی کە بە لای رۆسۆوە ئایدیالگەلێکی کەسێنی (شخصی) بوون وەک بەهاسەرەکی و ئەزەلییەکانی مرۆڤ ناسراون. ئەو لە دانپیانانەکان و هەروەها لە خولیاکانی تەنیاییشدا The Rererieof بێزاریی خۆی دەربڕیوە بە نیسبەت بەستراوەیی بە کەسانی دیکەوە و کارێک کە بەزۆرە ملی بەسەر یەکێکدا دەسەپێ، تەنانەت ئەگەر کارێکی خۆشیش بێ.[٤٢] بەڵام وێڕای بێزاریی ئەو لە بەستراوەیی و کاری بەزۆرەملی، لە دەرەنجامی قسەکانی خۆیدا دەڵێ: سەربەخۆیی و بێ نیازی لە خەڵکی دیکە، کە لە پێداویستی و فاکتەرەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە، ئەوی خستۆتە دۆخێکی نالەبارەوە. لە خولیاکانی تەنیاییشدا دەنووسێ: "کاتێک بەسەربەستی و سەربەخۆیی کارێک رادەپەڕێنم هەست بە بەختەوەری دەکەم و لە بەختەوەری زیاتر بیر لە هیچ شتێ ناکەمەوە. بەڵام کاتێک بە هۆی پێداویستییەکەوە کۆتوبەندی کۆیلەتی دەکەوێتە ئەستۆم واهەست دەکەم ئیدی لە یاخی و ئاژاوەگێڕێک بەولاوە کەس نیم.[٤٣] ئەو هەروەها لە گریمانە سیاسییەکەی خۆیدا حەولی داوە؛ پێداوەیستییە سروشتییەکانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بەسەربەخۆیی دەگەڵ ئامرازەکانی ژیانی نێو کۆمەڵگای مەدەنی رێک بخا و کۆمەڵگایەکی تەواو سەربەخۆو ئایدیال دامەزرێنێ. رۆسۆ ؛ لەم پەیوەندییەدا، بۆیە گریانەی چاوگەی ئەزەلیی سروشتیی هێناوەتە گۆڕێ بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ تا ئەوکاتەی پیاوێک بە رەبەنی دەژی و سەربەخۆیە بە شێوەیەکی سروشتی بەختەوەرە، بەڵام بە پەیوەندی گرتن و هەڵسوکەوت

دەگەڵ خەڵکدا، کە لە پێویستییەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە- پێداویستی و دژوازییەکان زیاد دەکەن و لەهەردوو لاوە پیاو چاو لەدەست و بەستراوە دەکەن. لەلایەکەوە ئەم بەستراوەییە دوولایەنە؛ دەبێتە هۆی بەرزە دەماخی و لەلایەکی دیکەوە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ژان و ئازارگەلێک کە بەسەر یەکترییدا دەسەپێنن.

ڕۆسۆ لە کتێبی لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانیدا بەڕاشکاوی دەڵێ: "پێویستییە دوولایەنییەکانی مرۆڤ بە یەکتر وەک کۆت و بەندی کۆیلەتی وان. هەتا مرۆڤ نەکەوێتە دۆخێکەوە کە بەبێ یارمەتی کەسانی دیکە نەتوانێ کار بکا ناکرێ بیچەوسێنیتەوە و کۆیلەی بکەی. لە کۆمەڵگای سەرەتایی و سروشتیدا وەهاشتێک لە گۆڕێدا نییە. لەوێدا مرۆڤەکان هەموو؛ ئازاد و سەربەستن و یاسای زۆرەملی شتێکی پووچ و بێ بنەمایە".[٤٤] بە هەرحاڵ دۆخی سروشتی و سەرەتایی مرۆڤ؛ لەو کاتەوە کە ئادەمیزاد پێویستیان بەیەکتری بوو، کۆتایی پێهات و لەوەداو کۆیلەیی و چارە ڕەوشی مرۆڤ دەستیپێکرد".[٤٥] بەو پێیە دەکرێ بڵێین: بابەتی سەرەکی لە فەلسەی سیاسیی ڕۆسۆدا و گریمانەی دۆخی سەرەتایی و سروشتیی مرۆڤ؛ نکوڵی کردن لە ئازادییە لە کۆمەڵگای مەدەنی دا[٤٦]، چونکە هەر چەشنە گوشار و زۆرەملێییەک لەلایەن کەسێکەوە بەسەر کەسێکی دیکەدا بسەپێ؛ دەبێتەوە هۆی زەوتکرانی ئازادیی کەسی دووهەم. بەڵام دەبێ بزانین کە بەبێ جۆرە زۆرەملی و پێویستیی، تەبایی کۆمەڵگای مەدەنی مەیسەل نابێ. ئەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنییەش خۆی گەلێک کێشە بۆ مرۆڤ دەنێتەوە. چونکە بەپێی بۆ چوونی ڕۆسۆ "لە کۆمەڵگای بەستراوە و چاو لە دەستدا؛ کەموکوڕی و گەندەڵی هەموو گیانی ئاغا و ڕەعییەت دەتەنێتەوە."[٤٧] و بۆ چارەسەریی گرفتەکانی وەها کۆمەڵگایەک؛ بەرپرسانی وڵات چاریان نییە بێجگە لەوەی کە چەوساندنەوەی مرۆڤ بەدەستی مرۆڤ بکەنە بابەتێکی یاسایی و بەرژەوەندییە تایبەتی و ویست و حەزە تاکەکەسییەکانی بەناوی یاساوە بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن. ڕۆسۆ لە ئێمیلدا سەبارەت بەو مەبەستە دەڵێ: "ئێمە لە چوارچێوەی یاساکانی سروشت و ئەو نەزم و تەکووزییەی دەگەڵییەتی و ئەوەی کە لە چوارچێوەی یاسا کۆمەڵایەتییەکاندا بژیین".[٤٨] بەم شێوەیە، دیارە "ئەگەر لە کۆمەڵگای



مەدەنیدا کەسێک یاسا کۆمەڵایەتییەکان وەلابنێ و ویستەکانی کەسێکی دیکە بەویست و حەزی خۆی بزانێ؛ ئەو کەسە خۆی خستۆتە ڕەوشێکی بێخەوشی سروشتییەوە کە تیدا هیچ کەس ناچارنییە گوێڕایەڵی کەسێکی دیکە بێ.[٤٩] بێزاریی ڕۆسۆ لە بەستراوەیی تاک، ئەو جۆرە بەستراوەییە دەگرێتەخۆ کە لە بیروباوەڕدا دروست دەبێ. [٥٠] ئەو بۆ ئەوەی خۆی لە کوت و بەندی بیروباوەڕی کەسانی دیکە ڕزگاربکا؛ بە پێویستی زانی کەسەکان لە هەرێمی سروشتیدا، دوورە پەرێز بژین. [٥١] هەروەها ڕۆسۆ لە "لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی"دا باوەڕی وایە کە یەکێک لەو هۆکارانەی کۆتایی بە چاخی زێڕینەوە هێنا؛ بەستراوەیی و چاولەدەستیی تاک بەتاک بوو کە بووە هۆی پەرەگرتنی فریوو جامەلۆسکێ و عەیب و عاری گەندەڵی هێنەری دیکە لە کۆمەڵگادا.[٥٢] ڕۆسۆ لەم بارەیەوە دەڵێ: "لە مەودوا واتە لە کۆتایی چاخی زێڕین، تەواوی ئاوەزمەندییەکانمان بوون بە دەمارگژیی کوێرانە و سووکایەتی و دابوو نەریتگەلێک، کە بێجگە لە گوێڕایەڵی، زۆرەملی، زوڵم و زۆرو دڵەراوکێ شتێکی دیکە نەبوو. مرۆڤی سیڤیل لە کۆتایی چاخی زێڕیندا لەدایک بوو؛ ژیان و مەرگیشی هەر لەوکاتەوە ڕەگەڵ کۆیلەیی کەوت.[٥٣] لە ڕوانگەی ڕۆسۆوە، ڕۆڵی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا، بە زۆرەملی بووەتە ڕۆڵێکی دەستتێوەردەر و شێوەیەک لە سەرەڕۆیی تاکەکەس. مەبەستی ڕۆسۆ لێرەدا ئەو کەسانەن کە وەک ئەکتەران کاری خراپە و فەساد دەکەن و دواتر وەک تەڵخەک و بووکەڵە دێنە بەردەم بینەران. بەواتایەکی دیکە ئەم کەسانە لەو دیو پەردەی شانۆ؛ فەرماندەر و خوڵقێنەری فەساد و گەندەڵین، بەڵام وەک ئەکتەری بە دەستوبرد و لێوەشاوە لەبەردەم بینەران، خۆیان بە چاکەکار و باش دەنوێنن. دیارە ئەم کارە سووکە لە شانۆشکۆی مرۆڤێکی گەورە ناوەشێتەوە.[٥٤]

ئەو شتەی ڕۆسۆ باسی لێوە دەکا، لەسەر کۆمەڵگای پاریسی سەردەمی خۆیەتی کە لێوانلێوە لە چەپەڵی و دزێوی و دەمارگرژیی کە هەمووی لە ژێر پەردەی دابونەریتی کۆمەڵگای مەدەنیدا دەکرێن. دابونەریتی ژیانی شاریی ئەوکات؛ قیزەون و جێگای شەرمەزاری بوو و مەودایەکی زۆری هەبوو لەگەڵ شێوەی واقیعی و ڕاستەقینەی کۆمەڵگایەکی ساخ و سەلیم. ڕۆسۆ لەوکاتدا بەو

دەرەنجامە پتەوە گەیشتبوو کە: "ئیتر هیچ دۆستێکی گیانی نەماوە و ڕێزو حورمەتی ڕاستەقینەی نێوان خەڵک لەناو چووەو نابێ هیچ باوەڕ و متمانەیەکت بە خەڵک (ئەوانی دیکە) هەبێ.[٥٥] ئەم دۆخە، واتە سووک بوون و دابەزینی ئاستی بەهای مۆراڵەکان، کە ڕۆسۆ لە پەنا خۆی بەدیی دەکرد بووە هۆی ئەوەی کە ئەم شتانە بە کۆمەڵگایەکەوە ببەستێتەوە کە سەرانسەر جامەلۆسکێ و درۆوئاکاری دزێو تەنیبوویەوە. ئەو هەروەکی لە ژیانیدا بەکردەوە سەلماندبووی؛ ژیانێکی دووره پەرێزی و تەریک کەوتنەوە لە شاری؛ بەڕێگە چارەی ئەم گرفتانە دەزانی. بەو پێیە بەڕای ڕۆسۆ؛ بنەماڵەی ئۆلمار کە دوور لە کۆمەڵگا و شار دەژیان بە بنەماڵەیەکی ئایدیال لە قەڵەم دەدران. هەر لەم پەیوەندییەدا ئەو ئێمیل و سۆفیی جۆرێک ڕاهێنابوو کە بۆ گەیشتن بە بەختەوەریی ڕاستەقینە واباشترە دوور لە شار بژین. بەڕای ئەو تەنیا کەسێک دەتوانێ نکوڵی بکا لە ژیانی دووره پەرێزی و تەریک لە کۆمەڵگا، کە لە واتا و چەمکی چاکە و داوێن پاکی تێ نەگەیشتبێ و چاکە و مەزناهییە واقعییەکانی بەلاوە گرینگ نەبێ. ڕۆسۆ لە " لێدوان سەبارەت بە سەرچاوەی نایەکسانی"دا، ڕاشکاوانە دەڵێ: "ئەگەر ئێمە بتوانین لە نێو خۆماندا بەختەوەریی بدۆزینەوە، ئەرێ باشە کە بێین لە بیروباوەڕی خەڵکیدا لێی بگەڕێین؟"[٥٦] بەو جۆرە پەروەردە و فێرکردنی ئێمیل لەسەر ئەو بنەمایە دامەزرا کە ڕۆسۆ دەیویست لە دونیایەکی نوقمی فەساد و گەندەڵی دا؛ پیاوێکی سەربەست و ئازاد لەو دروست بکا.

بەسەرنجدان بە رای ڕۆسۆ سەبارەت بە چەمکی ئازادی کە دەڵێ: "لە هیچکام لە جۆری حکوومەتەکاندا، ئازادیی بوونی نییە، بەڵکو ئازادی تەنیا لە دڵی مرۆڤی ئازاد دا هەیە کە بەردەوام لەگەڵیەتی."[٥٧]

ئێمیل بەو جۆرە تاریف دەکرێ: یەکەم ئێمیل دەبێ لە زۆر جێگەدا لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ. ئەو لە هیچ هەلومەرجێکدا، تەنانەت لە باری ئابووریشەوە، نابێ ئاتاج و چاو لە دەستی کەسانی دیکە بێ. لە خۆڕایی نییە کە ئێمیل فێری پیشەی دارتاشی کراوە. "دووهەم: ئێمیل دەبێ فێربێ کە هەرگیز نابێ بکەوێتە ژێر کاریگەریی و هێژموونیی کەسانی دیکەوە. ڕۆسۆ لە سەرەتای پەروەردەی



ئێمیلدا دەڵێ: ئەو متمانە بەخۆیە و سەربەستەو ملکەچی هیچ ڕێسایەک نییەو سەر لەبەر هیچ هێزێک دانانوێنێ. ئێمیل هەرچی دڵی حەزی لێ بێ دەیڵێ و دەیکا، چونکە لەوە ئاگادارە کە "هەر خۆی ئاغا و کوێخای خۆیەتی."[٥٨] ڕۆسۆ لە کتێبی دووەمدا دەڵێ: ئەو بە میتۆدگەلی جۆراوجۆر و لە سەرەتای منداڵییەوە لە ژێر چاودێریی ڕاهێنەرەکەی خۆیدایە. ئەم چاودێری و کۆنترۆڵە، لە ڕێگەی نهێنی و نەناسراوەوە و بە مەبەستی پێشگرتن لە بەستراوەیی ئێمیل بە بیروباوەڕی خەڵک و کەوتنە ژێر کاریگەریی کەسانی دیکەوە؛ دەکار دەکراو بەڕێوەدەچوو. ئەو فێری ئەوە دەکرا کە: ئەم تێڕوانین و بۆچوونە دەمارگرژانەیەی خەڵک سەبارەت بە و هەیانە؛ نابێ لەسەر ئەو شوێندانەربن.

هەروەها ئێمیل پێی ناگوترێ چ بکاو چ نەکا. کەچی لە بری ئەوانە، ڕاهێنەرەکەی بە تەدبیرەوە فێری دەکا کە لە هەلومەرجی ئاڵۆز و جۆراوجۆردا چ بکا و چۆن بەرپرسیارەتیی ئاکامی کردەوەکانی خۆی بگرێتە ئەستۆ.[٥٩]

هەروەکو ڕۆسۆ لە کتێبی ئێمیلدا باسی دەکا ئەو لەسەر ئەم باوەڕیە کە سەربەخۆیی منداڵ لە باری بیروڕاوە زۆر کەمتر ئازاری دەدا لەوەیەکە داوای لێبکەین منداڵێکی بەگوێ و گوێڕایەڵ بێ؛ چونکە بەگشتی لە ئاکامی بارستایی قورسی چاو لەدەستی و بەستراوەیی دایە کە مرۆڤی باوەڕمەند بە ئەخلاق؛ کڕنۆش دەبا و سەردادەنوێنێ، نەوەک بە هۆی پەیڕەوی کردن لە ویست و داخواز و کەڵکەکەڵەی دەروونی (هواوهوس) ڕاهێنەرە ڕاڕاییەکەی.[٦٠] بە واتایەکی سادەتر مەبەستی ڕۆسۆ ئەوەیە کە ڕاهێنەر دەبێ بەپێی ڕەوشتی قوتابییەکەی، هەڵسوکەوتی دەگەڵ بکا: تەمبێ کردنی منداڵان نابێ بە مەبەستی سزادان بێت. چونکە ئەو ئازارانەی بە منداڵ دەگا دەبێ ئاکامی ڕاستەوخۆ و سروشتیی هەڵەکانیان بێ و بە هیچ شێوەیەک نابێ فەرمانی بەسەردا لێ بدرێ و تەنانەت نابێ بهێڵین کە منداڵ وا هەست بکا ئێمە بەزۆرەملێ بەسەریدا دەسەپێنین. منداڵ تەنیا دەبێ ئەوەندە بزانێ کە ئێوە لە چاو ئەو بەهێزتر و گەورەترن و هەر ئەوەش وادەخوازێ کە لە ژێر چاودێری و فەرمانی ئێوەدابێ.

هەروەکی دەبینین لێرەدا منداڵ بە شێوەیەکی دەستکرد پارێزراوە لە کاریگەریی و دەسەڵاتی کەسانی دیکە. ئێستا بەڕای خوێنەر، ئایا ئەم شێوە

پەروەردەیە، ئێمیل والێدەکا بەهێزی عەقڵ و تێگەیشتنی خۆی چاک و خراپ لێک هەڵاوێرێ؟ دیارە کە ئەودەمەی ئێمیل وای لێدێ بێتە نێو کۆمەڵگاوە؛ ئیدی ئەو "لە خەم خەلساوە و لە کۆت و بەندی دەماردەگرژیی و کاریگەریی کەسانی دیکەوە دەربازبووە." بەڵام ئایا لەو یاسایانەش کە ڕاهێنەرەکەی بۆی داناوە و فێری کردووە سەربەست ئازادە؟ یا ئەوەی کە ئێمیل تەنیا گرینگی بە بیروباوەڕی گەورەکان دەدا؟[٦١] ئاشکرایەکە هەتا ئێرە ئێمیل؛ وێڕای بارهێنان و پەروەردەکرانی؛ بووەتە پیاوێکی بەستراوە بە ڕاهێنان و پەروەردەوە.

ڕۆسۆ لە "نامە بۆ لامبێر"دا دەنووسێ: "خۆشی و چێژی سێکس دەبێتە هۆی ئەوەی کە ژن و پیاو گرێدراوییەکی پتەویان پێکەوە بێ و لە هەر شوێنێک کە پیاو و ژن پەیوەندییەکی سروشتی و پتەوی سێکسی پێک ببێنن ئاکاری سێکسیی یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ دەبێ و ئاراستەکان دیاری دەکا.[٦٢] ڕۆسۆ زۆر بەکەمی حەزدەکا لە پەروەردە و ڕاهێنانی سوفی و ئێمیلدا، باس لە بەستراوەیی سێکسیی ئێمیل بە سۆفییەوە بکا. ئەو بەردەوام لە کاریگەرێتی سێکسی پیاو بەسەر ژنەوە؛ دەدوێ هەتا کاریگەریی سێکسی ژن بەسەر پیاوەوە. بەڵام ئەو هەر لە سەرەتاوە؛ گرینگییەکی ئەوتۆ نادا بەچاو لە دەستی و بەستراوەیی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە لە کۆمەڵگای پیاومەزندا لە نێو ژن و پیاودا هەیە. ڕۆسۆ ئاگاداری ئەم بەستراوەیی و جیاوازییە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە بوو. لە هێندێ لە نووسراوەکانیشیدا بەپێی پێویست نەک بە هۆی کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان؛ ئەوشتانەی بردبووە ژێر پرسیارەوە. ڕۆسۆ زۆر جاران بەم پێش گریمانەیە هەڕەشەی لە ژنان کردبوو. ئەوان بەپێی ڕۆڵی سێکسسی خۆیانەوە و ئەو ڕەفتارەی دەگەڵ ئەم ئەرکە دەگونجێ؛ لەڕاستیدا وەک کۆیلەی پیاوان سەیریان دەکرێ و ئەگەر نەتوانن بە کەڵک وەرگرتن لەو زیرەکییەی هەیانە (واتە بەکەڵک وەرگرتن لە کێشی سێکس)، کەموکوڕییەکانیان قەرەبوو بکەنەوە، هەروا لە کۆیلەیەتیی پیاواندا دەمێننەوە لە بری ئەوەی ببنە هاوژێنیان.

هەموو شتێک دژ بە ژنانن واتە ئەوانن کە بەهەڵە دەچن و ترسنۆکن، تەنیا شتێکی ژنان هەیانە جوانی و زیرەکییەکەیانە، ئەگەر جوانییەکەیان بژاکێ و



هەڵپڕووکێ: تەنیا ئامراز و کەرەسەیەکی کە بۆیان دەمێنێتەوە پیاوانی پێ بخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە و شتێکیان لێ وەرگرن؛ جامەلۆسکێ و دەم تەڕییە."[٦٣] بەو پێیە هەروەکی دەبینین تەنیا هێزێک کە ژن هەیەتی بۆ وروژاندن و زاڵ بوون بەسەر پیاواندا هێزو وزەی سیکسییە و ئەگەر ئەم وزەیەی نەمێنێ تەنیا بەفریودان و جامەلۆسکێ* دەتوانێ ویستەکانی خۆی دابین بکاو پێیان بگا. بۆیەشە ڕۆسۆ ئامۆژگاریی ژنان دەکا بۆ ئەوەی کە حەول بدەن، کچەکانیان وەک ژنێکی لێوەشاوە و بەدامودەستوور باربهێنن و ئەوجار بە کۆمەڵگایان بسپێرن. دایکان لە پەروەردەکردنی کچەکانیاندا نابێ حەول بدەن دژی سروشت ڕاوەستن و دەگەڵی بەشەڕبێن و کچان وەک پیاوان پەروەردەبکەن. ئەو لە ئێمیلدا دەنووسێ: "دڵنیابن ئەم جۆرە پەروەردەکردنە هەم بۆ خۆیی[ئافرەت] باشە و هەم بۆ ئێمەی پیاو."[٦٤]

ئاشکرایە تێگەیشتنی ژن لە دامودەستووری کۆمەڵایەتی هەر ئەم پەروەردەو فێرکاریانەن کە ئەو پێویستە فێریان بێ. بۆ ئەوەی بتوانێ لە نێو خەڵکدا لەگەڵ پیاوان هەڵسوکەوت بکا. چونکی ژنان لەهەر هەلومەرج و پێگەیەک دابن، پێویستیان بە داوەری و پشت ڕاستکردنەوەی پیاوان هەیەو بەردەوام دەبێ هەوڵ بدەن لەبەر چاوی پیاوان «باش» بن. میۆدی ڕۆسۆ بۆ پەروەردەکردنی ژنان؛ شێوازێکی تەواو سەرکەوتوانەیە لە ئاراستەی کەڵک وەرگرتن لە ڕەگەزی فریودەری ئەوان. بەڕای ئەو ژنان بۆوە خولڨاون پەسندی دڵی پیاوان بن و بێجگە لە وزەی سێکس هێزێکی دیکەیان نییە.

ئەو فەیلەسووفانەی لە هێزو ڕۆڵی بیروڕای گشتی تۆقیون چۆن چاوەڕوانییان هەیە ژنان ببنە کۆیلەی ڕەگەزی بەرامبەریان واتە پیاوان؟ ئەوان دەبێ بزانن کە ژنان پێویستە لەڕووی پەروەردەی واقعییەوە لە پێکهاتەی کەسایەتیی خۆیاندا، دابین بکرێن و خۆیان و ژیانیان ڕێکوپێک و دەوڵەمەند بکەن و لەبەرامبەر پیاواندا داکۆکیی لە مافە کۆمەڵایەتییەکانیان بکەن.

ڕۆسۆ هەروا پەرۆشی وزە و کاریگەریی ژنان بەسەر پیاوانەوە بوو. هاتبوهوە سەر ئەم بیروڕایەش کە ویست و هەستە سێکسییەکانی پیاو لەژێر

* جامەلۆسکێ: مستاوچێتی، دەمتەڕی.

کاریگەریی ژنان دایە و بەوانەوە بەستراوەتەوە و تەنیا لەم ڕێگەیەوە کە ئەوان دەتوانن پیاوان سەرکوت بکەن یا ئەوەی کە پوانییان لێوەرگرن.

ئەم لە دژواز وێژییەکدا دەڵێ: ئەم بەستراوەییە بۆ هاوکێش کردنی دەسەڵاتی سروشتیی پیاوان؛ پێویستە. بەواتایەکی دیکە ڕۆسۆ لەلایەکەوە دەڵێ: ئازادی لە پێداویستییە سەرەکییەکانی خەڵکە و لە لایەکی دیکەوە؛ دیلێتی و بەستراوەیی سێکسیی پیاو بە ژنەوە؛ بەواقعێک لە قەڵەم دەدا کە سروشت خوڵقاندوویەتی.[٦٥]

یەکەمین شوێنێک کە ڕۆسۆ بنەماکانی پیاوەمزنیی تێدا دێنێتەگۆڕێ، دەزگای بنەماڵەیە. ئەو لە شیکردنەوەی ژیانی سۆفیدا، کۆنترۆڵ و چاودێریی بەسەر ژیانی ئافرەتدا لەلایەن سەرۆکی بنەماڵەوە [پیاو] بەشتێکی ئێجگار پێویست دەزانێ و بەوپێیە، ئەو هەلومەرجەی کە ئێمیل لە بنەماڵەدا خوڵقاندوویەتی، بە هەلومەرجێکی تاقەت پڕووکێن لە قەڵەم دەدا کە هیچ ژنێک خۆی لەبەر ڕاناگرێ. بۆ وێنە سۆفی دەبێ خۆشی و بەختەوەریی خۆی لە ڕەزامەندی و بەختەوەریی پیاوەکەیدا بەدی بکا و هەموو وزەی خۆی بۆ ڕەزامەندیی و ڕێز و حورمەتی ئەو دەکار بکا بۆ ئەوەی بکەوێتە بەردڵی پیاوەکەی. ئەو ناچارە و ئەرکی خۆیەتی کە داوەری و بیروڕای ئێمیل لەسەر خۆی بێ ئەملا و ئەولا قبووڵ بکا و ڕازیی بێ بەو بێدادییانەی ئێمیل دەیان کا. ڕۆسۆ باوڕی وایە کە: "یەکەمین و گرینگترین خەسڵەتی ژن؛ لەسەرەخۆیی و سێبورییە. ژن بۆ ئەوە خوڵقاوە ملکەچ و گوێڕایەڵی پیاوبێ- ئەولێوانلێوە لە هەڵەی جۆراوجۆر و ئەگەر خراپەیەکیش هەبێ، لە ژنەوە سەرچاوەدەگرێ. هەر بۆیەش دەبێ هەر لە منداڵییەوە لە زوڵم بێدادیدا گەورەبێ و بۆ ئەوەی دواتر خۆلەبەر ئەم زوڵم و ستەمە ڕاگرێ کە مێردەکەی بەسەریدا دەی سەپێنێ و پێویستە دەنگی دەرنەیە(٦٦). ڕۆسۆ لە درێژەی  باسکەیدا داوا لە ژن دەکا بە ڕەنگاریی پیاو نەبێتەوە و پێیوایە ڕۆسۆ لە پێیوایە ژان و ئازارەکانی ژن نەک دۆخەکە بەرەو باشی نابا، بەڵکو نێوچاوان تاڵیی ژن لەبەرامبەر مێردەکەیدا؛ دەبێتە هۆی خراپتربوونی دۆخەکە.

تەواوی ئەم تایبەتمەندی و چلۆنایەتی و ئاکارانەی باسمان کردن؛ ڕۆسۆ بە مەبەستی بەکارهێنانیان لە پەروەردەی ژنێک بەناوی سۆفیدا گەڵاڵەی کردوون و داوا لە ئێمیل دەکا دڵنیابێ لەوەی کە هاوسەرەکەی ئەو؛ مووبەمووی ئەم ڕێسایانە



بەڕێوەدەبا و هیچ کات بیر لە تێکدان و شێواندنی ماڵی پیاو "وەک گەورەی ماڵێ" ناکاتەوە.

ژنی ئایدیال لەڕوانگەی ڕۆسۆوە ئەو ژنەیە کە "ئەوەندەی هێزی لەجەستەی دایە هەوڵ بدا منداڵێکی تۆکمەو بەهێزی لێ بکەوێتەوە و هەروەها بتوانێ کاروبارەکانی دیکەش وەک ماڵدارێتی، منداڵ بەخێوکردن و... ڕاپەڕێنێ چونکە لاوازیی پیاوانی داهاتوو، ئاکام و دەرەنجامی لاوازیی ژنانە. ژن دەبێ هەتا گڵەبانی چاوی دەکەن، داوێن پاکی و بێخەوشیی خۆی بۆ مێردەکەی بپارێزێ. ئەو پێویستە و ئەرکی سەرشانێتی کە لە دواندنی مێردەکەی و بەخێوکردنی منداڵەکانیدا؛ ژیرانە بجووڵێتەوە و ڕوون و ئاشکرایە ئەو (ژن) دەبێ بەدڵی مێردەکەی خۆی برازێنێتەوە. ژن دەبێ وریابێ لە هەر هەلومەرجێکدا هێمنایەتیی دەروونی مێردەکەی تێک نەداو سەری لێ نەشێوێنێ و کاتەکانی خۆی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی تەرخان بکا و ئەگەر دەستی بەتاڵ بوو خەریکی خوێندنەوە و ناسیی پیاوان بێ یا ئەوەی کە کاتەکانی خۆی بۆ وەدەستهێنانی زانیاریگەلێکی دڵخۆشکەر؛ تەرخان بکا کە تەنیا بابەتگەلی زەوقی و سەلیقە و حەزەکانی لە خۆدەگرن.[٦٧] سەرەڕای تەواوی ئەو شتانەی گوترا، ڕۆسۆ لە ئێمیل و هێلوییزی نوێدا؛ "ژیرێتیی ژنانی نەک هەروەک پەتایەک بۆ مێردەکانیان لە قەڵەم داوە، بەڵکو لەوانەیە ئەم ژیرێتییە بۆ منداڵان و دۆستان و خزمەتکاران... ببێتە تاعوونێک. چونکە هەڵکەوتەیی و هۆشیاریی ژن دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەچاوێکی سووکەوە لە ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانی بڕوانێ و خۆی بێنێتە ڕیزی پیاوان.[٦٨] دواجار لە ڕوانگەی ڕۆسۆوە، ژنان پێویستە زۆر شتی دیکە فێربن، بەڵام تەنیا ئەو شتانەی کە بەکەڵکیان بێ و بەباڵایان بڕابێ. سۆفی وەک ئافرەتێک بۆیە خراوەتە بەر پەروەردە و ڕاهێنان؛ بۆ ئەوەی بکەوێتەبەر دڵی مێردەکەی، بەجۆرێک کە ئێمیل لەکاتی دواندنیدا هەست بە مەترسی نەکا. بەقسەی ڕۆسۆ؛ سۆفیی خۆش فکرە، بەڵام ڕۆشنبیرنییە و هیچ کاتێکیش وەک ڕۆشنبیرێک خۆی نانوێنێ، بەڵام گەمژەش نییە. لە بواری زانست و مەعریفەوە مەودایەکی زۆر لە نێوان ئەو وئێمیل دایە. ئێمیل نەک هەر مێردی سۆفییە، بەڵکو مامۆستا و ڕاهێنەر و دۆزەرەوەی ڕێگەچارەی هەموو گرفتەکانیشێتی[٦٩] لە بەرامبەردا،

ژن بێجگە لە وەی هاوسەر و گراویی پیاوە، وەکو قەرەواشکیش* لە خزمەتی پیاودایە و ئەگەر بێتو ژنێک سەرنج نەداتە ئەو پێوەرانەی رۆسۆ دەستنیشانی کردوون، ئەوە ژنێکی سەرەڕۆیە کە دەی هەوێ خۆی وەک پیاوان بنوێنێ و بەپێچەوانەی سروشت بجوولێتەوە.(٧٠)

رۆسۆ؛ جارێکی لە یادداشتەکانی خۆیدا سەرنج و گرینگییدا بە بۆچوونە رادیکاڵەکەی ئەفلاتوون سەبارەت بە یەکسانیی پەروەردە بۆ ژن و پیاو، بەڵام دەمودەست پاساوی بۆ دێنێتەوە کە، ئەم شێوە پەروەردەکردنە دەبێ لە "ئاقارێکی ئەرێنی" دا بەڕێوەبچێ. واتای "ئاقاری ئەرێنی" لە بنەما سەرەتایی و سروشتییەکانی رۆسۆدا بەو مانایەدێ کە: "پەروەردە و راهێنانی ژنان دەبێ جۆرێک بێ کە لەگەڵ سروشتیان یەک بگرێتەوەوە و بەپێی ئەرکەکانیان بێ.(٧١) ئەوەش روون وئاشکرایە کە ئەم شێوە پەروەردەیە تەنیا لە کولتووری باوکمەزنیدا باوە. پاساوی رۆسۆ لەم بارەیەوە ئەوە زات جەوهەری ژن و ئەو چارەنووسەی سروشت بۆی دیاری کردووە، وادەخوازێ کە ئەو "داوێن پاکی و بێخەوشیی خۆی" کە یەکێکە لە گرینگترین بنەما ئەخلاقییەکان بپارێزێ و ئەگەر ژنێک ئەم داوێن پاکییەی خۆی بدۆڕێنێ؛ بێجگە لە چارەڕەشی و نەهامەتی و شاربەدەری؛ چارەنووسێکی دیکەی نابێ.(٧٢) لێرەدا پێویستە ئاماژەم بەم خاڵە بکەین کە بەڕای رۆسۆ، شوناسی پیاوان بەپێی ئاستی ئازادییەکانیان دیاری دەکرێ، کەچی شوناسی ژنان؛ بەپێ رادەی داوێن پاکی و حەیاو شەرمیان.

پییەربێرگلین pierre Bwurgelin لەسەر ئەم باوەڕەیەکە، رۆسۆ بەردەوام دەگەڵ خۆیداکێشەی هەیە و لە ململانێدایە. لەبەر ئەوەی؛ داوێن پاکی کە تەوەری سەرەکیی پەروەدەی سوفییە، هەڕەشەیەکە بۆ سەر ئەو تەوەرە پەروەردەییەی دیکەی، واتە ئازادی؛ کە بۆ ئێمیل لەبەر چاوگیراوە(٧٣).

بەڕای بێرگلین؛ ئەم گەنگەشەیە بە مەرجێک بەدژی رۆسۆ دەبێتە گەنگەشەیەکی سەرکەوتوانە؛ کە لانیکەم وەڵامدەری هەستەکانی ئەو بەنیسبەت ژنانەوە بێ و لە رێگەی ئەم گەنگەشەیەوە بتوانێ خەزێنەیەکی بەنرخی وەک

* قەراواش: کچ و ژنی خزمەتکار لە ماڵێ گەورە بەرگزادان. (و. ک)



داوێن پاکیی ژن بپارێزێ. بەو پێیە، سۆفی بۆیە حەزی لە داوێن پاکیی ژنە؛ چونکی ئەم تایبەتمەندییە بە مایەی شانازی و مەزنیی ئافرەت و بە تەنیا رێگەی بەختەوەریی راستەقینەی ئەوی دەزانێ و لە بەرامبەردا، ژنێکی ناپاک بێجگە لە سەرشۆڕی و شەرمەزاری هیچ شتێکی نییە."(٧٤) بەو شێوەیە دواچارەنووسی سۆفی بە هەبوونی ئەم خەسڵەتەوە گرێدراوە. رۆسۆ دوو هۆکار بۆ پێویست بوونی دانانی یاساگەلی ئەخلاقی بۆ ژنان دێنێتەوە کە ئەم هۆکارانە نەک هەر لە رووی ناوەڕۆکەوە لێک دژن بەڵکو بە تەواوەتی جیاوازن لە یاسا ئەخلاقییەکانی پیاوان؛ یەکەم ئەوەی کە: ژن بەمەرجێک ژیانی خۆی بەدڵ دەبێ و لە ژیانی قایل دەبێ کە بوونی ئەو بۆ ئەوانی دیکە؛ بەتایبەتی بۆ پیاوان دڵ خۆشکەربێ. دووهەم ئەوەی کە ژن نەک هەر بەنیسبەت پاراستنی حەیا و داوێن پاکیی خۆیەوە هەستیاربێ، بەڵکو بەتەواوەتی ئەم هەستەی خۆی بۆ مێردەکەی و بۆ خەڵک بسەلمێنێ؛ چونکە لەڕوانگەی رۆسۆوە، چووکەترین فەساد و گەندەڵی لەژندا "دەبێتە پەڵەیەکی رەش و پینەی سەرشانی کە لە نێوخەڵکدا شەرافەتی ژن زیاتر لە هی پیاو دەشکێنێ." هەر بۆیەش ژن پێویستە ئێجگار وریابێ بۆ ئەوەی ناموس و ئابڕووی خەوشدار نەبێ. بەگشتی دەکرێ بڵێی لە روانگەی رۆسۆوە خەسڵەتەکانی ژن بەکورتی بریتیین لە:

"ژن نابێ تەنیا بەحورمەت بێ بەڵکو دەبێ رێزیشی لێ بگیردرێ. تەنیا جوانی بەس نییە بۆ ژن. بەڵکو پێویستە لەبەردڵان بێ و پەسندبێ. ژیری بە تەنیا بەس نییە بۆ ژن؛ بەڵکو دەبێ بە ژیرێتی بناسرێ. شەرافەتی ژنان تەنیا لە ئاکاریاندا نییە، بەڵکو دەبێ دەگەڵ ناموس و ئابڕوویان بێ. نالوێ و مەحاڵە ژنێک بەخراپە ناوی زڕابێ و لە هەمانکاتدا بهەوێ بەشەرم حەیا بێ. پیاو بۆ راپەڕاندنی کارە باشەکانی خۆی لە سەر قسە و بۆچوونی خۆی بڕیاردەدا، چونکە ئاغاو کوێخای خۆیەتی و بۆی هەیە بیروڕای گشتی بەهێند وەرنەگرێ. بەڵام کاتێک ئافرەت کارێکی باش دەکا تەنیا نیوەی ئەرک و بەرپرسیارەتیی خۆی بەڕێوە بردووە؛ چونکە بیروڕای گشتی و داوەریی خەڵک لەسەر کار و ئاکاری ئەو رێک بارتەقای کردەوەکانی گرینگیی هەیە. بەمجۆرە؛ لەوشتانەی باسمانکردن بەو دەرەنجامە دەگەین کە شێوەی پەروەردەو راهێنانی ژنان نابێ

وەکو شێوەی پەروەردەی ئێمەی پیاو بچێ. بیروڕای گشتی و داوەریی خەڵک لە سەرپیاوان وەک مەرگ و کۆتایی داوێن پاکی و خۆپارێزییەو بۆ ژنان پاڵپشتی ناموس و داوێن پاکییە".[٧٥]

ڕۆسۆ بەپێچەوانەی بیروڕای سوکرات و ئەفلاتوون، بەڵام هاوڕا دەگەڵ بیرمەندانی تری یۆنانی، لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە ئێجگار پێویستە جیاوازی دانرێ لە نێوان بنەما ئەخلاقییەکانی پیاوو ژندا. ئەم لە بەرهەمەکانیدا نەک هەر جەخت لەسەر جیاوازیی ئەم پێوەرگە لەدوولایەنانە دەکاتەوە، بەڵکو تێکەڵاوییەکی زێدەڕۆیانە لەم پێوەرانە دەخاتەڕوو.

لەم ڕووەوە، ژن بە پێودانگی ئەم ڕوانگە و بۆچوونانە هەڵدەسەنگێندرێ کە پیاو دەسنیشانی دەکا و بەنیسبەتی ئەو هەیەتی و هەروەها بەپێی یاساگەلێک کە پیاو هەر لەم پەیوەندییەدا دایناون و بەو جۆرە بەرپرسیارەتییەکانی ژنان لە کولتووری باوک مەزنیی ئەواندا پێناسە و دەستنیشان دەکرێن. بە واتایەکی دیکە لە ڕوانگەی پیاومەزنیی ڕۆسۆوە، تەنیا پێودانگ و ڕبەیەک بۆ هەڵسەنگاندنی ژن هەیە، ئەویش شەرم و حەیا و داوێن پاکییە، هەڵبەت داوێن پاکییەک کە پیاوان پێناسەیان کردووە.

لە حاڵێکدا پیاوان بە پێوەرگەلی جۆراوجۆر و سەربەخۆ، کە بۆ خۆیان دیارییان کردوون، بەهاکانی خۆیان هەڵدەسەنگێنن؛ بەو پێیە لە خۆڕایی نییە کە پەروەردە و فێرکارییە ئەخلاقییەکانی سۆفی لەلایەن ڕۆسۆوە بە شێوەی بڕیارگەلێکی لۆمەکارانە (هجو آمیز) خرانە بەرباس و لە کولتووری پەروەردەیی هاوچەرخیشدا شتێکن لە تەوس دەچن.

ئەم کارانەی سۆفی دەبێ ڕایانپەڕێنێ یا بۆ ڕاپەڕاندنیان هاندەدرێ، تەنیا بۆ خۆنواندن و ڕواڵەت سازین . ئەو بەپێچەوانەی ئێمیل کە وەک پیاوێک دەستی ئاوەڵایە، کچێکە کە دەبێ زەجرو ئازارێکی زۆر بچێژێ بۆ ئەوەی ئاکارەکانی خۆی لەگەڵ خەڵک یەک بگرنەوە.

ئەو فێردەکرێ کە چۆن بەمەبەستی خۆنواندن دەبێ پیانۆ بژەنێ و دەستە سپیکەڵانەوە ناسکەکانی خۆی بەسەر دوگمە ڕەشەکانی دابێنێ. هەروەها هەر قسەیەکی لە زاری دێتەدرێ قسەیەک نییە کە بەپێی هەستەوەری و ویست و



قازانجەکانی گوترابێ، بەڵکو قسەکانی ئەو شتانەن لە مێشکیان ئاخنیوە و فێریان کردووە کاریگەریی هەبێ لەسەر بیسەرانی خۆی بەتایبەت ئێمیل. سۆفی خۆی کچێکی هێدی و هێمنەو "بەردەوام قسەیەک دەکا کە بەدڵی خەڵکە و خەڵک پێی شاد و بەکەیف دەبن"[٧٦]

پەروەردەی ئەخلاقیی سۆفی تەرخانکراوە بۆ بەهێزکردنی ئینتما زاتیە ژنانەییەکان. کورتە و پوختەی تەواوی ئەم پەروەردە فێرکارییانە ئەم ڕستەیەیە؛ ئەوپەڕی ملکەچ و گوێڕایەڵی.

ئەو فێری ئەوە دەکرێ کە خۆببوێرێ لە ئامرازی ویستە دەروونییەکانی و بیانشارێتەوە چونکە پێویستە بەپێی ئەو شتە بجووڵێتەوە کە بیروڕای گشتی و کۆمەڵگا لەوی چاوەڕوانی دەکەن. هۆی تەواوی ئەم ئاستەنگی، نهێنی کاری، خۆڕانان و خۆبواردنانە ئەوەیە کە سۆفی کوڕ نییە و سروشت ئەوی بەکچ خوڵقاندووە. ڕۆسۆ سەبارەت بەوەش ڕاشکاوانە دەڵێ "کچان هەر لە سەرەتای منداڵییەوە دەبێ بەرتەسک بکرێنەوە و بە درێژایی تەمەنیان دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵ بن و هەڵسوکەوتەکانیشیان تەواو لەژێر چاوەدێری دابێ و بەرتەسک بکرێنەوە. هەر لە منداڵییەوە دەبێ لەگەڵ تاڵی و سوێرییەکانی ژنان بۆ ئەوەی کوێرەوەریی و تاڵییەکانی سەردەمی گەورەییان ئازاریان نەدا. دەبێ حەز و هەوەسەکانیان بۆ وەرگرتن و دابینکردنی ویستی کەسانی دیکە کۆنترۆڵ بکرێن. کچان لە ئاکامی ئەم بەرتەسک کردنەوانەدایە کە هێدی و هێمن و گوێڕایەڵ باردێن؛ ئەوەش ئەو شتەیەکە لە تەواوی ژیانیاندا پێویستییان پێیەتی. قەت نابێ ئیزنی ئەوە بدرێ بە ژنان کە لە ئاکار و هەڵسوکەوت و داوەری کردندا خۆیان لە پیاو بەزیاتر دانێن یا خۆیان بێننە ڕێزی پیاوان. ئەوان دەبێ وەک بوونەوەرێکی ژێردەست لەژێر چاودێری و داوەریی هەمیشەیی پیاوان دابن."[٧٧]

سۆفی بەپێی ئەم پەروەردە و ڕاهێنانانەی دیتوویەتی؛ لەسەرێتی بەوپەڕی شێلگیرییەوە، لە دوو قوناغی ژیانی خۆیدا، هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکا. یەکێکیان لە قۆناغی بەر لە شووکردندا کە ئەو لە سەرێتی لەبەردەم بیروڕای گشتی و لەبەر چاوی خەڵک جوان بجوڵێتەوە، دووهەم قۆناغیش، قۆناغی دوای زەماوەند (شووکردنە) کە ئەو لەم قۆناغەدا نەک

هەردەبێ لەبەردەم مێردەکەیدا وریای هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی خۆی بێ، بەڵکو لەسەرێتی لە هەموو هونەرەکانی دڵبەری و دڵڕفێنی و فریودەریش بزانێ و شارەزابێ. بەڕای ڕۆسۆ، هەڵسوکەوتی دڵڕفێنانە و دڵبەرانەی ژنان بۆ بزواندن و ورووژاندنی هەستەوەریی سێکس و شەهوەتی پیاوان گرینگە و دەبێتە هۆی ئەوەی کە مێرد ژنەکەی خۆی زیاتر خۆش بوێ، هەر بۆیەش ڕۆسۆ دژی شێوە پەروەردەییەکانی کڵێسایە و ئیدانەیان دەکاو باوڕی وایەکە پەروەردە و ڕاهێنانەکانی کلێسا دەبنە هۆی ئەوەی کە ڕووگەشیی و دڵۆڤانیی ژنان بە نیسبەت مێردەکانیان لە ناوبچێ و پیاوان ناچار دەکا هەڵسوکەوتی جۆراوجۆریان دەگەڵ ژنەکانیان هەبێ، بۆیە ئەو حەرەمسەراکانی ڕۆژهەڵات بۆ ژنان بە باش دەزانێ و پێشنیاریان پێدەکا و دەڵێ: "من بە ئاواتم ژنە گەنجەکان هەر بەوجۆرەی ئافرەتانی لاوی ڕۆژهەڵاتی لە حەرەمسەراکاندا دەیکەن؛ ئەمانیش بۆ ڕەزامەندی و دابینکردنی هاوسەری داهاتووی خۆیان تواناکانیان بپشکوێنن و پەرەی پێ بدەن. بەدڵنیاییەوە ئەو کارە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی و دڵگەرمیی مێردەکانیان و ئەوان هاندەدا پاش ڕاپەڕاندنی کارو بارەکانیان نەکەونە شوێن هیچ خۆشی و ڕابواردنێک لە دەرەوەی ماڵ."[٧٨] ئێستاش بەسەرنجدان بەوەی کە ژنە گەنجەکان لەبەردەم گەلێک تابۆوهێڵی سووردان و ئەزموونی سێکسیان نییە، لەسەریان فەرزە بۆ پەرەپێدانی هۆگری و خۆشەویستی لە دڵی مێردەکانیاندا بەنیسبەت خۆیانەوە، ویست و حەزە سێکسیەکانیان بۆ دابین بکەن. سۆفی، ئەو ژنەی ڕۆسۆ لە کتێبی ئێمیلدا وەک ژنی ئایدیال ناوی دێنێ، بەراستی دوو ڕۆڵی لێکدژ دەبینێ: ڕۆڵێکیان، ڕۆڵی ژنێکی کەیخودای دیوەخان و بەداموودەستوورو رووخۆشە، ڕۆڵەکەی دیکە، ژنێکی دوورەپەرێزی گۆشەگیر. ئەو ڕای وایە ژنان پاش شووکردن دەبێ لە ماڵێ نەیەنە دەرێ و هەر خەریکی ماڵداریێتی بن، لەبەر ئەوەی کە ئەوان خراپەکار و نەخۆشن پێیان وایە ژنانی بەمێرد خاوەنی ئازادیی زیاترن لە چاو ئەو کچانەی لە هەوڵی پاراستنی لایەنە باشە ئەخلاقییەکان دان. بەواتایەکی دیکە ئەو ژنە بەمێردانەی لە ماڵێ وەدەردەکەون، هەڵگری مۆراڵی هەرزەیی و خراپەکارین.[٧٩]



ڕۆسۆ لە هێڵوییزی نوێدا و لە وتووێژی نێوان ژولی و کلایر clair دا، بەمجۆرە باس لە دۆزەخ و پێگەی ژنانی بەمێرد دەکا: "ئەودەمەی نەچووبووە ماڵی مێرد، کچێکی سەربەست و بەرپرسیار بوو لە هەمبەر ئاکار و هەڵسوکەوتی خۆیدا، بەڵام ئێستا کە هەموو شتێ گۆڕاوە، ئەو زەماوەندی کردووە و دەبێ بەنیسبەت ئابڕوی خۆیەوە وەڵامدەری کەسێکی دیکە بێ. ئەو نەک هەر هیواو متمانەی خۆی بە بارمتە داناوە بەڵکو پشتی لە ئازادییەکانیشی کردووە. ژنێکی داوێن پاک و بێخەوش نابێ هەر لەلای مێردەکەی بەڕێز و حورمەت بێ بەڵکو دەبێ هەر بەڕێز و حورمەتەوە دەستی قەدری لێ بنێن. ئەگەر مێردەکەی بەتاوانباری بزانێ، ئەوە شیاوی لۆمە و سەرکۆنەیە، ئەگەر تووشی کارێکی هەڵەش بێ هەتا ئەودەمەی پیاوەکەی لێی دڕدۆنگ و بە گومانە، هەروا بەتاوانبار لە قەڵەم دەدرێ، ژن لە هەر حاڵێکدا دەبێ بە شێوەی ڕواڵەتی خۆی بپارێزێ، چونکە ڕواڵەت سازی بەشێکە لەئەرکەکانی ئەو.[٨٠]

بەڕای جان جاک ڕۆسۆ، ژنێکی بەمێرد، بە شێوەی یاسایی و ئەخلاقی "ژنێکی چارشێوبەسەرە." بوونەوەرێکە متمانەی بە ویژدان و داوەریی خۆی نییە. ڕۆسۆ ئەوەندە چۆتە پێشێ کە بۆچوونێکی زێدەڕۆیانەی سەبارەت بە ئازادیی ژنان لە هەڵبژاردنی ئاییندا خستۆتەڕوو. بەڕای ئەو ژنان نابێ بۆ خۆیان ئایینی خۆیان دیاری بکەن. "چونکە هەر وەکو ئاکاری ژنان دەبێ پاشکۆی بیروڕای گشتی بێ و بەیڕەوەیی بکا، ئیمان و متمانەکەشی دەبێ لەژێر چاودێریی گەورەکان دابێ."[٨١] بەپێچەوانەی ئێمیل کە هەرکات خۆی ناسی ، هاندەدرێ بیر لەوە بکاتەوە کە چ ئایینێک هەڵدەبژێرێ، سۆفی بێ ئەملا و ئەولا دەبێ بچێتە سەر ئایینی دایکی؛ هەر وەک چۆن دایکیشی ئایینی خۆی لە باوکی یا لە مێردەکەی وەرگرتووە. ئەو وەک هاوسەرێک لەسەرێتی بچێتە سەر ئایینی مێردەکەی خۆی. ڕۆسۆ لەم ڕووەوە خوێنەرەکانی دڵنیا دەکاتەوە کە هیچ ژنێک لەسەر ئەوە تووشی ئازار و ئەشکەنجەی قیامەتێ نابێ؛ چونکە ئەگەر دایک یان کچ تووشی ئەم هەڵەیە بووبێ، ئەم گوناح و تاوانە، بە شێوەیەکی سروشتی لەلای خۆدا، داوێنی ئەوان ناگرێ.[٨٢] ڕۆسۆ لە سەر ئەم باوەڕەیە کە ژنان پێویستیان بە دینداری و ئیمانداری نییە. چونکە ئەوان پەیڕەوی باوەڕی پیاوانن

و دەبێ لەسەر ئایینی ئەوان بن. ئەم بۆچوونەی رۆسۆ دەگەڵ ئەم باوەڕەی موسڵمانەکان یەکدەگرێتەوە کە ژن بە مرۆڤ نازانن و پێیان وایە رۆحی نییە و ناتوانن ئاینێک هەڵبژێرن.* رۆسۆ نەک هەرنەیتوانی ئالترناتیڤێکی جیددی بۆ ژنان بدۆزێتەوە کە لەسەر بنەمای ئەخلاق دامەزرابێ، لە بەڵگە لێکدژەکانی خۆیشی ناڕازی بوو. ئەو بەرنامە و پلانی پەروەردەیی سۆفیی، تەواو بە پێی دەمارگرژیی کۆمەڵایەتی، توندوتیژی، جیاوازی خستن و هەروەها بەپێی حەز و ویستەکانی ئێمیلدا رشتبوو. بەسەرنجدان بەو شتانە، رۆسۆ لە کتێبی ئێمیلدا ئیدعا دەکا کە " ئەمن زۆر جاران لەسەر ئەوە دووەم کە ئەگەر ئێمە جگە لە دەمارگرژیی گشتی هیچ یاسایەک بۆ ژنان لەبەر چاونەگرین، ئایا، ئاستی پەروەردە و راهێنانەکانی ئەوانمان دانەبەزاندووە؟ ئیزن بدەن بەر لە وەی کە رەگەزی مێینە واتە ئەوانەی ئێمەیان خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە؛ بەدەستی پیاوان تووشی لاڕێ بن (فەساد بکرێن) با پێتان بڵێم: یاسایەک هەیە لە سەرووی بیروڕای گشتی و هەر یاسایەکی دیکەو بەگشتی هەموو یاساکان لە هەمبەریدا سەری کڕنۆش دادەنوێنن، ئەم یاسایە کە لە راستیدا دادوەری بیرڕای گشتییە؛ ویژدانی خودی ئێمەی پیاوە.(٨٣) مەبەستی رۆسۆ لەم قسانە ئەوەیە کە ئێمە کاتێک دەبێ بیروڕای گشتی رەچاوبکەین و لەبەر چاوی بگرین کە دەگەڵ ویژدانمان یەک بگرێتەوە و دەگەڵی لە پەیوەندیدابێ. ئەرکی ژنان لێرەدا روونە، ئەوان دەبێ ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان بدەن بۆ ئەوەی ئاکار و هەڵسوکەوتەکانیان دەگەڵ هەردووک یاساکە، واتە بیروڕای گشتی و و ویژدانی خۆیان یەک بگرێتەوە. ئەگەر ئەوان نەتوانن خۆیان دەگەڵ بیڕوای گشتی رێکخەن دەبێ بگەڕێنەوە سەر ویژدانی خۆیان و پەیڕەویی لەو بکەن. دیارە ئەگەر ئەم دوو یاسایەش دەگەڵ پەروەردەی ژنان ناتەبابن، ئەو و پەروەردەیە کەموکوڕیی هەیە و ناتەواوە" بەواتایەکی دیکە ژنان لە هەمبەر بیروڕای گشتی و ویژدانی خۆیاندا بەرپرسیارن و لە سەریانە بەردەوام خۆیان دەگەڵ رێک بخەن. ئەگەر ئەوان

* دیارە ئەم بۆ چوونە تەواو موسڵمانان لە خۆوە ناگرێ و گشتاندنی هەڵەیە. بەڵام ئەگەر بگوترێ کە لە هێندێ ئایینزای ئیسلامیدا جۆرە روانگەیەکی کۆنە پەرستانە هەیە کە بەمجۆرە بیر دەکەنەوە بڕێک لەڕاستی دەچێ (وەرگێڕی فارسی).



نەکەونە بەر دڵی خەڵک، بەدڵنیاییەوە عەیب و ئیرادێکیان هەیە و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کەموکوڕیانەش دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ویژدانی خۆیان.

لێرەدا وێدەچێ هیچ هیوایەک نەبێ بە رێککەوتنی بیروڕای گشتی و ویژدان، و هەر وەک رۆسۆ گوتوویەتی؛ ئەگەر ئەوانە یەک نەگرنەوە و ناتەبابن، پەروەردەی ژنان سەرکەتوو نابێ. ئێمە روون و ئاشکرا دەبینین رۆسۆ هەم لەسەر کۆمەڵایەتی کردنی ژنان (هێنانیان بۆ نێو کۆمەڵگا) و هەم لە کۆتایی چارەنووسی ئێمیل و سۆفی و ژولیدا تووشی گەلێک دژواز وێژی و بۆچوونی پارادۆکسیکاڵ بووەو نەک نەیتوانیوە گرفتی ژنان چارەسەربکا، بەڵکو وەک مەتەڵێکی ئاڵۆزوبێ چارەسەر، لە دەزگای فەلسەفی- سیاسیی خۆیدا هێشتییەوە.

## بەشی هەشتەم:

# چارەنووسی پاڵەوانەکانی جان جاک رۆسۆ

لەوانەییە رۆسۆ لە زۆربەی فەیلەسووفە سیاسییەکانی دیکە زیاتر ئاگاداری ناتەبایی و دژبەری و بەرژەوەندییەکانی خەڵک دەگەڵ تاک و گروپە جۆراوجۆرەکان بووبێ، هەربۆیەش بەلای ئەوەوە؛ تەبایی و ئاشتبوونەوەی نێوان بەرژەوندییەکانی تاک و بەرژەوەندییە گشتییەکان شتێکی سادە و ساکار نەبوو. وێڕای ئەوەش؛ ئەڤین و خۆشەویستیی بنەماڵەو بە گشتی مرۆڤایەتی؛ لەڕوانگەی رۆسۆوە گەلێک گرینگ و بەنرخ بوو، بەو جیاوازییەوە کە ئەو هەرکام لەو شتانەی لە روانگەی خۆیەوە لێکدەدایەوە. تێگەیشتنی ئەو لە یەکنەگرتنەوە و ناتەبایی نێوان بەرژەوەندییەکانی خۆی و بەرژەوەندییە گشتییەکان بووە هۆی ئەوەی کە دەرنجامە فەلسەفییەکانی ئەو وەک شتێکی زۆر رەشبینانە و قیزەونانە خۆبنوێنن.

لەو بەشەدا دوای شیکردنەوەی کۆتایی رووداوی ئێمیل، دەچینە سەر باسی پرسۆناژەکانی ئەو لە دوو کتێبی خولیاکانی تەنیایی و هێلوییزی نوێدا، کە هەر دوو کتێبەکەش بە ناتەواوی مانەوە. ئەو شتانە لە پەیوەندی دەگەڵ روانگەی رۆسۆدا بەنیسبەت ژنەوە تاوتوێ دەکەین. بەسەرنجدان بە گەلاڵە و پلانەکانی رۆسۆ، کاتێک ئێمیل هەڵ بدا و گەورەبێ و ببێتە پیاوێکی تەواو، واز لە ژنانی شاری و رێکخراوە ئیدارییەکانی دێنێ و دەگەڕێتەوە سەر ژیانی سروشتی، خۆماڵی و سەربەخۆ (١). رۆسۆ بەمجۆرە باس لە ئاوات و ئارەزووەکانی ئێمیل سەبارەت بەو چەشنە ژیانە دەکا: ئەو بە ئاواتە پەڵە زەوییەک و هاوسەرێکی هەبێ کە شانازیی پێوە بکا."

رۆسۆ بەم دەربڕینە لە راستیدا باوەڕی خۆی سەبارەت بە هاوولاتیی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دەربڕی. واتە ئەو کاتەی پیاو بەپێی پێداویستیی سروشت



ژن دێنێ و بنەماڵەپێکدێنێ بە شێوەی سروشتی و وەک هاوولاتییەک دەبێتە گەورەی ماڵێ.(٢) دیارە ئێمیل هەر دەگەڵ ئەوەی کە ژنی هێنا، لە دوورە پەرێزی و تەنیایی رزگار دەبێ و ئەوجار سۆزوخرۆش و هەستی دلۆڤانی و بەستراوەیی و پێداویستییە رۆحییەکانی سەرهەڵ دەدەن؛ چونکە یەکەم هەست و حەز؛ هەست و حەزەکانی دوایی بەشوێن خۆیاندا دێنن(٣). بەمجۆرە سەربەستی و سەربەخۆیی پیاوێک تێدا دەچێ یا لانیکەم دەبێ بڵێین پاراستنەکەی بەهاسانی مەیسەل نابێ.

بەڕای رۆسۆ، هاوولاتی بوونی ئێمیل شتێکی تاڵ و پڕ لەمەترسیدار و هەڕەشە نەبوو لەسەر ئەو، چونکە سەبارەت بەو دەڵێ: ئێمیلی خۆشەویست؛ ئەوە چ پیاو چاکێکە قەرزاباری ئەو نییە کە تێیدا دەژی؟ لەو ولاتەدا لانیکەم حکوومەت و روخسارێکی رواڵەتی لە یاسا بەدی دەکرێ کە نەک هەر دەیپارێزێ بەڵکو باشترین خەسڵەتەکانی مرۆیی واتە بنەما ئەخلاقییەکان و هۆگری و عەشق بە چاکە و مەزنانهیی فێری ئەو دەکا".(٤) هەروەها دەڵێ: ئەوە دەمەی مرۆڤ لە ناخی جەنگەڵ و دارستاندا دەژی، زیاتر سەربەست و بەختەوەرە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان ئەو بۆ وەدەستهێنانی بەختەوەری و ئازادی؛ شتێکی ئەوتۆنین و زۆر لاوازن، چونکە ئەو هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک لەبەردەم وەدی هاتنی ویست و ئاواتەکانی خۆیدا نابینێ کە بیهەوێ لە دژیان راپەڕێ و خەبات بکا." بەڵام مرۆڤ لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هانە (انگیزە)ی بۆ خەبات هەیە و فێردەبێ کە چۆن بەرژەوەندییەکانی خۆی بکا بە قوربانی بەرژەوەندییە گشتییەکان و لە خەبات دەگەڵ خوێدا سەرکەوێ. ئەوە راست نییە کە ئەو هیچ کەڵکێک لە یاساکان وەرناگرێ، چونکە یاساکان فێری ئەوەی دەکەن بەسەر خۆیدازاڵ بێ."(٥) دیارە رۆسۆ، بە ناساندنی ئەمجۆرە باشی و مەزناهییە و ئەرکە ئایدیالییەکانی هاوولاتیی کۆمەڵگای مەدەنی کە ئێمیل بەپێی پێویست دەبێ فێریان بێ فێریان بێ؛ دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە کە چۆناوچۆن ئەو هەموو شێوە پەروەردە و راهێنانەی بۆ مرۆڤی سروشتیی خۆی واتە ئێمیل داڕشتوەو پۆلێن بەندیی کردوون. رۆسۆ لە دوایین بەشی کتێبی ئێمیلدا هەوڵی داوە ئەو شتەی کەپێی وابوو ناکرێ، جۆرێک

نیشاندا کە کردەنین و شیاوی کردنن. بەواتایەکی دیکە ئەو دەیهەوێ هاوکات پیاوێکی سروشتی و هاوولاتییەکی کۆمەڵگای مەدەنی لە ئێمیل ساز بکا. ئێمیل دەبێ بگەڕێتەوە نێو کۆمەڵ و فێربێ کە نەک هەر دەبێ دەگەڵ خۆی شەڕ و ململانێ بکا، بەڵکو بەفیداکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی؛ خزمەت بەخەڵک بکا.

رۆسۆ وەک مامۆستای ئێمیل لەم بارەیەوە دەڵێ: "بەو حاڵەشەوە پێت وانەبێ کە دەیهەوێ تۆ لە شاردا نیشتەجێ بیت، بەپێچەوانە یەکێک لەو کارە چاکانەی کە دەبێ ببێتە سەرمەشق و پارادایمێک بۆ خەڵک هەڵبژاردنی ژیانی خۆماڵییە چونکە ئەو شێوە ژیانە، یەکەمین فۆرمی ژیاری و شارستانیەتی مرۆییە و بۆ ئەوانەی هێشتا دڵیان نەڕزیوە هێمنترین و سروشتیترین شێوەی ژیانە.[٦]

رۆسۆ دەیەوێ ئەم خاڵە بیر بێنێتەوە کە ئێمیل و سوفی بە خۆبواردن لە ژیانی شاری و هەڵبژاردنی ژیانی سروشتی و لۆکاڵی، دەتوانن ببنە نموونەی کەسانێکی باش و چاک بۆ خەڵکی دیکە. بەڵام لەهەمانکاتیشدا ئێمیل دێنێتە سەر ئەم رایە کە ئەگەر لەم هەلومەرجەدا حکوومەت پێویستی بە خزمەتی ئەوبێ، ئەو پێویستە وەکو سینسیناتوس CINCINNATUS نیرو ئاموور بە جێ بهێڵێ و واز لە ژیانی سروشتی و لۆکاڵی بێنێ و بچێتە خزمەتی حکوومەت.[٧]

بە ئاشکرا دەبینین  کە رۆسۆ لە هەوڵی ئەوەدایە هاوکات ئێمیل هەم وەکو هاوولاتییەک و هەم وەک پیاوێک کە بەپێی سروشت پێویستە بە سەربەستی و ئازادی بژی پێشیان بدا، بەڵام ئەو سەرناکەوێ کە ئەم ئاواتە ناتەبا و مەحاڵە وەدی بێنێ. رۆسۆ لە دوو نووسراوەی خۆیدا کە لە خولیاکانی تەنیاییدا تەواوی کردوون باس لەوە دەکا کە پیاوێکی سروشتیی پەروەردەکراو چۆن دەتوانێ لەیەک کاتدا هەم وەک مێردێک، هەم وەک باوکێک و هەمیش وەکو هاوولاتییەک ئەرکەکانی خۆی راپەڕێنێ. بەڵام بە برێک لێکۆڵینەوە جوان دەردەکەوێ کە پەروەردەکردنی ئێمیل بە شێوەی ئایدیالی و راهێنانی وەک مرۆڤێکی سروشتی بە هۆی کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی راستەوخۆی راهێنەرەکەیەتی. بەواتایەکی دیکە، کاتێک لە ئێمیل دەگەڕێن بڕوا وەک مێرد، باوک و وەک هاوولاتییەک لە کۆمەڵگادا ژیانێکی ئازاد و سەربەست پێک بێنێ، با شاری ئەم رۆڵ و بەرپرسیارەتیانە ناکا و بۆی جێبەجێ ناکرێن. لەوەها هەلومەرجێکدا ئێمیل



جارێکی دیکە هەست بەوە دەکا کە ئەو کاتێک دەتوانێ ئازاد و سەربەست بێ کە ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتیانەی لە کۆڵ بنەوە و لە دوورەپەرێزی و تەنیاییدا بژی. جوان دیارە رۆسۆ لەم پەیوەندییەدا ئەزموونەکانی ژیانی خۆی خستۆتەڕوو، چونکە ئەو لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیی خۆیدا هیچ کات نەیتوانی ئەم ئەرک و بەپرسیارەتیانە لێک گرێ بدا. ئەو وای لێدێ لە کتێبی ئێمیل و سۆفی Emile et sophie دا بڵێ کە: "من نەمتوانی بە دابڕان لە خۆشەویستیی نیشتیمانم؛ عەشق و خۆشەویستیم دابەش بکەم بەسەر تەواوی زەویدا و خۆم بە کەسێکی جیهان نیشتمانی بزانم هەتا هاوولاتیی ولاتێک.[٨]

جودیت شکلێر لەم پەیوەندییەدا باوەڕی وایە ئەو ئاکام و دەرەنجامەی رۆسۆ سەبارەت بە پیاوێک کە دەوری مێرد، باوک و هاوولاتی ببینێ ناتەواو و لێڵە[٩]. بەهەر حاڵ پەروەردەی ئێمیل لەلایەکەوە سەرکەوتوانە و لەلایەکەوە شکست خواردوویە، لەوەدا شکست خواردووریە کە رۆسۆ سەرەڕای ئەوەی کە لە سەرەتای کارەکەیدا گوتبووی "ناکرێ مرۆڤێک هەم سروشتی بێ و هەم هاوولاتییەکی کۆمەڵایەتی."[١٠] بەڵام دیسانیش ئەم کارە دەکات. ئێمیل دەیزانی کە ئەو بەبێ ئێزن و یارمەتیی راهێنەرەکەی ناتوانێ هەم وەک باوک و هەم مێرد ئەرکەکانی راپەڕێنێ. هەر بۆیەش ماڵ و نیشتیمان جێ دەهێڵێ و بەمجۆرە ئەم سەرەڕای ئەو  پەرەوەردە و فێرکارییانەی لەسەر ماڵ خۆشەویستیی بنەماڵە و نیشتیمان پەروەری؛ پێی گوترابوو، هیچ گرۆیی و هۆگرییەکی بۆیان نەبوو. لایەنی سەرکەوتوانەی پەروەردەی ئێمیل ئەوەیە کە رۆسۆ لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەریخست کە توانیویێنی ئێمیل وەک پیاوێکی سەربەست و ئازاد پەروەردە بکا. هەڵبەت ئەم ئازادییە؛ ئازادیی دەروونی بوو؛ کە ئێمیل پێی گەیشتبوو. بۆ وێنە کاتێک تێگەیشت لەوەی کە وەکو قەرەیەک بەرهەمی زەحمەت و کوێرەوەرییەکانی لەلایەن ئاغاوە بەکەسانی دیکەوە دەفرۆشرێ و لەراستیدا ئەو وەکو کۆیلە وایە، دیسانیش خۆشحاڵ و دڵخۆش بوو بەوەی کە ئەو پەروەردە و فێرکارییە تایبەتیانە وایان لێکردووە کە وێڕای دیل و کۆیلەتی، هەستێکی کۆڵنەدەرانە و نەبەزیوی هەبێ.[١١] و چێژ لە ئازادیی دەروونی و هەناوەکیی خۆی وەرگرێ. هیچ کەس ناتوانێ لەم ئازاییە بێبەریی بکا، چونکە

ئەو ئۆتۆریتە ئەخلاقی و کەسایەتییە تۆکمەیەی ئەو وەدەستی هێناوە؛ دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەو دەمەشدا کە لە باری جەستەییەوە دیل و کۆیلەیە، ئەو هەست بە هەبوونی ئازادیی راستەقینە بکات. ئەو شتانەی کە لە ژیانی رۆسۆشدا هەستیان پێدەکرێ و بەدی دەکرێن.

رۆسۆ لە کۆتایی دەرەنجام وەرگرتنەکانیدا باس لەوە دەکا، کە سەرکەوتوانە توانیویێتی ئێمیل وەکو پیاوێکی نموونە و ئایدیال بێنێتە نێو جیهانەوە؛ پیاوێک کە دەتوانێ خۆی لەگەڵ هەر رەوش و دۆخێک بگونجێنێ و لە هەمانکاتیشدا؛ هیچ ئاستەنگێکی لەبەردەم نەبێ.

## چارەنووسی سۆفی

بەڵام ئەوەش جێی پرسیارە کە رۆسۆ سەبارەت بە سۆفی و پەروەردەکردن و راهێنانی ئەو وەکو ژنێک؛ چ روانگەیەکی هەبووە و چۆنی تێ فکریوە؟ هەروەکی لە پێشدا دیتمان؛ پەروەردەی ئایدیالیی رۆسۆ بۆ ژنان هێنانە گۆڕێی ئەم بۆچوونەیە کە ژن خۆی دەگەڵ ویست و داخوازییەکانی پیاو رێک بخا. بۆ وێنە سۆفی دەبێ بە شێوەیەکی هەڵخەڵەتێنەرو دڵبەرانە و بە خۆشکاندنەوە سەبارەت بە داوێن پاکی و شەرم و حەیای خۆی، وا بنوێنێ و بیسەلمێنێ کە شیاوی ئەوەیە ببێتە خێزانی ئێمیل. رۆسۆ لە دەرەنجام وەرگرتنی خولیاکانی تەنیاییدا، بە شێوەیەکی حاشا هەڵنەگر شکستی خوارد. سەبارەت بەوەی کە دەڵێ سۆفی هەروەکو ئێمیل رۆحێکی سادە و سروشتیی هەیە و بەو پەروەردە و فێرکارییانەی کە هەیبووە لە ژنانی دیکە باشتربووە[١٢].

ئەو هەروەکی سەرنەکەوت مرۆڤێکی سروشتی لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیدا لە ئێمیل دروست بکا، سەبارەت بە سۆفی و داڕشتنی پەروەردە و راهێنانەکانیشی بۆ دروستکردنی ژنێکی ئایدیال؛ سەرنەکەوت، لەبەر ئەم هۆکارانە.

سۆفی وەکو ئێمیل فێری ئەوە نەکرابوو کە لەکاتی رووبەڕووبوونەوە دەگەڵ رووداوگەلی چاوەڕوان نەکراودا کە لە سروشتدا روودەدەن؛ هەڵوێست و دژکردەوەیەکی هەبێ.



ئەوکاتە کچە ساواکەی بە هۆی رووداوێکی تاڵ تێدادەچێ زۆر پەشێو دڵبەخەم دەبێ.

ئێمیل بۆ ئەوەی سۆفی لە خەمەکانی دووربخاتەوە، دەی نێرێتە پاریس تا بەڵکو شوێنی نوێ شوێن دانەربێ لەسەر رۆح و دەروونی و سوکنایی بداتێ. بەڵام پرسیارێک کە لێرەدا دێتەپێش ئەوەیەکە؛ ئێمیل بۆچی پاریسی هەڵبژاردووە کە چەپەڵترین نوێنگەی شارستانییەتە؟

ئەو بڕیارەی ئێمیل سەبارەت بە ناردنی سۆفی بۆ پاریس دەبێتە هۆی ئەوەی کە، نەک هەر خۆی لەلایەن ئەم شارستانییەتەوە تووشی فەساد و لاڕێ بێت و پەیمانی ئەڤینداری و وەفاداریی خۆی بەسوفی، بشکێنێ بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی ژیانی سۆفیش تووشی لاڕێ و هەڵدێربێت.

ژیانی سۆفی تەواو لە دەوری خەرمانی عەشق تێپەڕ دەبوو. ئەوەندە خۆ پارێز بە حەیاو شەرم بوو کە پیاوانی هۆگری خۆی دەکردو دڵی دەڕفاندن و لە پاریس نەیتوانی ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندییانە بپارێزێ کە بە هۆی پەروەردە و راهێنانەوە پێیان گەیشبوو. نەشیتوانی بەسەر هەستی دەروونی و جۆشوخرۆشی خۆیدا زاڵ بێ. ئەو لە پاریس کەوتە باوەشی کەسانی دیکەوە و تووشی زیناح بوو و تێگەیشت زگی لە کابرایێکی دیکە پڕبووە. ئەگەرچی ئێمیل پێشتر گوتبووی بەلایەوە دیتنی مەرگی منداڵەکەی هاسان ترە لەوەی کە بیبستێ سۆفی دەگەڵ کابرایەکی دیکە دەستی تێکەڵ کردووە. کەچی لێرەدا قایل دەبێ و دێتە سەر ئەوەی کە سۆفی لە شوێنێکی وەک پاریسدا هیچ چارەیەکی دیکە نەبوو جیالەوەی تووشی وەها هەڵەیەک بێ (واتە لەوەها شوێنێکدا لە دەست خۆیدانەبووە کە تووشی ئەم هەڵەیە هاتووە بەڵکو ئەوە ژینگەیە تووشی ئەوەی کردووە) ئێمیل جوان دەی زانی کە ئەو وەسوەسە و کەڵکەڵەیەی سۆفی لە پاریس تووشیا بوو؛ گەلێک لەوە بەهێزتر بوون کە ئەو بیری لێدەکردنەوە و چاوەڕوانیی دەکرد سۆفی خۆیان لەبەر راگرێ.

دەبینین سۆفی پاڵەوانەکەی جان جاک رۆسۆ، بە چرکەساتێک لەبەر چاوان رەش دەبێ و لە "مەریەمی پیرۆزەوە" دەبێتە لەشفرۆشێکی قەراغ شەقامەکان. ئێستا کە سۆفی تووشی وەها هەڵەیەک هاتووە و بە لاڕێدا رۆیوە و پێیوایە

لێبووردنی ئێمیل-ی پێ قەرەبوو ناگرێتەوە، دیسانیش هیچ گەرەنتییەک نییە کە سەرلەنوێ تووشی ئەم هەڵەیە نەبێتەوە؛ چونکی رۆسۆ دەڵێ: "کاتێک ژنێک حەیاو داوێن پاکیی خۆی دەدۆڕێنێ؛ ئیدی هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە کە هەوڵی پارستنی بدا. رۆیشتن بەرەو خراپە و فەساد تەنیا یەکەم هەنگاوی، بەژانەو ئازاری هەیە."*

ئێمیل وەکو پیاوێکی سەربەخۆ دەیزانی کە دەبێ بێزراویی کۆمەڵگا لەسەر ئەوەی کە ژنەکەی حەقیقەت و ئابڕو و نامووسی لێ خەوشدار کردووە؛ بەهێند وەرنەگرێ. ئەو ئەم بێزارییە گشتییەی بە شێێکی لۆژیکی و دادپەروەرانە دەزانی و تاوان و هەڵەکەی سۆفیشی بەدەرەنجامی هەڵەی خۆی لە قەڵەم دەدا، بەم جیاوازییەوە؛ کە ئەو هەڵەیەی یا بە دەرەنجامی خراپ هەڵبژادنی هاوسەرەکەی لە قەڵەم دەدا، یا پێی وابوو خۆی نەیتوانیوە کاریگەری و دەسەڵاتی هەبێ بە سەر سۆفییەوە. ئەگەرچی ئێمیل تاوانی خۆی دەگرێتە ئەستۆ، بەڵام ناتوانێ سەر لەنوێ سۆفی بکاتەوە بەژنی خۆی و وەری گرێتەوە. ئەو لە رووی بێزارییەکی تێکەڵاو بەترسەوە؛ دژکردەوە بەنیسبەت سۆفییەوە دەنوێنێ کە بووەتە دایکی منداڵێکی دیکەش. چونکە لەسەر ئەم باوەڕەیە ئیدی سۆفی عەشق و خۆشەویستیی خۆی دابەش کردووە بەسەر دوو منداڵدا، کەیەکیان کوڕەکەی خۆیەتی و ئەوی دیکەش ئەو منداڵە زۆڵەی لە پیاوێکی دیکەیە.

بەمجۆرە هەروەکی ئێمیل زۆر جاران گوتوویەتی؛ مەرگی منداڵەکەی بەلاوە شیرنترە لەوەی کە ببیستێ سۆفی بە دەستی کابرایەکی دیکە زگی پڕبووە[١٣]، ناتوانێ لە سوفی خۆش بێ و دەگەڵی بژی. ئێمە لێرەدا تەنیا نموونەیەکی روونمان هێنایەوە لەسەر ئەوەی کە کەفوکوڵی "مرۆڤی سروشتی" دژایەتی هەیە لەگەڵ نیشتیمانپەروەری و بنەماڵە خۆشەویستییەکەی. دیارە زاڵبوون بەسەر ئەم کەفوکوڵ و هەست و خرۆشەدا کە دەرەنجامی دابڕانن لە بنەماڵە؛ بۆ پیاوان بەگشتی و ئێمیل بەتایبەتی؛ ئاسانترە لە ژنان. (واتە بۆ ژنان ئەستەم و تاقەت پڕووکێنە) بۆ وێنە؛ سۆفی کە ئەرکی پەروەردە و بە خێوکردنی دوو منداڵی لە

* کورد دەڵێ: ئابڕوو تنۆکێکە، ئەگەر تکا، کۆناکرێتەوە.



ئەستۆیە کارێکی دژوار و تاقەت پڕووکێنی بەملەوە بووە. ئەگەرچی وێدەچێ ئێمیل لە دەستچوونی ئەو ژنەی بۆ قەرەبوونەکرێتەوە کە خۆشی ویستووە؛ بەڵام بەو حاڵەشەوە هەڵدەستێ زێدوماڵ بەجێ دەهێڵێ بۆ ئەوەی بتوانێ بگات بە سەربەخۆیی و تەنیایی و ئازادیی راستەقینە. ئەو بەم زووانە چێژ وەردەگرێ لەم ئازادیی و سەربەستییەی وەدەستیی هێناوەتەوە. چونکی خۆی گوتەنی: ئیتر قەرزاباری کەس نییەو بچێتە هەر شوێنێک هەست بەسەربەستی دەکا و خۆی بە سەربەخۆ دەزانێ.

ئێمیل لەم بارەیەوە بۆ راهێنەرەکەی خۆی دەگێڕێتەوە کە "من بەخۆمم گوت؛ لەهەر جێ یەک و لە هەر هەلومەرجێکدا بژیم ئازادیی دەروونی خۆمم وەدەست کەوتۆتەوە و خۆشحاڵ و رازیم لەوەی کە چاو لە دەستی هیچ کەس نیم. " جامێکم بەسەرمەوە ناوە بۆ ئەوەی رابووردوومی لە هەستەوەریمدا پێ بسڕمەوە.[١٤]

بەڵام ئایا کێشەکانی پەیوەندیدار بەسۆفییەوە بەوەندە چارەسەر دەکرێن؟ ئەو لە هیچ هەلومەرجێکدا ناتوانێ رابردووی فەرامۆش بکا، چونکە جیالەوەی کە ئەو بەرپرسیارەتیی دوو منداڵی لەسەر شانە. یەکیان نەخۆشە و خەریکە دەمرێ؛ سۆفی هیچ پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی نییە و هیچ یاسایەکیش پشتیوانیی لێ ناکا. سۆفی بچێتە هەرکوێ دەکەوێتەبەر نەفرەت و بێزاری و بێ حورمەتیی پێ دەکرێ. ئەو ئیتر جیا لە مەرگ هیچ رێیەکی بۆ نەماوەتەوە، چونکی دلۆڤانی و دڵڕفێنی و خۆش خولقییەکانی هەموو بە کۆتایی گەیشتوون.[١٥] کتێبی ئێمیل و ئەو کتێبەی کە رۆسۆ لە درێژەی ئەودا نووسی واتە ئێمیل و سۆفی؛ تەنیا هەر چیرۆک نین. چارەنووسی ژن و پیاوێکی پەروەردەکراون کە لە راستیدا بە نموونە و پارادایمێکی رەگەزی خۆیان لە قەڵەم دەدرێن.

دژکردەوەی ئێمیل بە زیناح کردنەکەی سۆفی؛ خۆی پێشاندەری وێرانیی ئەو بنەماڵە ئایدیالییە کە رۆسۆ باسی لێدەکرد. گرینگی ئەم دوو کتێبەی لەوەدا نییە کە سۆفی تووشی کارێکی خراپ و هەڵە بووە؛ بەڵکو لەوەدایە کە ئێمیل دەزانێ ئەگەر بێتو سۆفی داوێن پاکیی خۆی بدۆڕێنێ و داوێن پیس بێ، ئیتر ناتوانێ متمانەی پێ بکا.[١٦] شکستی سۆفی لە راستیدا نیشانەی شکست خواردنی

کۆمەڵگای سەردەمی رۆسۆیە چونکە ئەو راهێنرابوو، کە بە هۆشیاری و وریاییەوە گەنجینە بە نرخەکەی خۆی بپارێزێ، بۆ ئەوەی لە هەمبەر داوەری کردن و بیروڕا و قسە و باسی خەڵکدا رووسوور و سەربەرزبێت و هەروەها عەشق و خۆشەویستیی خۆی پێشکەشی کەسێک بکا کە شیاوێتی[١٧]، بەڵام تووشی چارەنووسێکی رەش هات.[١٨] چارەنووسی سۆفی لە راستیدا دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی مێردەکەی، کە ئەوی ناردە شارێکی گەندەڵی وەک پاریس، شارێک کە بە یاسا لەرزۆکە ئەخلاقییەکانییەوە، بووە هۆی ئەوەی کە کەشێکی لەبار بۆ بەلاڕێدا چوونی سۆفی بخولقێ.

## چارەنووسی ژولی

چارەنووسی ژولی پاڵەوانێکی دیکەی رۆسۆ کە ئەوەیان وەک سۆفی ژیانی نێو دێهاتی بۆ شار بەجێ نەهێشت؛ چارەنووسێکی ئاڵۆزترە. ژولی ژنی ئایدیالی رۆسۆیە، هەر ئەو ژنەی کە بەدڵی خۆیەتی[١٩]. چونکی ژولی؛ تەواو لە جۆشە. هەست ناسکە و خاوەنی خەسڵەت و تایبەتمەندی گەلێکە وەک :

داوێن پاکی، لە جۆشی و هەستی بەتینی سێکس. لەڕوانگەی رۆسۆوە هەر ژنێکی خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە نەبێ؛ بوونەوەرێکی بێ کەڵک و بێ بەهایە.

کاکڵی مەبەستی کتێبی هێلوییزی نوێ پارادۆکسی جۆش و خرۆشی ژولییە دەگەڵ ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانی، کە رۆسۆ پێیوایە هەموو ژنێکی بە کەفوکوڵ و دڵناسک؛ بڵێی و نەڵێی دەگەڵی رووبەڕوو دەبێتەوە. کەفوکوڵ و خرۆشی ژولی دووبەش کراون؛ نیوەیەکیان کە فوکوڵی وروژێنەرانەی ئەڤیندارانەی ئەوە بەنیسبەت "ساین پرێڤی راهێنەری و نیوەکەی تری ئەو سۆز و خرۆشە بە تەوژمەیە کە پەیوەندیی بە ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانییەوە هەیە بەنیسبەت دایک و باوکە توورە و تۆسنەکەیەوە کە دەیهەوێ بەزۆرەملی و نابەدڵ بیدات بە هاورێکەی خۆی کە کاربەدەستە[٢٠]. ژولی بە خۆشەویستیی ساین پرێڤەوە دەژیا هەتا ئەوەی کە ئەو عەشقە وای لێکرد کچێنی خۆی بدۆڕێنێ و لە روانگەی رۆسۆوە ببێتە ژنێکی تەواو هەرزە و بەرەڵڵا. ژولی لە نامەیەکی نهێنیدا بۆ کورە مامەکەی کە مەحرەمی رازی بوو؛ لەم بارەیەوە



دەنووسێ: "بێ ئەوەی بۆ خۆم ئاگام لەوەبێ چ دەکەم بەدەستی خۆم؛ خۆمم چارەڕەش کرد. لەوساتەدا من جیا لە عەشق و خۆشەویستی بیرم لە هیچ شتێ نەدەکردەوە. هەموو شتێکم لەبیر چووبۆوە، ئیتر ئەو رووداوە قەوماو بۆ هەمیشە چارەڕەشی کردم من سەیر هەست بەشەرمەزاری و پەژیوانی دەکەم و قەت ناتوانم لەو دۆخە رزگاربم. من ئەگەر بژیم ژیانێکی نەگبەتی و رەشم دەبێ.[٢١] ژولی بە دۆڕاندنی کچێنیی خۆی : هەست دەکا ژیان و داهاتوویەکی رەش وتاریکی دەبێ و بووەتە بوونەوەرێکی بێ بەهاو گوناحبار. ئەو بە ژان و ناڵەوە بۆ ساین پرێڤ دەنووسێ "من ئێستاکە، هیچ نیم، بوونەوەرێکی سووک و بێ نرخم، تۆ ببە بە هەموو شتێکم[٢٢].

رۆسۆ چارەنووسێکی کە سەربار و دڵتەزێنی بۆ ژولی هەڵبژاردووە و خستوویەتە بەردیدەی خوێنەرەکانی؛ بۆ ژولی کە ژنێکی زۆر ئیماندارە و لە باری کەسایەتی و دەروون پاکییەوە زۆ لە سۆفی جیاوازە، وەها چارەنووسێک کە هیچ مرۆڤێک ناتوانێ خۆی لەبەر راگرێ.

لەم پەیوەندییەدا، باشترە ئەم دۆخە لە زمانی خۆیەوە ببیەین کە بۆ گراوییەکەی واتە ساین پرێڤ دەنووسێ: "ئێمە وێڕای ئەوەی کە لە رەگەزدا لێک جیاوازین؛ لە چارەڕەشیدا هاوچارەنووسین. بەڵام خۆت بڵێ؛ کێهەمان لە چاو ئەویدی کە بارودۆخێکی لەبارترمان هەیە؟ کچێک لە تەمەنی مندا سەرەڕای ئەوەی خاوەنی عەشق و خۆشەویستییەکی پڕ کەفوکوڵە؛ وابنوێنێ کە لەم شتانە بەدوورە، لە رواڵەتدا گەش و خۆشحاڵە کەچی لە هەناودا لێوڕێژە لەژان و ئازار، رواڵەتێکی هێدێ و هێمن و دڵۆڤان، کەچی خاوەنی رۆح و دەروونێکی شێواو و پەشێو. ژیان بە دڵ و ویستی خەڵک، کوتنی ئەو شتەی ئەوان حەزیان لێیەتی؛ درۆکردنی بەناچاری و خۆبە داوێن پاک نیشان دان و.... ئەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی باوکماندا دەبێ بە نابەدڵی شووبکەین. بەڵام هەوڵەکانی ئەوان بۆ لە ناوبردنی حەز و ویستەکانیان هەوڵێکی پووچ و خۆڕاییە، لەبەر ئەوەی کە دڵی ئێمە تەنیا بەپێی یاسای خۆی دەجووڵێتەوە و خۆ دەبوێرێ لە دیلی و کۆیلەتی"[٢٣].

بێجگە لە مەسەلەی مێردکردنی بەنابەدڵ، تەواوی ئەو چارەڕەشییانەی رۆسۆ باسی کردوون، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ژولی ئافرەتە. چونکی ساین پرێڤ

وەکو پیاوێک، هەر بەو هەستە ناسکەوە کە بەنیسبەت ژولییەوە هەیەتی و بە ناچار لێی دادەبڕێ و جوێ دەبێتەوە، بە رادەی ژولی پەژیوان و شەرمەزار نییە. چونکی ئەو وەک ژولی ناچار نییە شوو بکا بە کەسێکی کە خۆشی ناوێ و ئیدی ناچاربێ هەر خۆی بخواتەوە. ساین پرێڤ بێ ئەوەی باری خەمی ئەوژنە هەڵگرێ کە خۆشی دەویست؛ بێ خەم و خەیاڵ بارگە و بنەی پێچایەوە بۆ ئەوەی چێژ لەوەندە ژیانە وەرگرێ کە ماویەتی. بەڵام ژولی وەکو ئافرەتێک، پاش ئەوەی تووشی ئەم گوناحەبوو منداڵێکی لە ساین پرێڤ بوو، بڕیاریدا، بە لەباربردنی منداڵەکەی؛ ناموس و ئابڕووی خۆی بکڕێتەوە، بەڵام لە ناخی خۆیدا رازیی بەم کارە نەبوو.

ژولی بەردەوام بە گومانەوە دەژیا، چونکی ئەو بۆ هەر کارێکی کە ویستبای بیکا و بۆ هەر هەڵبژاردنێک، دەبوایە گرینگی بدات بەویستی سێ پیاو*، کە دەوریان گرتبوو. بەواتایەکی دیکە، ئەو ناچار بوو دڕدۆنگ بێ لەدابینکردنی ویستەکانی، گراوی و باوک و دواجار مێردەکەیدا. بۆ خۆی راشکاوانە لەم بارەوە دەڵێ: "نازانم دەبێ ویستی کامەیان بە گرینگتر دابنێم و وەڵامی بدەمەوە".

ژولی دەکەوێتە سەر دووڕییانێک؛ لەلایەکەوە بڕیاردەدا رەدووی ساین پرێڤ بکەوێ و لە لایەکەوە بیر لەوە دەکاتەوە شوو بەو کابرایە بکا وا باوکی بۆی هەڵبژاردووەو دەیەوێ بەزۆرەملی بیداتێ. ئەو لەم پەیوەندییەدا دەکەوێتە ململانێیەک لە دەروونی خۆیدا و دەڵێ: "هەر رێگەیەکی هەڵبژێرم ئاکامەکەی؛ هەر مەرگی بەمەرەد و گوناحبارانەی خۆمی لێدەکەوێتەوە[٢٤] ئەو کاتێک لە هیوابڕاوی و گوماندا ناتوانێ باوکی قایل بکا کە بیدات بە ساین پریڤ، بەڵێنی دەداتێ کە ئیدی شوو بە هیچ کەسێکی دیکە نەکا."[٢٥] ژولی بەمجۆرە باس لە چارەنووسی خۆی لە نێو دونیای پیاواندا دەکات: "چارەنووسی من بە بەزنجیرێکی هەمیشەیی؛ بەستراوەتەوە بەمێردێک یا ویست و داخوازی باوکێکەوە. من پێم ناوەتە قۆناغێکی نوێی ژیانەوە؛ کە مەرگ کۆتاییەکەیەتی[٢٦]".

رۆسۆ لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ژولی ئەگەر قسەی باوکی نەشکێنێ و شوو بکا بەو کابرایەی خۆشی ناوێ و هەر ناشی ناسی، ئەوا لەژێر باری قەرزی

* مێردەکەی ژولی رۆڵی پیاو دەبینێ: باوکی منداڵەکەیەتی. خۆشویستی ژولییە و مێردیشێتی (و.ک)



بنەماڵەکەی هاتۆتەدەر. درێژەی چارەنووسی ژولی کە رۆسۆ نووسیویێتی؛ بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخانکراوە کە ژولی هەتا گڵەبانی چاوی دەکەن بەردەوام دەگەڵ خۆی و هەستە دەروونییەکانیدا لە ململانێدایە و بەردەوام هەوڵ دەدا کە خۆی بێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە بەسەر ئیحساساتی خۆیدا سەرکەوتووە. ژولی کاتێک توانیی شەرافەت و داوێن پاکیی خۆی وەدەست بێنێتەوە کە وەک هاوسەر و دایک هاتەوە مەیدان. رۆسۆ لە هیلیۆییزی نوێدا، لە زمانی ئەوەوە دەنووسێ: ئێستا، کە هەم هاوسەرم و هەم دایک، ئیتر رۆحم گەیشتۆتە چڵەپۆپەی بەرزایی و مەزنێتی و ئەو هێزەی پێ بەخشیوم، دژی ئەم هەلومەرجە تاڵ و نالەبارانە راپەڕم کە لێوانلێو بوون لە پەژیوانی.[٢٧] ئەوەی کە ژولی لەسەر چوارچێوە و کەشی ژیان و بنەماڵەی وتوویەتی؛ پێشاندەری دۆخی لە باری ژیانێتی، چونکی ئەو لەم باسەدا نەک هەر خۆی بە تاقانەی سەر زەوی زانیوە بەڵکو وەک دایکێکی نموونە و کابانێکی لێوەشاوە و وردبین لە خۆی دواوە. هەروەها ئەو بەخۆی دەنازێ چونکی توانیوێتی وێڕای ئەوەی منداڵەکانی ساخ و سلامەتن و فەرمان و ئەرکە ئایینییەکان بەڕێوە دەبەن؛ ئێستاش پەیمان و بەڵێنی خۆی دەگەڵ ساین پرێڤ پاراستووە. سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش وێدەچێ ژولی هێشتا لە ناخ و هەناوی خۆیدا رازی و قایل نەبێ. چونکی ئەو ناچارە دەگەڵ مێردە نابەدڵەکەی واتە ئۆلمار ژیانێکی نەگبەتی و تاڵ تێپەڕ بکا. ژولی بەمجۆرە باس لە ناڕەزامەندیی خۆی بەنیسبەت ئەم دۆخە دەکا: "قایل نیم، بەڵام خۆشحاڵم، ئەوەندە شاد و بەکەیفم کە خەریکە وەڕەزو ماندووم دەکا[٢٨]". دیارە پەرچەکرداری ژولی بۆ ئەم جۆرە ژیانە، نیشانەی زەجر و ئازاری هەمیشەییەتی. چونکە ئەو بە دەربڕینی ئەم رستانە؛ راشکاوانە "پەژیوانیی شاراوە" و داخ و کەسەری قووڵی خۆی دەردەبڕێ: "رۆحم بۆش و بەتاڵە و چاوەڕوانە کەسێک لێوڕێژی بکات.[٢٩]" چارەنووسی ژولی دواجار بەمەرگێکی کتوپڕو لە نەکاو کۆتایی دێ. دوای مەرگی ئەو؛ لەو دانپیانانەدا کە لەلایەن کەسوکارەکەیەوە دەخرێنە روو، دەردەکەوێ کە ژولی نەیتوانی بوو سۆز و ئەڤینی بەتینی خۆی بەنیسبەت ساین پرێڤ لەبیر بەرێتەوە و بەسەرخۆیدا زاڵ بێ".

روون و ئاشکرایە کە مەرگی ژولی، تراژیدییەکی دڵ تەزێنە لەسەرکوتی سۆز و خرۆشی مرۆڤ؛ چونکی ئەو لە رواڵەتسازییەکی بەردەوامدا وای دەنواند کە بەژایانی خۆی قایلەو لێبرازییە و توانیوێتی زاڵ بێ بەسەر سۆز و خرۆشی خۆیدا سەبارەت بە ساین پریڤ؛ بەڵام هەروەکی خۆی باوەڕی وابوو: "زۆربەی هەست و سۆزەکان لە بێدەنگیدا دەپشکوێن و دەردەبڕدرێن."[٣٠] لەوکاتەوە ژولی تووشی تاوانێکی گەورە و نەبەخشراو دەبێ کە زگی لە ساین پریڤ پڕدەبێ و دواتر منداڵەکەی لەبار دەبا و هەروەها جگە لەوەش کە لەو سەردەمەدا کە ژنی ئۆلمارە بەردەوام داوێن پاکیی خۆی پاراستبوو، توانیبووشی وا بکا هیچ کەس بە مەسەلەی لە باربردنی منداڵەکەی نەزانێ، بەو حاڵەشەوە بەردەوام لەوە دەترسا کە دیسانیش خۆی پێ رانەگیرێ و خۆبداتەوە دەست ویست و کەڵکەڵەکانی.

بەواتایەکی دیکە، ئەو لە تەواوی ئەو ماوەیەی دەگەڵ ئۆلمار ژیابوو، هەوڵی دابوو ئیدی تووشی هەڵە نەبێ و هەربۆیەش بەردەوام دەگەڵ خۆی لە ململانێ یەکی بێ بڕوانەوە دابوو بۆ ئەوەی بتوانێ بەم جۆرە، کەڵکەڵە و حەزەکانی سەرکوت بکا. ژولی ئاخرییەکەی بۆ ئەوەی خۆ نەداتەوە دەست سۆز و خرۆشە دەروونییەکانییەوە و دیسانیش پەیوەندیی بە ساین پریڤەوە نەگرێتەوە، مەرگی هەڵبژارد، چونکی مەرگ تەنیا ڕێگەیەک بوو کە دەیتوانی لەو دۆخە ئەستەمەو لەم ئازارە بێ بڕوانەوەیە ڕزگاری بکا. ژولی دوای ئەوەی کە توانیی منداڵەکەی خۆی لە مەترسیی خنکان ڕزگار بکات؛ بە ئانقەست پەنای بۆ ئامێزی مەرگ برد و ئارەزووی لە مێژینەی خۆی وەدی هێنا. ئەو لەڕاستیدا و بە مەرگی خۆی درێژەی ژیانی ئایدیالیی بنەماڵەی ئۆلماری مسۆگەرکرد و بە وتەی جودیت شکالێر؛ ژولی، مەرگی مەسیح ئاسای بە مەبەستی ڕزگاریی کەسانی دیکە هەڵبژارد.[٣١]

لەڕوانگەی رۆسۆوە ژولی بۆیە وەک ژنێکی ئایدیال چاوی لێدەکرا، چونکە وێڕای ئەوەی کە مەزن، داوێن پاک، ئەڤیندار وشیاوی خۆشەویستن بوو، گیانی خۆی فیدای ژیانی کابرایەک بەناوی ئۆلمار کرد و بەمجۆرە بوو بە پاڵەوانێک. هەوەها رۆسۆ بە هۆی شێلگیربوونی ژولی لە کۆنترۆڵ کردنی سۆز و خرۆشی



سەرکەشی خۆیدا و خۆڕاگری لەسەر ئەڤین و چاکەکاری؛ شوبهاندی بە هێلۆییز (خوای خۆر) کە تەنیا بۆ عەشق خولقابوو.[١] بەگشتی، بەم تایبەتمەندییانەوە چارەنووسی ژولیابوو کە تەواوی تەمەنی کورتی خۆی بەململانێی دەروونی دەگەڵ هەستە سروشتییەکانی تێپەڕ بێت. چونکە گرینگترین شت بەلای ژولییەوە، پاراستنی داوێن پاکی و ڕاپەڕاندنی ئەرکی ژنێتیی خۆی وەک هاوسەر و هەروەها بایەخ دان بە پێگەی چینایەتیی باوک و لەبەر چاوگرتن و بەڕێوەبردنی یاسا نایەکسان و قیزەونەکانی کۆمەڵگا بوو. رۆسۆ لە کتێبی ئێمیلدا گوتوویەتی: "لە جیهانی پووچ و بێ مانای ئێمەدا، ژیانی ئافرەت لە ململانێیەکی هەمیشەیی لەگەڵ خۆیدا تێدەپەڕێ."[٣٢]

بەڵام لە باوەڕەکانی رۆسۆدا، سەبارەت بە پەروەردەی ژنان و پێگەی لەبار و شیاوی ئەوان لە کۆمەڵگەدا و هەروەها بە مەحکومکردنی عەشق و سۆز و خۆشەویستیی ژن و داکۆکی کردن لە بەمێرددانی بەزۆرەملێ؛ بۆمان دەردەکەوێ کە وای پێ باش بوو ژن وەکو کۆتەڵ و پەیکەرەیەک، بێ هەست و بێ دەنگ بێ. لە ڕوانگەی رۆسۆوە، ژنان نەک هەر مەحکوومن بەوەی کە دەبێ لەگەڵ هەست و سۆز و خرۆشی خۆیان لە ململانێیەکی بێ بڕانەوە دابن، بەڵکو دەبێ هەمیشە ئامادەی ئەوەش بن کە گیانی خۆیان بکەن بەفیدای داوێن پاکی و لەم بارەوە هیچ جیاوازی و ناوازەییەک نییە لە نێوان ژنانی شارو دێهاتاندا. لە

(١) لە راستیدا رۆسۆ رۆمانی هێلۆییزی نوێی لەسەر بنەمای بەسەرهاتی ئەویندارانەی ئابێلارد Abe lard و گراوییەکەی واتە "هێلۆییز" نووسی کە سەرەتا قوتابیی ئابیلاردبوو. بەسەرهاتی ئابیلارد و هێلۆییز بەم جۆرەیە، رۆژێک مامی هێلۆییز بەناوی کانۆن فولبێرت canon fulbert هێلۆییزی برازای کە کچۆڵەیەکی زیت و زیرەک و بەتوانابوو دەباتە لای ئابێلارد بۆ ئەوەی فەلسەفەی فێر بکا. ئەو دووانە ئاشقی یەکتردەبن و هێلۆییز لە ئابێلارد کوڕێکی دەبێ. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئابێلارد لە سەدەی دوازدەهەمدا دەژیا و لەوکاتدا کابرا بۆی نەبوو هەم فەیلەسووف بێ و هەمیش ژن بێنێ داوای لە هێلۆییز کرد کە زەماوەندەکەیان وەک سوڕێکی نهێنی بمێنێتەوە. بەڵام مامی هێلۆییز بەم کارەی ئابێلارد تووڕەبوو. فەرمانیدا یەکێک لە نیوەشەوێدا بچێ بیخەسێنێ. هێلۆییزیش ژیانی لەمەودوای خۆی لە گۆشەگیری دوورەپەرێزیدا تێپەڕکرد. بۆ خوێندنەوەی زیاتر بڕواننە Abelard and Hilise 1974, PP 66 – 77- 159-

چیرۆکەکانی رۆسۆدا کە لاساییەکن لە باوەڕە کۆن و لە مێژینەکان، ژن لە سەرێتی لەلایەکەوە خاوەنی کەفوکوڵی ئەویندارانە و هەست و حەزی سێکسی و وزەی ورووژێنەربێ، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ وەک ژنێکی داوێن پاک و بە ئەمەگ بەنیسبەت پەیمانی ژن و مێردایەتییەکەی وەفادار بمێنێتەوە.

بۆ تێگەیشتن لە گریمانەی رۆسۆ لەسەر ژنان، پێویستە لێرەدا سەرنج بدەینە ئەو بۆچوونە لێکدژا و ناتەبایانەی ئەو، کە سەبارەت بە تاکی مرۆڤ دەری بڕیون. یەکەم پێک ناکۆکیی نێوان تاکی مرۆڤ و پێداویستییەکانی ئەو؛ لە حکوومەتێکی کۆماریدا؛ دێنەگۆڕێ. رۆسۆ لە سەر ئەم باوەڕیە کە هەموو مرۆڤێک هەم وەک تاکەکەس و هەم لە باری کۆمەڵایەتییەوە دەبێ بخرێتەبەر پەروەردەی تایبەتەوە. بەو جیاوازییەوە کە دەبێ پیاوان لە ژنان جوێ بکرێنەوە.

چونکە ئەو شتانەی کە پیاوان دەبێ فێری بن؛ بەهیچ جۆرێک بۆ ژنان شیاو و گونجاو نین، دووهەم: لە راپەڕاندنی کارەکاندا؛ لێک دژی و دژوازییەکان؛ دوولایەنەن. رۆسۆ لەم کارانەدا کە هەردوو تاکی مرۆڤ واتە ژن و پیاو؛ حەزیان لە بەڕێوەبردنێتی: ئەرکی راپەڕاندنیان دەخاتە ئەستۆی یەکێکیان. بەواتایەکی دیکە، پیاوان زیاتر حەزیان لە بەڕێوەبەرێتییە و ژنانیش چاوەڕوانییان هەیە کە ئەم ئەرکانە راپەڕێنن وا خستوویاننەتە ئەستۆیان. سێهەم؛ لێکدژیی لە نێوان ویست و پێداویستییەکانی بنەماڵەیەک لەگەڵ کۆماری ئایدیالدا. رۆسۆ لەم پەیوەندییەدا بەردەوام خەریکی پێکەوە گرێدان و رێکخستنی پێداویستییەکانی بنەماڵە و حکوومەتی کۆمارییە. بەڕای ئەو، پێداویستییەکانیان هەر یەکێکن.

هەڵبەت پێویستە بگوترێ کە باس و لێدوانەکەی رۆسۆ سەبارەت بەم لێک دژی و ناتەباییانە، زۆر لێل و ئاڵۆزە. ئەم لێڵی و ناڕوونییە بەتایبەتی لە دووهەمین و سێهەمین لێکدژیدا زۆر روون و بەرچاوە. چوارەم؛ لێکدژیی و ناتەبایی نێوان سەربەخۆیی ئایدیالی مرۆڤی سروشتی و مرۆڤی کۆمەڵایەتی و مەدەنییە. لێکدژیی چوارەم سەرەکیترین لێکدژییە، کە لە تیۆریی کۆمەڵایەتی-سیاسیی رۆسۆدایە. ئەو لە سەرەتای کتێبی ئێمیلدا راستگۆیانە ئاماژەی بە ناتەبایی ئەم دوو دیاردەیە واتە تاک وەکو هاوڵاتییەک لە کۆمەڵگای مەدەنیدا و



وەکو مرۆڤی سروشتی لە سروشتی شەقڵ نەشکاودا؛ کردووەو نووسیوێتی: "مرۆڤی سەرەتایی و سروشتی؛ تەواو بەسەربەخۆیی دەژیا. ئەو تاکێکی تەنیابوو؛ هیچ پەیوەندییەکێشی لەڕووی پێویستی و چاولەدەستییەوە لەگەڵ خەڵکدا نەبوو، تەواوی ژیانیشی شەقڵ نەشکاو و سروشتی بوو.[٣٣] هەروەها مامۆستای ئەم مرۆڤە، سروشتە و تەواوی پەروەردە و راهێنانەکانی سروشت بۆ ئەم پێویستییە (ضرورت) کە ئەو (مرۆڤ) بە هۆی کۆمەڵگای مەدەنییەوە گەندەڵ نەبێ و بەلاڕێدا نەچێ.[٣٤] رۆسۆ لە کاتی داڕشتی گریمانەی پێک هێنانی حکوومەتی سروشتیدا، لەسەر ئەم باوەڕەیە کە؛ مرۆڤی سەرەتایی و سروشتی؛ هەتا ئەودەمەی هیچ کۆسپ و لەمپەرێکیان نەخستۆتە سەر رێگەی گەیشتن بە ویست و ئامانجەکانی؛ حەزی لە چاکەکارییە؛ چونکە ئەو بە شێوەی سروشتی بۆی دەرکەوتووە کە چاکە و چاکەکاری مرۆڤ شاد و مەزن دەکا. بەڵام هاووڵاتییەک کە ژیانێکی کۆمەڵایەتیی هەیە و بەپێی پێویست و بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی پەیوەندیی بە خەڵکەوە دەگرێ، لە چاو مرۆڤی سەرەتایی ئەرکێکی ئێجگار مەزنتری لە ئەستۆیە، چونکی هاووڵاتیی کۆمەڵگای مەدەنی لەوانەیە لە پێناو بەرژەوەندیی گشتیدا لە خۆبوردوویی زیاتریان هەبێ و بەرژەوەندییە کەسێتی و تاکەکەسییەکانی خۆیان بکەن بە قوربانی بەرژەوەندیی گشتی. بەو پێیە هەر بەرژەوەندییە کەسێتی و تاکە کەسییەکانی خۆیان بکەن بە قوربانی. بەو پێیە هەر ئەوەندە بەس نییە کە هاووڵاتییان بایەخ بە حەزە سروشتییەکانی خۆیان بدەن و تەنیا باش بن.

ئەوان دەبێ فێری داوێن پاکی و مەزناهیش بن. ئەو لەم بارەوە لە کتێبی ئێمیلدا دەنووسێ: "هاووڵاتیی کۆمەڵگای مەدەنییە وەک پاژێک وایە کە نەک هەر بەستراوەتەوە بە «کۆ»و گشتەوە؛ بەڵکو تەواوی بەهای خۆی لەو ژمارەیە وەردەگرێ. ئەو پاژێکە لە جەستەی کۆمەڵگا و تەواو بەوەوە بەستراوەتەوە و دەبێ بەرژەوەندیی خۆی لەبەر چاو نەبێ[٣٥] بەواتایەکی دیکە هاووڵاتییەک پاژێکی سەربە کۆ واتە کۆمەڵگایە و بەهاو بایەخی ئەو بە، بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە گرێ دراوە. بەوپێیە دامەزراوی بەکەڵکی کۆمەڵایەتی؛ ئەم دامەزراوگەلەن کە بایەخ بدەن بە چۆنێتی گۆڕان و

ئاڵوگۆڕییەکانی مرۆڤ لە هەلومەرجە جۆراوجۆرەکاندا و بەپێی ئەم هەلومەرجانە؛ ئالترناتیڤەکان بخەنەڕوو.

بەپێی قسەی رۆسۆ، پەروەردەی هاوولاتیی واقیعی؛ هەر ئەو پەروەردەیەیکە سپارتەکان و رۆمانییەکان بۆ هاوولاتییانی خۆیان بەکاریان دەهێنا. لەم شێوە پەروەردەییەدا، گرۆیی و ویستی مرۆڤی سروشتی دەبووە قوربانیی ویست و داخوازییە گشتییەکان و لە ئاکامی کەسایەتی و تایبەتمەندی و خەسڵەتە تاکە کەسیەکاندا وردە وردە دەگۆڕدرا.

بۆ وێنە رۆسۆ ئاماژە بە برۆت Brute و پێداریتێس pedaretes دەکا کە بروت بڕیاری مەرگی کوڕەکانی خۆی دەرکرد لەبەر ئەوەی خەیانەتیان بە کۆمار کردبوو، پێداریتیسیش؛ لەبەر کەمتوانایی خۆی؛ بەو هۆیە بەمەبەستی ئەندامەتی لە ئەنجوومەنی شاری سپارتەدا ناونووسی نەکرد کە سێ هەزار کەسی لەو لێوەشاوەتر بۆ ئەندامەتی لەوێدا ناو نووسیان کردبوو؛ هەروەها ئەو دایکە سپارتییەی کە بەرەو پەرستشگاکان هەڵدێ بۆ ئەوەی شوکرانە بژێریی خواکان بکا کە پێنج کوڕەکەیان لە رێگەی سەرکەوتنی نیشتیماندا لێ ئەستاندۆتەوە.[٣٦] ئەو هاوولاتییەی رۆسۆ پشتیوانیی لێدەکا کەسێکە نە بیر لە بەرژەوەندیی خۆی دەکاتەوە و نە ئەوەی کە تەنانەت لە بەرژەوەندیی ئەم مرۆڤگەلەی لەولاتانی تردا دەژیی؛ بەڵکو کەسێکی نیشتمانپەروەرە کە "بەپێی هەست و سۆز و خۆشەویستیی خۆیەوە"[٣٧] تەنیا بیر لە هاوولاتییەکانی خۆی دەکاتەوە.

رۆسۆ شێوەی پەروەردە و راهێنانی گشتیی ئەفلاتوونی بەلاوە باشترین و واقیعی ترین میتۆدە و بیروڕای خۆی لەسەر ئابووریی سیاسی، چەند تێبینییەک لەسەر حکوومەتی پۆلۆنیا و لە کتێبی "نامە بۆ دالامبێر" دا دەربڕیوە. هەروەها ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە باشترین و تاکە رێگای سەلماندنی گونجاوترین شێوە و میتۆدی پەروەردەیی ئەوەیە کە ئەم شێواز و میتۆدە لە راهێنان و پەروەردە کردنی هاوولاتییانی باشدا سەرکەوتووبێت و بتوانێ هاوولاتیی تەواو پەروەردەکراو بداتە کۆمەڵگا. رۆسۆ لە هەلومەرجەکانی ولاتی باوکی خۆیدا ئەم شێوەیە بەکاریگەر نازانێ و لە کتێبی ئێمیلدا دەنووسێ: ئەگەر بمان هەوێ هاوولاتییانمان بە شێوەی گشتی لێرە پەروەردە بکەین؛ هەلومەرجی ئەمجۆرە



پەروەردەیە لەبارنییە و ناچارین کەڵک لە تەنیا ئالترناتیڤی ئەو، واتە پەروەردە و راهێنانی تایبەت وەرگرین.[٣٨]

لە رەوتی بە کۆمەڵایەتی بووندا رۆسۆ بۆ ئەم پرسیارە کە: ئایا کۆمەڵگا کە لە کۆمەڵێک مرۆڤی مەدەنی پێک هاتووە، لە رەوتی گۆڕانەکانیدا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی و گەشبین بە مرۆڤی سروشتی یا ئەوەی کە کۆمەڵگای سەرەتایی کە لە مرۆڤە سروشتییەکان پێک هاتووە، دەبێ بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی هەنگاو بنێ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە "ئەو کەسەی بە ئاواتە لە ژیانی شارنشینیدا هەست و سۆزی سروشتی و مرۆیی بێنێتە کار، نازانێ لە نێو حەز و ویستییەکانیدا تووشی پارادۆکس و گومان دێ. ئەو هەرگیز ناتوانێ هەم مرۆڤێکی سروشتی بێ هەم مرۆڤێکی مەدەنی؛ بۆیەش لەم دۆخەدا، نە قازانجی بۆ خۆی هەیە و نە بۆ کەسانی دیکە[٣٩]. بەو پێیە، بەو کێشەیەی رۆسۆ لە باسەکانی خۆیدا خستوویەتەڕوو، دەکرێ ئەم رەخنەیەی لێ بگرین کە چۆن داوا لە مرۆڤێکی پەروەردەکراوی وەک ئێمیل دەکا، کە وێڕای پاراستنی هەست و سۆزە سروشتییەکانی وەکو مرۆڤێکی سروشتی هەڵسوکەوتێکی گونجاوی مەدەنیانەی لەگەڵ خەڵکانی، دیکە هەبێ و مەدەنیانە بجووڵێتەوە و لەگەڵیاندا ئاڵوگۆڕی بیروڕا بکا؟ ئەو لە کتێبی ئێمیلدا لەم بارەوە دەڵێ: لەوانەیە ئەگەر دوو ئامانج لەبەر چاوبگیردرێ، بۆ دەربازبوون لە کێشەی دژوازی و ناتەباییە مرۆییەکان؛ لەوانەیە ئەم دوو ئامانجە لە ئامانجێکدا کورت بکرێنەوە[٤٠]. بەڵام چارەنووسی ئێمیل ئەم بۆچوونەی رۆسۆ واتە تێک هەڵکێشانی دوو ئامانج و کردنیان بە ئامانجێک، بەتاڵ دەکاتەوە؛ چونکی ئێمیل حەزی لەوەنییە بە تەنیا بژی و دەیهەوێ "وەک مرۆڤێکی سروشتی لە شاردا بژی و... دیارە کەسێکی کێویی کە بۆ ژیان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پەروەردەکراوە،[٤١] "دەبێ بزانێ کە لەم هەلومەرجانەدا چۆن بژی. چونکی ئەوشتەی بۆ هاوولاتی بوون لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پێویستە؛ ئەوەیە کە دەبێ هەم رۆڵی باوک ببینێ هەم مێرد[٤٢].

تەواوی ئەو گەلاڵە و پلانگەلەی رۆسۆ بۆ ئێمیلی داڕشتبوون، بە ئاکام نەگەیشتن و شکستیان خوارد و ئەوەش سەلماندی کە پێک ناکۆکیی نێوان مرۆڤی سروشتی و مرۆڤی مەدەنی شتێکی چارە هەڵنەگرە؛ چونکی ئەم دوو

دۆخە پێکەوە ناتەبا و ناسازگارن. پەروەردەی سروشتی بەو مەبەستەکرا کە ئێمیل وەک مرۆڤێک بە گوێرەی حەز و ویستە سروشتییەکانی خۆی بمێنێتەوە و بە هۆی عەشق و خۆشەویستیی نیشتیمان و گرۆییەکان خۆی نەکەوێتە بەر تەوژمی ئازارەوە. چیرۆکی ئێمیل ئو شتە پشتڕاست دەکاتەوە کە رۆسۆ لە سەرەتای بەشی یەکەمی کتێبەکەی خۆیدا هێناویێتی. بەواتایەکی دیکە، دەبێ مێتودێکی دیکەی پەروەردە و فێرکردن بۆ راهێنانی مرۆڤەکان بەکاربهێندرێ؛ واتە شێوازێکی پەروەردە کە مرۆڤی سەرەتایی فێری ئەوەبکا کە چۆن دەتوانێ ببێتە هاوولاتییەک، یامیتۆدێکی پەروەردەیی کە مرۆڤی کۆمەڵگای مەدەنی بەرەو مرۆڤی سروشتی دەبا، بەڵام ئەگەر چاوەڕوانیمان لە هاوولاتییەک هەبێ کە هاوکات بە دوو میتۆدی پەروەردەیی کاربکا، چاوەڕوانییەکی بێ جێمان لێی هەبووە. بۆ وێنە؛ ئەگەر داوای لێ بکەین کە وەک مرۆڤێکی سەرەتایی بجووڵێتەوە و لە هەمانکاتیشدا، یاسامەندیی کۆمەڵگای مەدەنیش لە بەرچاو بگرێ یا بە پێچەوانەوە، داوا لە مرۆڤی سەرەتایی بکەین وێڕای هەڵسوکەوتی سروشتی هاولاتییەکی کۆمەڵگای مەدەنییش بێ دابین بوونی ئەم داخوازییە مەیسەل نابێ.

رۆسۆ سەرەڕای تەواوی ئەم لەسەر رۆیشتنانە؛ سەبارەت بە شێوازی پەروەردەی ژنان بۆچوونێکی دیکەی هەیە؛ ئەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە تەنیا یەک شێوازی پەروەردەی پاشکۆیی بۆ ژنان هەیە. سۆفی وەکو ئافرەتێک بۆی نییە کە وەک ئێمیل کەسایەتییەکی سەربەخۆی هەبێ و خاوەنی دەنگی سەربەخۆ بێ و لە باری ئابوورییەوە تێروتەسەل و بێ نیاز بێ. سەبارەت بە شێوەی پەروەردەیی سۆفی و ژولی هیچ باسێک لە بوونی دەسەڵاتی هەڵبژاردان و سەربەخۆیی ئابووریی لە گۆڕێدا نییە و رۆسۆ لە بری ئەوانە، میتۆدەکانی گوێڕایەڵی و ملکەچیی ژن لە بەرامبەر پیاودا، دەخاتەڕوو. ئەم دوو پاڵەوانەی رۆسۆ، دەبێ کچ، هاوسەر و دایکێک بن کە بەردەوام لە ژێر چاودێریی مێردەکانیاندا بن و لەراستیدا ژێردەستە و ملکەچیان بن. ئەو کەسانەی رێز و شەرافەتیان بە ستراوەتەوە بە ئاستی گوێڕایەڵی و ملکەچییان لە بەرامبەر باوکان یامێردەکانیاندا. لە چوارچێوەی هزریی رۆسۆدا پلانی پەیوەندیی ژنان



تەنیا بۆ تاقمێکی تایبەت داڕێژراوە کە ئەویش پەیوەندیی بەمێردی ئەم ژنانەوە هەیە، ئەم ژنانەی کە لە هەموو بوارێکدا تواناکانیان بەم پیاوانەوە بەستراوەتەوە. لەم پەوەندییەدا پیاوان فێری ئەوە کراون کە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بەسەر ژناندا زاڵ بن. دیارە دەبێ چاوەڕوانیمان لە ژنانی ژێنێڤی یا هەر ژنێکی دیکە هەبێ کە بەنیسبەت ئەم شێوازە پەروەردەییەی رۆسۆ ناڕەزایەتی دەربڕن کە تێیدا ژنان لە مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان بێبەریی کراون و پێگەی کۆمەڵایەتییان لە ئاستێکی ئێجگار نزم دایە. رۆسۆ لە سەرەتای پەیمانی کۆمەڵایەتیدا نووسیویێتی: "من لەوڵاتێکی ئازاددا لەدایک بووم و ئەندامی وەڤدی دەسەڵاتداری میللیم. لەبەر ئەوەی مافی دەنگدام هەیە، ئەرکی خۆمە لە سەر حکوومەت و کاروباری کۆمەڵایەتی و گشتی لێکۆڵینەوە بکەم و تاوتوێ یان بکەم(٤٣). ئێستا ئەگەر لێی بپرسین ئایا ژنانیش وەکو ئێوەی پیاو خاوەنی ئەم مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییانە هەن؟ ئەو وەڵامی "نا" دەداتەوە؛ چونکی بە باوەڕی ئەو هیچ کەس مافی ئەوەی نییە دەست لەم کاروبارە وەربدات. لەم بارەیەوە دەکرێ ئاماژە بە شێوازی پەروەردەیی رۆسۆ بۆ سۆفی و ژولی بکەین کە وەها مافێکی رەوای بۆ ئەوان لەبەر چاو نەگرتبوو.

لەو دژوازی و پارادۆکسە بەرچاو و حاشا هەڵنەگرانەی لە تیۆریی سیاسی-کۆمەڵایەتیی رۆسۆدا هەیە ناتەبایی و پێک ناکۆکیی ئەڤینی تاکەکەسی و دەروونییە دەگەڵ ئەو عەشقە دەستکردەی بۆ هێمنی و ئاسوودەیی بنەماڵە یانیشتمان لە گۆڕێ دایە. رۆسۆ بەردەوام بە ئاواتی ئەڤینێکی رۆمانتیکییە کە دەست پێی راناگا(٤٤). و لە تیۆرییەکەی ئەودا لێکدژیی نێوان ئەم ئەڤینە رۆمانتیکییە و ئەو عەشقە دەستکردە؛ بەڕوونی بەدی دەکرێ. بەواتایەکی دیکە ئەو دەی هەوێ؛ مەسەلەی ئەم عەشقە رۆمانتیکییەی لە زەینی خۆیدا هەیبووە لە جلوبەرگی خەیاڵ و لە جیهانی واقیعدا بیخاتەڕوو. بۆ وێنە؛ ئەو لە زمانی ژولییەوە دەنووسێ: ئەو شتەی کە بەناوی عەشق دەگەڵی دەستەوئێخەین، لە راستیدا لە وەهم و خەیاڵەزەینییەکانمانەوە سەرچاوە دەگرێ؛ چونکە لە جیهاندا عەشقی راستەقینە بوونی نییە.(٤٥) رۆسۆ سەردەمێک عاشقی خاتوو دێ دۆت mme d'Houdet بوو، لە چیرۆکەکەشیدا؛ تایبەتمەندییەکانی ئەوی بە ژولی بە

خشیوه. هەروەها هاوشێوەی ئەم وێنا و خەسڵەتانە، کەسایەتیی ئێمیلە کە لەپێشدا و بەپێی تایبەتمەندییەکانی خۆی، هاوسەرێکی ئایدیالی وەک سۆفیی لە زەینی خۆیدا بۆ ئەو پەروەردە کردبوو. ئێمیل لە یەکەم چاوپێکەوتندا کە ناوی سۆفی دەبیستێ، تێدەگا کە ئەم کچە بەراستی هەر ئەو کەسەیە کە ئەو لێی دەگەڕێ، بۆیەش هەر لەو ساتەوە عاشقی دەبێ.[٤٦] بەڵام بە تێپەڕینی کات ئەم ئەڤینانە نە کاڵ دەبنەوە و نە لە کەفوکوڵ دەکەون. بۆ وێنە؛ ژولی دان بەوە دادێنێ کە لەوانەیە یەکێک بەتوندی هەست بە بوونی عەشق بکا و بە دیاردەیەکی نەمری بزانێ، بەڵام کاتێک پێی دەگا و لێی پاراو دەبێ، عەشق دەژاکێ و تەنانەت دەبێتە مایەی لۆمە و سەرکۆنە و وێنەی سەرەتاکەی لە زەینی مرۆڤ پاک دەبێتەوە. بۆیەش ژولی بۆ ساین پرێڤ دەنووسێ: "لە ئەزەلەوە نەبینراوە دوو ئەڤینداری پیر بە حەژمەت و تاسەی یەکترەوە بن، چونکی عەشق هەر لەسەردەمی گەنجێتیدا دەسوێ و جوانییەکەی کاڵ دەبێتەوە و تورتی و ناسکییەکەی دەژاکێ". لەوەدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان عەشقی سۆفی و ژولیدا نییە، چونکی کاتێک عەشقی سۆفی بە کۆتایی گەیشت؛ لە گراوییەکەی واتە ئێمیل جوێ بووەوە و دابڕا. ڕۆسۆ نەک هەر لە کتێبی دانپیانانەکان بەڵکو لەبەرهەمەکانی دیکەشیدا، بەروونی باسی لەم جۆرە پەیوەندییە ئەڤینداریییە دوولایەنانە کردووەتەوە[٤٨] ڕۆسۆ بە پەیڕەوی لە فەیلەسووفی ڕاستەقینەی عاشقان، واتە ئەفلاتوون کە باوەڕی وابوو "عاشقان جیا لە دەربڕینی هەست و سۆز هیچ شتێکیان نییە بۆ یەکتر"[٤٩] سەرچاوەی عەشقی بەتین و خرۆشی ساین پرێڤ دەگێڕێتەوە بۆ کەفوکوڵە سروشتییەکان و بەسەرهاتەکەی ئەو لە دوای ئەوەی توانیی شەوێکی لەگەڵ خۆشەویستەکەی واتە ژولی رابوێرێ.

بەمجۆرە [بۆمان] دەگێڕێتەوە: "ئاە خۆشەویستە شیرنەکەم، لێگەڕێ بابمرین، خۆشەویستەکەی دڵم ئێمە کە ئێستا لە چێژ وەرگرتن تێربووین، لەمەودوا چ شتێ هەیە بیکەین"[٥٠].

ساین پرێڤ کە خۆی و تەواوی ئاواتەکانی خۆی نابووە بەردەستی ژولی و بۆ ئەوەی بتوانێ تەواو خۆی بنێتە بەردەستی، پەیوەندیی خۆی دەگەڵ خەڵکانی



تر پساندبوو، لە کاتی جوێ بوونەوە لە خۆشەویستەکەی، بەمجۆرە دەناڵێ و دەڵێ: "مانای ژیانی من و تۆ لەچی دایە، چییە مانای ژیان لە دونیایەکدا کە بە هەست و سۆزی شیرین تێرمان دەکا؟"[٥١]

لۆرد بۆمستۆن lord Bom ston بەمجۆرە حەز و ئینتمای ئانارشیستی و ئەڤینی پاوانخوازانەی ساین پرێڤ لە زمانی مەحرەمی ڕازەکەیەوە دەگێڕێتەوە: "یاساکان هەموو کۆسپن و نادادپەروەرانەن. تەواوی ئەو پیاوانەش کە ئەم یاسایانە دادەڕێژن زاڵمن. داوێن پاکیی دوو مرۆڤ کە بە شێوەی سروشتی پێکەوەن نە مەسەلەی دەسەلات و حکوومەتە و نەپەیوەندیی بە دەسەلاتی باوکانەوە هەیە، بەڵکو لە ژێر دەستی باوکی تاقانەمان دایە واتە ئەو کەسەی پادشای دڵەکانە"[٥٢].

بەڕای بۆمستۆن لێرەدا، گرینگی و سەرەتایی عەشق و خۆشەویستیی بەسەر دەوڵەت و بنەماڵەدا بەڕوونی دیارە. هەروەکی ڕۆسۆ لای خۆی لێکیداتەوە و بۆمستۆنیش لە باسکردنی ملکەچیی ساین پرێڤ لە بەرامبەر داخوازییەکانی خۆشەویستەکەیدا ئەم نەوەیەی خستۆتەڕوو وێدەچێ کە خۆ بەدەستەوەدانی مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕەها بۆ خۆشەویستی؛ دەبێتە هەڕەشەیەک لەسەر وەفاداری و ئەمەگداریی ئەو بەنیسبەت بنەماڵە، نیشتیمان و تەنانەت مرۆڤ و دیارە کە بیر ئاڵۆزیی ساین پرێڤ ساین بەنیسبەت ژولییەوە جێی تێڕامانە. بەگشتی ئەگەرچی ڕۆسۆ وەک مەیل و حەزێکی سروشتی باسی لە ئەڤینی سێکسی و ڕۆمانتیکی کردووەو وەک هەست و کەفوکوڵەکانی دیکە بەدیاردەیەکی بەهاداری دەنرخێنێ، بەڵام داواجار ئاماژە بە خاڵێکی گرینگ دەکا کە لە ڕاستیدا، کاکڵی بیروباوەڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانێتی. ئەم لەو بارەوە دەڵێ: ئەو هەست و ئەوینە باش و بەنرخە؛ کە لەبەر دەستی ئێمەی پیاودابێ و نەهێڵین هەوساری کاروبارەکەی بکەوێتە دەستی کەسانی دیکە [ژنان] و ئەوان ببنە ئاغا و کوێخامان. بەواتایەکی دیکە ئەگەر عەشق لە بەردەستی پیاوان دابێ و ئێزن بەژنان نەدەن کە بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەلات وەک ئامرازێک کەڵک لە هێزی سێکسی خۆیان وەربگرن، ئیدی خۆشەویستی و عەشق دیاردەیەکی باشە". ڕۆسۆ لە درێژەی وتارەکەیدا ئامۆژگاریی ئێمیل دەکا کە: "ئەگەر پیاوێک

حەز لە ژنی دراوسێکەیان بکا؛ تا ئەو کاتەی بەسەر هەست و سۆز و هەستەوەریی خۆیدا زاڵە تاوانبار نییە، بەڵام ئەگەر ئەم پیاوە ژنەکەی خۆی خۆشی بوێ بە جۆرێک کە هەموو شتێکی خۆی بەفیدا بکا، روون و ئاشکرایە بە تاوانبار لە قەڵەم دەدرێ."[٥٣]

بیروڕای رۆسۆ لە سەر عەشقی رۆمانتیک لە نامەیەکدا بەمجۆرە خراوەتەڕوو: "ئێمە بۆ عەشقی پاوانخوازانەی خۆمان کە کوێر و زاڵمی کردووین؛ باش سزا دراوین، چونکی ئەم خۆشەویستییە دونیای ئێمەی لەو کەسەدا بەرتەسک کردۆتەوە کە خۆشماندەوێ. مرۆڤەکان؛ هەموو برای یەکن و دەبێ هەمووان برای ئێمە بن. ئەوە چەتەو دزەکانن کە دەبنە هۆی جیاوازیی خستن لە نێو ئێمەی مرۆڤدا"[٥٤] لێرەدایە کە دەبێ بڵێین؛ جا ئەگەر جیاوازی خستن لە دۆستایەتیدا وەک دزی وابێ، بەو پێیە عەشق و وەفاداری لەوەش خراپترە؛ چونکە جیاوازیی خستن لە ئەڤین و وەفاداریدا ئێجگار بەر چاوتر و زیاترە. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ بۆچی رۆسۆ لە هۆڵی شانۆی ژێنێڤدا لەگەڵ عەشقی رۆمانتیک دژایەتی دەکرد. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە شارێکی وەک ژێنێڤ خاوەنی هەستەوەریی شاریانە و ئاستەنگ گەلی ئەخلاقییەو لەوانەیە رۆژێک لە رۆژان، ئەم مۆراڵ و هەستەوەرییانە لاوازبن و کەم ببنەوە و بێبەشی و هەژاریی سێکسی لەم شارەدا پەرەبستێنێ[٥٥] چونکە: "خراپترین مرۆڤەکان ئەو کەسانەن کە لە هەمووان پتر خۆیان دوورەپەرێز رادەگرن و هەست و دڵی خۆیان تەنیا بەخۆیانەوە خەریک دەکەنەوە. بەدیوی دیکەدا ، باشترین مرۆڤەکان ئەوانەن کە بە شێوەی یەکسان خۆشەویستی و دڵۆڤانی دابەش دەکەن بەسەر مرۆڤەکاندا. هەبوونی گراوی و خۆشەویستی زۆر و خۆشویستنیان لەوە باشترە کە لە دونیادا تەنیا کەسێکمان خۆش بوێ."[٥٦] دیارە رۆسۆ کە ئاوات و ئارەزووەکانی پیاوانی سەردەمی خۆی دەربڕیوە؛ جوان لەوە تێگەیشتبوو کە عەشقی رۆمانتیک جۆرە ئەڤینێکی تاکەکەسی و تایبەتە کە بڵێی و نەڵێی ئاکامەکەی دەگاتە زەماوەندکردن کە ئەویش بنەمای پێکهاتنی دەزگایەکی کۆمەڵایەتی واتە بنەماڵەیە. ئەگەرچی رۆسۆ دەڵێ: زەماوەندکردن دەبێتە هۆیَ بەختیاری و بەردەوامی عەشق و لە سەر زەوی شوێنێکی وەکو بە هەشتت بۆ



دەخوڵقێنێ؛ بەڵام دەمودەست دەڵێ وەها ژیانێکی هاوبەش هیچ کات مەیسەر نابێ و خوێنەرەکانی لەوە خاترجەم دەکا کە هەرگیز وەها بەهەشتێک ناخوڵقێ.

ئەو لە ئێمیلدا دەڵێ: "وێڕای ئەوهەمووە بایەخ و سەرنجەی بە عەشق دەدرێ؛ قەت زەماوەندکردنێکی وای لێناکەوێتەوە کە ببێتە هۆی بەردەوامبوونی."[٥٧] و لەم پەیوەندییەدا ئامۆژگاریی سۆفی دەکا بۆ ئەوەی ئەو دەبێ لە دابینکردنی حەز و ویستە ئەڤینداریەکانی ئێمیل و وروژاندنی وزەی سێکسی ئەودا، تا ئەو جێییەی بۆی دەلوێ دەست پێشخەری بکا. رۆسۆ وێڕای هەمووی ئەم پێشنیار و ئامۆژگاری کردنانە؛ ئاخرییەکەی لە مەڕ زەماوەند کردنەوە دێتە سەر ئەم باوەڕە کە: "وردە وردە تاسەی سێکسیی پیاو دادەمرکێ؛ ئیتر بۆ درێژەی ژیانی هاوبەش و پێکەوە ژیانی بەردەوام ناچارن بەداوێن پاکی و متمانە بەخشین بە یەکتر و رێزی یەکترگرتن هەستی تەبایی بەهێزتربکەن؛" ئەو بوونی منداڵ بە یەکێک لە هۆکارە گرینگەکانی بەهێزی و بەردەوامی ژیانی هاوبەش دەزانێ و دەڵێ: "منداڵ لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا دەبێتە ئاڵقەیەکی پتەوی عەشق و خۆشەویستی بۆ بەردەوامبوونی ژیان تا ئەو جێییەی کە زۆر جاران تۆکمەیی و پتەویی ئەو عەشقە ئەوەندە دەبێ کە سنووری یەکتر خۆشەویستیی ژن و مێرد دەبەزێنێ.[٥٨] لە کتێبی هیلۆییزی نوێدا رۆسۆ لە زمانی ژولییەوە دەنووسێ: عەشقی رۆمانتیکی نەک هەر نابێتە هۆی بەردەوامی و درێژماوەیی ژیانی هاوبەش بەڵکو ئەم جۆرە عەشقە لە ژیانێکی هاوبەشی سەرکەوتوانە و باشدا هیچ پێگەیەکی نییە؛ چونکی: "عەشقێک کە ئێرەیی پێبردن و دڵەراوکێ و کەڵکەڵەی دەگەڵە بە دەگمەن دەگەڵ ژیانی هاوبەش یەکدەگرێتەوە کە ئۆخژن بەخش و هێورکەرەوەی مرۆڤە. خەڵک لەبەر ئەوە زەماوەندناکەن کە تەنیا بیر لە خۆیان و خۆشەویستەکەیان بکەنەوە. ئەوان بۆیە زەماوەندەکەن کە بتوانن ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیان راپەڕێنن و چاودێرییەکی بەزیپکو زاکونیان بەسەر ژیانی خۆیاندا هەبێ و دیارە یەکێک لەم ئەرکە کۆمەڵایەتییانە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی مناڵە لەکۆمەڵگەدا.

بەڵام ئەڤینداران تەنیا بیر لە ئەڤین و خۆشەویستی دەکەنەوەو و حەز ناکەن جیا لە خۆشەویستەکەیان بیر لە کەسی دیکە بکەنەوە. دیارە ئاکار و

هەڵسوکەوتی عاشقان ناتەبایە لەگەڵ زەماوەندکردن و پێک هێنانی بنەماڵە، چونکی هەروەکی گوترا، خەڵک بۆیە زەماوەند دەکەن کە بتوانن ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیان راپەڕێنن."[٥٩] لە روانگەی رۆسۆوە زەماوەندکردن واقعێکی کۆمەڵایەتییە کە ئەستەمە ئاکامێکی سەرکەوتوانەی هەبێت. زەماوەندکردن بە مەرجێک سەرکەوتوانە لە ئاو دێتەدەر، کە لەسەر بنەمای شەرافەت، داوێن پاکی و رێککەوتن دامەزرابێ و دوور بێ لە جۆش و خرۆش و کەفوکوڵی کێشە خوڵقێن. کاتێک ساین پریڤ گراوییەکی ئایدیالی وەکو ژولیی هەبوو، هیچ کات بیری لە ژن هێنان نەکردەوە و تەنانەت ژولیش لە شکوگومان دابوو کە ئایا ئەو دەتوانێ ببێتە مێردێکی باش بۆ ئەم یان نا؟ رۆسۆ لەم قسەیەی خۆی بەو دەرەنجامە دەگا کە هاوسەر بوون و لە هەمانکاتیشدا گراوی (مەعشوق) بوون بەیەکەوە ئەگەر مەحاڵ نەبێ شتێکی دەگمەنە.[٦٠] لە بەرامبەردا؛ رۆسۆ کەسایەتیی ئۆلماری بە جۆرێک دارشتوە کە ئەو وەک مێردێکی ئایدیال، بە باوک و گەورەی ماڵێ لە قەڵەم بدرێ و زەماوەندکردنی ئەو دەگەڵ ژولی ببێتە نموونەیەکی دڵخواز بۆ خەڵکانی دیکە. دیارە بوونی ساین پریڤ لەم پەیوەندییەدا کێشەیەک بۆ ئۆلمار کە پیاوێکی بێ هەست و ساردوسڕە، ناخوڵقێنێ.

لێرەوە؛ یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بەم جۆرە زەماوەندە؛ کە وەک نموونەیەکی باش بۆ ژیانی هاوبەش چاوی لێدەکرێ، ئەوەیەکە کەفوکوڵی عاشقانە وەلا بنێ، بەوشێوەیە کە ژولی ژیانی خۆی کردە قوربانی. ژولی لەسەر دووڕێیانی عەشق و زەماوەندکردن تێدا مابوو کە کامیان هەڵبژێرێ.

ئەگەر یاسا و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان نەبوایەن کە ببووە هۆی ئەوەی کە باوکان دەسەڵاتدار و دیاریکەری چارەنووسی کچەکانیان بن، لەوانەبوو ژولی بتوانێ عەشق هەڵبژێرێ و لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆی زەماوەندبکا. واتە؛ کورد گوتەنی: "بەتیرێک دوو نیشانە بنگێوێ"و هەم عەشقەکەی هەبێ و هەم زەماوەندکردنەکە. بەڵام دەسەڵاتی باوک و پرەنسیپەکانی سیستەمی ملکایەتی بووە هۆی ئەوەی کە؛ ئەو پاش ئەو هەمووە عەشق و خۆشەویستییە مەرگی بەلاوە لە ژیان باشتر بێ. رۆسۆ گومانی لە چارەنووسی ئەمجۆرە دڵدارانە دا هەبوو "واتە بۆ خۆشەویستەکەی شێت و شەیدا ببوو"، چونکی ئەگەر



بمانهەوێ شێوەی تێڕوانینی ئەو بخەینە بەر ئەزموون و تاقیکاری، جیا لە شکست و بێ هیوایی بە هیچ دەرەنجامێک ناگەین. بەواتایەکی سادەتر، ژولی سەرشێتانە حەزی لە خۆشەویستەکەی واتە ساین پریڤ بوو، کەچی ناچار بوو شووبە کابرایەکی دیکە بکا. رۆسۆ بۆ وێناکردنی ژنێکی ئایدیال کە بتوانێ یەکسەر هەست و حەزەکانی خۆی بکا بە فیدای داوێن پاکی و ئەرکی کۆمەڵایەتی؛ چارە نووسی ژولیی بە جۆرێک دیاری کرد ئەو بەبێ عەشق و خۆشەویستی، بەنابەدڵی شوو بکا بە پیاوێک کە بێ هەست و سارد و سڕە، هەر بۆ ئەوەی بتوانێ ژیانێکی هێمن و رێکوپێک بۆ مێرد و منداڵەکانی پێک بێنێ.

ئەگەرچی ئەمجۆرە ژیانە بە نرخی ئازار و ژانی هەمیشەیی ژولی پێک دێ بەڵام ئەو جیا لە قبووڵ کردن هیچ چارەیەکی نییە و ئەگەر بی هەوێ وەشوێن عەشق کەوێ دەبێ مەرگ هەڵبژێرێ. ژولی لە روانگەی رۆسۆوە؛ ژنێکی نموونە و داوێن پاک و فیداکارە، ئەو وەکو مەسیح؛ عەشق و سۆز و حەزی خۆی لەبەر بەجێ گەیاندنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و خێزانییەکانی؛ لە خاچ دان.

لەلایەکی دیکەوە؛ ژنە پاڵەوانەکەی تری رۆسۆ واتە سۆفی؛ ژنێکە کە توانیبووی دەستی بە پەروەردەی ئایدیال رابگا، بەڵام ئەو لەبەر ئەوەی کە پاش زەماوەندکردن تووشی کەڵکەڵە و وەسوەسەی خراپ و ناڕەوا (نامشروع) هات؛ بەسەر و ماڵەوە تێداچوو.

دیارە رۆسۆ لەم بارەیەشەوە کە هەوڵی دەدا سۆفی کە کچێکی ژیکەڵە و دڵرفێنی لە چەشنی فوچویس fuchois داوێن پاک و بەشەرم لەوێنەی ئانتیۆپک Antiopc وێنا بکا؛ لەم کارەشدا سەرنەکەوت و ئەم شکست و سەرنەکەوتنەشی هەر لە چەشنی هەمان شکست بوو کە لە دروستکردنی هاوولاتیی مەدەنی لە مرۆڤێکی سەرەتاییدا تووشی هات.

بەهەر حاڵ؛ ژنی ئایدیال لە سیستەمی هزریی رۆسۆدا ژنێکە، کە دەبێ بۆ خەڵک لەبەر دڵان و سەرنجراکێش بێ. ئەم ژنە بۆ پشتڕاستکردنەوەی رەوشت پاکی و گران و سەنگینی خۆی پێویستیی بە بیروڕای پیاوانە و بۆ سەلماندن و رەچاوکردنی مۆراڵەکان؛ پەیڕەوی بیروڕای گشتییە. ژن لە هەر هەلومەرجێکدابێ پێویستە زاڵ بێ بەسەر کەفوکوڵی سێکسیی خۆیدا بۆ ئەوەی سیستەم و

تەکووزی تاکژنی کۆمەڵایەتی بپارێزرێ و نەکەوێتە مەترسییەوە. دەبێ ئەوە لە بەرچاو بگیردرێ کە لە کاتێکەوە کە عەشق هەرێمی ژنان[٦١] و داوێن پاکی تاقانە ئامرازی دەسەڵاتی ئەوان بێ؛ دەبێ چاوەڕوانیی ئەوە بکەن کە پیاوان لە ئالۆز نواندن و لێڵ پێشاندانی ئەم خەسڵەتانەدا زێدەڕۆیی بکەن. ئەم زێدەڕۆییە؛ چ بەپێی لەگۆڕێدا بوونی ژیانێکی هێمنانە بێ کە بەرهەمی زەماوەندکردنە چ ئەوەی کە؛ بە پێی ئۆتۆریتەی بنەماڵەیی و هەستی نیشتیمانپەروەریی مرۆیی بێ؛ فەرق ناکا. زۆربەی ڕێبەران یا تیۆری داڕێژانی کۆمەڵگا ئایدیال و یۆتۆپیاخوازەکان؛ ئیدانەی ڕۆسۆ دەکەن لەبەر ئەوەی دەڵێن باوەڕی بە پەیوەندیی عاشقانەی دوولایەنەو نهێنی بووە و بیروباوەڕەکانی ڕۆسۆ بە هەڕەشەیەک دەزانن بۆ سەر کۆمەڵگا.

بە پێی مۆتالاکانی لێویزکۆزەر لە بواری کۆمەڵناسی دا؛ سێکس کردن و پەیوەندیی عاشقانە بەنهێنی بەلای کۆمەڵگا بچووک و تێکچڕژاوەکان و تاقمە جۆراو جۆرەکانی کلێسا و هەروەها بەلشەویکەکان و تاقمە یۆتۆپیاخوازە ئەمریکییەکانەوە؛ شتێکی خراپە و بە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆی بۆ سەر خۆیان دەزانن. ئەم گروپ و تاقمانە پێیان وایە کە پەیوەندییە عاشقانە نهێنییەکان؛ ناهێڵێن؛ تاکەکان؛ تواناکانیان لە پێناو گەیشتن بە ئامانجە گشتی و پلانە هاوبەشەکاندا، بخەنەگەڕ. بەو پێیە ئەوان ئەندام و لایەنگرەکانیان بەرەو دوو ئینتما و گرۆیی سێکسی ڕادەکێشن، واتە بەشێک لەم تاقم و گرووپانە داوا لە ئەندامانی خۆیان دەکەن کە ژیانی ڕەبەنی و بەدوور لە پەیوەندیی سێکس هەڵبژێرن و تامردن بە سەڵتی و ڕەبەنی بژیین، تاقمێکی دیکەی وەک بەلشەویکەکانی جارانیش؛ داوا لە ئەندامانی خۆیان دەکەن عەشقی ئازادانەیان هەبێ و کات و ساتەکانی خۆیان بۆ کەسێکی تایبەت یا بنەماڵە تەرخان نەکەن و بەفیڕۆی نەدەن. بەواتایەکی دیکە و بەپێی وتەی کۆزەر؛ "ئەم شێوەیە وەک جۆرە ئەرکێکی یەکسانی کۆمەڵایەتیی تاکەکان لەبەرامبەر ئەرکە سێکسییەکانیاندا" لەقەڵەم دەدرێ[٦٢] کۆزەر بۆ پشتڕاستکردنەوەی وتەکانی خۆی؛ سەرژمێرییەک لە نێو بیستویەک کۆمەڵگا و تاقم و گرووپە سەرنەکەوتووەکان دەخاتەڕوو کە لە نێویاندا؛ یا داوای پەیوەندیی سێکسی ئازاد



(بێ سنوور) یا ژیانی تەواو سەڵت و ڕەبەنی لە لایەنگران کراوە.[٦٣] بە واتایەکی دیکە؛ ئەو کۆمەڵگا بچووکە ئەمریکییانەی خوازیاری یۆتۆپیابوون یا تاقمەکانی کلێسا و گرووپە سیاسییەکانی وەکو بەلشەویکەکان کە دەیانویست لایەنگرەکانیان تەواو گوێڕایەڵیان بن؛ داوایان لێدەکردن بیر لە زەماوەندکردن و ماڵ پێکەوەنان نەکەنەوە؛ چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی بە فیڕۆ چوونی تواناکانی مرۆڤ و خەریک بوون بە کاری تایبەت بە خۆیەوە و ئەوەش ناتەبایە لەگەڵ ئامانج و بەرژەوەندییە گشتییەکان.

لەبەرامبەر بیروبۆچوونی بەلشەویکییەکاندا کە باوەڕیان بە پەیوەندیی ئازادی سێکسی هەبوو، کلێسای کاسولیکی داوای لەلایەنگرەکانی دەکرد بە سەڵت و ڕەبەنی بژین و ژیانی خۆیان بۆ خودا تەرخان بکەن. ڕوانگەی ڕۆسۆ لەم نێوەدا لە خستنە ڕووی وێنەی بنەماڵەی ئۆلمار، نموونەیەکە لە هەردوو شێوە ئاکاری جنسی واتە هەم ڕەفتاری دڵخوازی بەلشەویکییەکان و هەم کلێسا.

ئەو لە هیلۆییزی نوێدا بۆ پشت ڕاستکردنەوەی بۆچوونی بەلشەویکییەکان دەڵێ: "دەبێ ئاغاکان ئەوە بزانن کە پەیوەندیی نهێنی نێوان نۆکەر و قەرەواشەکان، جیا لە فەساد هیچی دیکەی بۆ ئەوان لێ شین نابێتەوە. وا باشترە ئەوان بە ئازادی پەیوەندیی عاشقانە و سێکسییان پێکەوە هەبێ[٦٤]. هەروەها ئەو لەمەڕ لێکترازانی بنەماڵەی دەوڵەمەند و ئاغاوتانەوە دەڵێ: "مالۆێرانی دەگەڕێتەوە بۆ عیشقبازی و ڕابواردنی نهێنیانەی کاردار و قەرەواشەکانتان لەکاتی بەڕێوەبردنی کارەکانیادا. هەر بۆیەش؛ بە مەبەستی پاراستنی نامووس و داوێن پاکیی قەرەواشەکان و هەروەها بۆ دڵنیایی لەوەی کە هەردووک ڕەگەزەکە بێ تێکچوون و شێوانی حەزە سێکسییەکانیان؛ ئەرکەکانی خۆیان بەڕێوەدەبەن واباشترە لێکدیان هەڵاوێرن". دیارە ئەم وریایی دانەی ڕۆسۆ لە ئاستی بیاڤی تایبەتی دابووە. سەرمەشق و نموونەی ئەو لە ئاستی گشتیدا هۆڵی ژێنێڤییەکانە کە لەڕاستیدا بەڕای ئەو؛ وەکو لەمپەرێک وایە لەبەردەم خەسار و زیانەکانی کۆمەڵگایەکی گەورەتر و دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی ئەندامانی ئەم کۆمەڵگایە واتە پیاوەکان لە شێوان و ئالۆزبوونی ئاکاری سێکسیی و خۆش ڕابواردنێدا. لێرەدا وتەیەکی گرینگ و و شاراوە لە سەر ئەم تاقم و گرووپانە هەیە کە پێویستە

ئاماژەی پێ بکرێ. کۆمەڵگا بچووکەکان ئەو تاقم و گرووپە چاوبرسییانەی کۆزەر باسی لێ کردوون نەک هەر دژی پەیوەندیی و کردەی سێکسی بە شێوەی نهێنی بوون بەڵکو لیبڕاوانە و بەڕاشکاوی دژی زەماوەند کردن و پێکهێنانی خێزان بوون. بۆ وێنە قەشە کاسولیکییەکان، بەلشەویکەکان و ئەمریکاییە باوەڕمەندەکان بە یۆتۆپیا، کە زیاتر میتۆدی هزریی و باوەڕیی خۆیان لە کەڵە فەیلەسووفان و داڕێژەران و دامەزرێنەرانی یۆتۆپیا وەرگرتووە، دژایەتیی دەزگای بنەماڵەیان دەکرد. ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماریدا، تومازۆ کۆمپانێلا* لە کتێبی شاری خۆردا و فوریر لە پرۆژەی فلانشتاریز دا، گریمانە فەلسەفییەکانی خۆیان لەسەر بنەمای پەیوەندیی نهێنی سێکس داڕشتووە.[٦٥] ئاکار و هەڵسوکەوتی رۆسۆ لەم نێوەدا لە سەر دەزگای خێزانی و حکوومەتی کۆماری و کۆمەڵگا، زۆر جێی سەرنجە. ئەو لەسەر ئەو باوەڕیە کە دەبێ دەزگای بنەماڵە، کە کۆڵەکەی کۆمەڵگایە بپارێزرێ و هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو جیاوازبێ لەوانەی گەڵاڵەی کۆمەڵگای یۆتۆپیاییان دادەڕشت. رۆسۆ وێڕای جیابوونی دەزگای سروشتی خێزان و گرێبەندە سیاسی- کۆمەڵایەتییەکان؛ بەردەوام دەگەڵ ئایدیالێک رووبەڕووبوو کە ئەویش وێناکردنی کۆمارێکی بچووک بوو لە نێو زۆربەی بنەماڵە گەورەکاندا. ئەو لە مەڕ ئەم شتەوە بۆ دالامبێری نووسیی: "کۆڕی هەڵپەرکێی گشتیی بۆ هێمنی و پاراستنی کۆماری؛ کە لە راستیدا کۆی گەورە ماڵێکە زۆر بە قازانجە.[٦٦] هەروەها ئەو بۆ پۆلسی باس دەکا کە دەبێ کۆمار ئەوەندە بچووک بێ کە بتوانێ لە ڕێگەی هاوڕێ و ئاواڵی خۆیانەوە چاودێری بکا بەسەر هەڵسوکەوتی هاووڵاتییاندا دیارە ئەم تێڕوانینە زیاتر لە لە ڕوانگەیەکی خێزانی دەچێ هەتا روانگەیەکی سیاسیانە.[٦٧] رۆسۆ ئەو کاتەی لەسەر ئابووریی سیاسی دەدوێ، باس لە حکوومەتێک دەکا کە وەکو دایکێکی خۆشەویست هاووڵاتییەکانی خۆی وەک منداڵی خۆی پەروەردە دەکا بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببنە باب و برا و پشت و پەنای نیشتمان.[٦٨] بەواتایەکی دیکە؛ کۆماری ئایدیالی رۆسۆ، کۆمارێکی بچووکە؛ کە لە گەورە ماڵێک پێکهاتووە؛ گەورە ماڵێک کە پەیوەندیی و گرۆییەکی

* Tommazo kompanella فەیلەسووف و شاعیری ئیتاڵیی سەرهەدەمی ڕێناس.



چرووپرپیان پێکەوە هەیە. ئاشکرایە ئەم جۆرە کۆمارییە زۆر جیاوازە لە کۆمەڵگایەکی کە لە کۆمەڵێک مرۆڤ بەبیروڕای جیاوازەوە پێکهاتووە. روانگەی رۆسۆ لێرەشدا هەر وەکو بۆچوونەکانی لەسەر پەروەردەکردنی مرۆڤ وەک هاووڵاتییەکی شارستانی و لە هەمانکاتدا سروشتی؛ روانگەیەکی مەحاڵە و دەست نادا.

هەروەها رۆسۆ لەمەڕ تیۆریی یۆتۆپیاکەی و ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییانەی بە چاودیتبوونی هەر ئەو باس و لێدوانانە دێنێتەوە گۆڕێ کە تیۆرداڕێژانی ئەم بوارە لە مەڕ ئەرک و کەفوکوڵە ورووژێنەرەکانی ئەندامانی بەئەمەگی یۆتۆپیا خستوویانەتە بەرباس و دەڵێ: "لایەنگرانی کۆمەڵگای بچووک وتێکچنراو پێکەوە یەکدەنگ و یەکگرتوون و لە بەرامبەر کۆمەڵگای گەورەتر دا؛ هەست بەنامۆیی دەکەن. ئەوان وەک نیشتیمانپەروەران؛ دژی بیانی و دوژمنان رادەپەڕن و رادەوەستن چونکە لە ژیاندا هیچ شتێک گرینگتر و بە بایەخ تر نییە لەو کەسانەی کە دەگەڵیان دەژین".[٦٩] رۆسۆ ئاماژە بەم واقعیەتە دەکا کە: هەروەکی ئاستی وەفاداری و ئەمەگداریی هاووڵاتی بەنیشتمانەکەی دادەبەزێ هەر بەو جۆرە ئەمەگداریێتی ئەندامێک لەهەمبەر گرووپەکەی خۆیدا لاواز دەبێ و تووشی کەموکوڕیی دێ. بەڵام ئەوەش لەبەرچاو بگیردرێ کە لاوازبوون و دابەزینی ساتی ئەمەگداریی خەڵک بە کۆمەڵگا گەورەکان زیانی پتری لێدەکەوێتەوە لە چاو کۆمەڵگا بچووکەکان؛ "چونکی کەسێک بەتەنیا، دەکرێ قەشەیەکی ئیماندار، سەربازێکی دلێر یا هونەرمەندێکی بەزەوق و سەلیقەبێ بەو حاڵەشەوە بۆ نیشتیمانەکەی هاووڵاتییەکی خراپ و ناجسن بێ."[٧٠]

رۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵگایەتیدا دەنووسێ: بۆ پشتگرتن لە زاڵبوونی قازانج و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان بەسەر بەرژەوەندیی گشتیدا، دەبێ هاووڵاتیگەلیکی راستەقینە هەبن کە باوەڕیان بە بنەما ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا هەبێ".[٧١]

چونکە کاتێک لە کۆمەڵگادا هەست بەگرینگیدان بە پاراستنی بەرژەوەندییەتایبەتییەکان و پشتگوێ خرانی بەرژەوەندییە گشتییەکان، بکرێ. ئیتر لەوەها دۆخێکدا یەکدەنگیی کۆمەڵگا لەنێو دەچێ و ویست و ورەی

گشتی بۆ ئاستی تاک دادەبەزێ. دەگەڵ گەشەکردنی بەرژەوەندیی گشتی و تایبەتی شان بەشانی یەکتر، هەر کامەی هەوڵ دەدا بە بەرژەوەندییەکانی خۆی رابگا و دیارە لەوەها دۆخێکدا؛ گرینگی نادرێ بە خۆش بژیوی و بەختەوەریی گشتی".[٧٢]

لێرەدا وێدەچێ دژوازیی بەرژەوەندییەکانی دەزگای خێزان، وەک گرووپێک کە چاوەڕوانییەکی زۆری لە ئەندامەکانی خۆی هەیە پێی وەفادارین، دیار و بەرچاون لەگەڵ بەژەوەندییەکانی کۆمەڵگای گەورەتر. لە روانگەی- فەلسەفیی رۆسۆدا، "بابەتی سەرەکی" دەزگای بنەماڵە؛ "پاراستنی سامانی باوک و لێ زیاد کردنێتی هەتا ئەوکاتەی کە بۆ پێشگرتن لە ئەگەری هەژار کەوتنەوەی خاوخێزان بەسەریاندا، دابەش بکرێ". هەتا ئەو کاتەی ملکایەتیی تایبەت و میرات بەلای رۆسۆوە وەک "مافی پیرۆزی هاووڵاتی" چاوی لێ بکرێ؛ بێ گومان بەرژەوەندییەکانی تاکی خێزان و پێگەی هەر کام لەوان دەکەوێتە دژە دیوی پێداویستییەکانی وڵات. بۆ وێنە دانانی ماڵیات و رێکوپێککردنی سامانی تایبەتی لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا هۆکارگەلێک کە دەبنە هۆی دروست بوونی لێکدژیی لە نێوان بنەماڵە و هەستی وەفاداری و نیشتیمانپەروەریدا. بە هەر حاڵ رۆسۆ؛ وێڕای گریمانەی لێکدژیی بەرژەوەندییەکان نکوڵی دەکا لە جیاوازیی ئاستی کەفوکوڵی نیشتیمانپەروەرانەی ئەندامانی کۆمەڵگا و ئاستی ئەمەگدارێتی ئەوان بەگرووپەکانیان، واتە (نکوڵی دەکا) لە لێکدژیی نێوان ویستەکانی کۆمەڵگای گەورەتر و بنەماڵە یا گرووپ.[٧٣]

لێرەدا بۆ ناسینی لێکدژیی بەرژەوەندییەکانی دوو دەزگای ئایدیالی رۆسۆ، واتە دەزگای کۆماری دیموکراتیک و دەزگای بنەماڵەی باوک مەزن ئاماژە بە دوو خاڵی گرینگ دەکەین: یەکەم ئەوەی کە رۆسۆ هەستی فیداکاری و نیشتیماپەرستیی سپارتەکان و رۆمانییەکان بە نموونە دێنێتەوە. بەڕای ئەو ئەوان هاووڵاتی گەلێک بوون کە لە لایەکەوە؛ لەژێر سێبەری کەفوکوڵی بنەماڵەدا و لە لایەکی دیکەوە بە دەروەستی و هەستی وەفاداری بە وڵاتەکەیانەوە بەسترابوونەوە. ئەوان لە کاتی گیان بەختکردن و یارمەتی کردندا بەدڵنیاییەوە؛ گیان بەختکردنیان لە پێناو بەرژەوەندیی وڵاتەکیاندا هەڵدەبژارد. بۆ وێنە ئەو



دایکە سپارتییەیەی لە ناخی خۆیدا دڵ بەخەم و خەمناکە بۆ مەرگی منداڵەکانی کە لە پێناو نیشتیماندا کوژراون بێگومان باوەڕی وایە کە ئەو بەر لەوەی دایکێک بێ بۆ منداڵەکانی، هاووڵاتییەکە و بەو پێیە مەرگی منداڵەکانی مایەی شانازیی ئەوە. ئەو دوو هاووڵاتییە واتە ئەو پیاوانەی لە رێگەی نیشتیماندا دەکوژران و ئەو دایکەی کە بەڕێز و حورمەتەوە لە مەرگی کوڕەکانی لەم پێناوەدا؛ دەڕوانێ؛ نموونەگەلێکن بۆ رۆسۆ کە بەمجۆرە نیشان بدا وێڕای لێکدژیی بەرژەوەندی و ئەمەگداری لەم دوو دەزگایەدا، هەمیشە هەستی نیشتیمانپەروەری زاڵە بەسەر ویستی بنەماڵەدا. دووهەم ئەوەی کە رۆسۆ بەو مەبەستە خێزان وەک دەزگایەکی جێی متمانە پەروەردە دەکا، کە ئەندامەکانی بتوانن هاووڵاتیگەلێکی باش و فیداکار بۆ کۆماربن و بەو مەبەستە؛ ئەو بەکۆمەڵایەتی کردنی منداڵان "بەیەکێک لە یاسا بنچینەیی و رەواکانی حکوومەتی کۆماری"[٧٤] لە قەڵەم دەدا. بەواتایەکی دیکە بەکۆمەڵایەتی کردنی منداڵان بەو مانایە یە کە ئەوان هەر لە سەرەتایی منداڵییەوە پەروەردە بکرێن و فێری ئەوە بکرێن کە فیززلی و بەرزەدەماخی؛ هەڕەشەیەکی جیدییە لە بەرامبەر ویست و بەرژەوەندییە گشتییەکاندا. بەو پێیە رۆسۆ لەسەر ئەو باوەڕیە کە پەروەردە و راهێنانی منداڵان نابێ بخرێتە ئەستۆی پیاوان. چونکی ئاکام و بەرهەمی ئەو پەروەردەی کە لە ئەستۆی باوکانە دەکەوێتە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەوان و دەگەڵ بەرژەوەندیی گشتی و کۆماری یەکناگرێتەوە. رۆسۆ لە وتارێک لەسەر ئابووری سیاسیدا سەبارەت بەوە دەڵێ: "باوک دەمرێ و کەم واهەیە تامی میوەیەک بچێژێ کە خۆی پێیگەیاندووە، بەڵام نیشتمان هەر دەمێنێ و لە راستیدا پەروەردەکردنی هاووڵاتییان ژیانی کۆمەڵگایە"[٧٥]. بەرهەر حاڵ گەورەترین بەڵگە و هۆیەک کە لە نووسراوەکانی رۆسۆدا هەیە، دەری دەخا کە ئەو لە سیستەمی کۆماریدا متمانەی بە باوکان نییە بۆ ئەوەی پەروەردەی منداڵەکانیان وەئەستۆ بگرن؛ چونکی ئەوان منداڵەکانی خۆیان بە جۆرێک پەروەردە دەکەن کە زۆر کوڕی باش بن، بەڵام هاووڵاتییەکی زۆرباش نەبن.[٧٦] رۆسۆ لەم بارەوە دەگەڵ یۆتۆپیا خوازان هاوڕایە چونکی ئەویش وەک رای وایە کە بنەماڵە وەک کۆمەڵگایەکی بچووک هەڕەشەیەکە بۆ سەر کۆماری و

کۆمەڵگای گەورەتر. پێویستە بگوترێ کە بەگشتی، گریمانەی رۆسۆ لەمەڕ پەیوەندیی نێوان بنەماڵە و دەوڵەت لێکدژ و پارادۆکسیکاڵە؛ چونکی ئەو لە نامەیەکدا بۆ دالامبێر دەنووسێ، رای وایە کە "بێ هیچ قسەیەک زەماوەندکردن، پیرۆزترین پەیوەندی و گرێدراویی کۆمەڵگایە و بەبێ دەزگای خێزان هیچ کۆمەڵگایەک خۆی پێ راناگیرێ و نامێنێ [٧٧] و "لە حکوومەتێکی کۆماریدا ناکرێ کاروباری زەماوەندکردن بە پیاوانی ئایینی بسپێرین".[٧٨] ئەوەی لە مەڕ پێگەی خێزان لە کۆمەڵگەدا دەیخاتەڕوو، لە درامای یۆنانیی ئۆدیپۆس Oedipuse و دەقە شانۆییەکانی دیکەدا هاتووە. بابەت و ناوەڕۆکی ئەم شانۆنامانە زیاتر باسکردن بووە لە سێکس لەگەڵ (محارم) و کوشتنی گەورەی ماڵێ: کە ئەو شتانە ئاراستەی مێشک و زەینی بینەرانیان بەرەو تاوانە کۆمەڵایەتییەکان دەبرد. کۆمیدییەکانی مولێریش لەو دەقە شانۆییانەن کە بە شێوەی فڕهاوێژی و تەوسوتەشەر باسیان لە پەیوەیندییە پیرۆزەکان کردووە و بە گاڵتەکردن بە مافی باوکان بەسەر منداڵەکانیانەوە و مافی مێرد بەسەر ژنەوە؛ بەها کۆمەڵایەتییەکانیان لەرزۆک کردووە.[٧٩] رۆسۆ لە کتێبی یەکەمی ئێمیلدا، بەبێ پێچ و پەنا دەڵێ: خێزان بەشی بنچینەیی کۆمەڵگا و پارێزەری سیستەم و تەکووزیی کۆمەڵگایە، چونکی ئەوە دایکانن کە لە داوێنی خۆیاندا پیاوان پەروەردە دەکەن و دەیان عاملێنن بۆ راپەڕاندنی ئەرکە سەرەکییەکانیان و بەمجۆرە دەبنە هۆی دروستبوون و پێکهاتنی مۆراڵ و کەفوکۆلی سروشتی لە دڵیاندا و ئاوا گیانێکی نوێ وەبەر وڵات دەنێن و یەکیەتی و یەکگرتوویی لە پەیکەرەی کۆمەڵگادا دەردەکەوێ.[٨٠] رۆسۆ هەروەها هۆکاری رەوشت خراپی دەگەڕێنێتەوە بۆ لایەنە دڵڕفێنەکانی ژیانی رۆژانە و لەم پەیوەندییەدا رۆڵی دایکان زۆر بەگرینگ دەزانێ؛ چونکی لە روانگەی رۆسۆوە ئەوە دایکانن کە بە لە خۆبوردوویی و فیداکاریی خۆیان بە نیسبەت لایەنەجوان و دڵڕفێنەکانی ژیانی ئاسایی، کوڕەکانیان «کە باوک و مێردی داهاتوون» پەروەردەدەکەن و کۆمەڵگاش قەرزارباری ئەم پەروەردە و راهێنانەی ژنانە. بۆ پیاوێک کە سەرپەرشتیار و بەخێوکەری بنەماڵەیە، لە راستیدا یەکێک لەوسێ ئەرکە رادەپەڕێنێ کە پێی سپێردراوە، لەبەر ئەوەی کە؛ ئەرکەکانی دیکەی ئەو یەکێکیان



ئەرکی شاریڤانی و خزمەت بە کۆمەڵگایە و ئەوی دیکەش هاووڵاتییەکە؛ کە دەبێ لە خزمەتی حکوومەت و دەسەڵات دابێ.[٨١] ئەگەر ئەو بۆچوونانەی رۆسۆمان قبووڵ بێ؛ ساین پریڤ لە لایەکەوە کەسێکە کە ئەرکی سەرەکیی پیاوێکی بە تەواوەتی لە کۆمەڵگادا راپەڕاندووە و لە لایەکی دیکەوە ئەوە بنەماڵەی ئۆلمارە کە بە پەروەردە و راهێنانی منداڵی شاز و ئەسپاردنیان بە کۆمەڵگا؛ ناویان دەکەوێتە سەر زارو زمانان.

هەروەکی دەبینین گرۆیی و ئینتما هزرییەکانی رۆسۆ زۆر لێکدژو پێک ناکۆکن؛ تا ئەو جێگەی کە یەکێکیان راشکاوانە دژەدیوی ئەوی دیکەیە. ئەو پێداگرە لەسەر ئەوەی کە بە پەروەردەکردن و راهێنانی منداڵان؛ مرۆڤێکی وەک مرۆڤی سروشتیی سەرەتایی و هاوکات هاووڵاتییەکی مەدەنی دروست بکا و دیارە لەوکارەدا هیچ سەرکەوتنێکی نەبووە. رۆسۆ لە بەشی پێنجەمی کتێبی ئێمیلدا، لە وەڵامی ئەم دۆکترینەی ئەفلاتووندا کە باوەڕی بە لەناوچوونی دەزگای خێزانە دەڵێ: هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی خێزان، بە واتای لە ناوبردنی ناسکترین هەستەوەرییە سروشتییەکان و هێنانە ئارای کەفوکوڵ و هەستی دەستکردە، بنەماڵە لە گرێبەند و پەیمانە کۆمەڵایەتییەکاندا بەستراوەیی سروشتی بۆ تاک دروست دەکا و دەبێتە هۆی ئەوەی ئەندامانی کۆمەڵگا یەکتریان خۆش بوێ و بەو شێوەیە ئەوان بتوانن ئەرکی خۆیان لە بەرامبەر وڵاتەکەیاندا بەڕێوەبەرن. ئەوە بنەماڵەیەکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دڵی تاکەکان بەلای گرووپێکی گەورەترەوەبێ کە کۆمەڵگای ناوە. ئەگەر هاووڵاتییەکی باش بە کۆمەڵگا بسپێردرێ؛ ئەم هاووڵاتییە لە پێشدا دەبێ لە بنەماڵەدا، کوڕ یا مێردێکی باش بووبێ.[٨٢]

لەم وتەیەدا هیچ لێکدژی و ناتەباییەک لە نێوان بەرژەوەندییەکانی خێزان و دەوڵەتی کۆماریدا بەدی ناکرێ و باسوخواسی پەروەردەی گشتیی خەڵکیش تەواو پشتگوێ خراوە.

زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە رۆسۆ هاتۆتە سەر ئەوەی کە سروشتی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردادێ و لە شێوەی سروشتی و سەرەتایی خۆیەوە دەێتە سەر شێوەی مەدەنی و کاملتر دەبێ. هەروەها کەفوکوڵ و ئیحساساتی

سروشتی دەبێتە یارمەتیدەری پێکهاتن و گەشەکردنی کەفوکوڵە سروشتییەکان لە پێناو نیشتیماندا. تاکێکی مرۆڤ کە لە ژینگەیەکی داخراو و کەشێکی بەرتەسک داو هەروەها دەگەڵ تاقمێکی کەم گەورەبووبێ و خۆشەویستییەکەشی لەو سنوورە نەترازابێ، لەوانەیە بەلایەوە دژوار و ئەستەم بێ ئەو کەسانەشی خۆش بوێ کە نایانناسێ.

ئەگەر ئەندامانی سەرەکیی بنەماڵەیەک کە بێگومان پیاون، بۆ هاووڵاتیی بوون لە کۆماری ئایدیالی رۆسۆدا تووشی کۆسپ و گرفت بن؛ ئیدی دەبێ بڵێین رەوشی ژنان کە لە کۆمەڵگادا هەمیشە پاشکۆ و ژێر چەپۆکەن؛ گەلێک دژوارتر و نالەبارترە. چونکی نابێ ئەوەمان لە بیربچێ کە بەڕای رۆسۆ کەشی بەرتەسکی نێومالێ بۆ ژنان گەلێک لەبار و باشە و دیارە لەو هەلومەرجەدا ئەوان لە بەشداری کردن لە کۆڕوکۆبوونەوەکاندا بێبەش و لە مافی ژیان بێبەرین. بەو پێیە کارێکی لۆژیکی نییە چاوەڕوانیمان لە ژنان هەبێ کە بەڕای رۆسۆ سەرچاوەی دەسەڵاتەکەیان پیاوە؛ بتوانن ببنە هاووڵاتییەکی راستەقینە. بۆ وێنە هیچ ژنێک وەک سۆفی و ژولی کە رۆسۆ لە تیۆرییە پەروەردەییەکەیدا وێنای کردوون؛ ناتوانێ وەکو دایکانی رۆمانیایی یا ژنانی سپارتی لە کۆمەڵگادا بجووڵێنەوە و بژین. لە بەر ئەوەی کە ئەوان نەک هەر هیچ دەسەڵاتێکیان بە سەر چارەنووسی خۆیاندا نییە؛ تەنانەت مافی ئەوەشیان نییە شوێندانەربن لەسەر منداڵەکانیان کە بەڕای رۆسۆ ئەوانیش سەر بە باوکانن.

لە سیستەمی فەلسەفی- سیاسی رۆسۆدا؛ ئافرەت زۆر خەسار هەڵگرترو ناسکتر لە پیاو خراوەتەڕوو. چونکی رۆسۆ باوەڕی وایەکە: "ئەو کەسانە خراپن کە دوورەپەرێزی دەکەن و خۆیان لە کۆمەڵگا تەریک دەکەنەوە، بەڵام ئەو کەسانەی عەشق و خۆشەویستیی خۆیان بەش دەکەن بەسەر ئەوانی دیکەدا، ئەوانە مرۆڤگەلێکی چاک و باشن.[٨٣] ئێستا بەم وتارە دەبێ رەوشی کۆمەلایەتیی ژنان زۆر روون و دیاربێ لەبەر ئەوەی کە جێگەی شیاو و لە باری ئەوان؛ قەتیسمانەوە لە چوارچێوەی بەرتەسکی ماڵدایە. لێرەدا جوان دەردەکەوێ ئەو رێگەچارەیەی رۆسۆ بۆ ژنانی دیاریکردوون لەگەڵ یاسا و بەهاو پرەنسیپەکانی ئەو، واتە ئازادی و یەکسانی یەکناگرنەوە و زۆریش



لێکدژن. ئافرەتگەلێکی وەکو سۆفی و ژولی کە بە پاڵەوانەکانی رۆسۆ ناسراون، نەک هەر بوونەتە تێکدەر و کاولکەری چارەنووسی خۆیان بەڵکو بوونە هۆی لەزۆرک بوونی دوو دەزگای ئایدیالیی رۆسۆ واتە بنەماڵە و کۆمارە بچووکە دیموکراتیکەکەی.

کۆتایی چیرۆکی بەسەرهاتی ئێمیل وانیشان دەدا کە رۆسۆ نەک هەر لە خستنەرووی تیۆریی پیاوی سەربەخۆو ئایدیالدا، وەک مێرد، هاووڵاتی و باوک؛ سەرکەوت و لە پێناوەدا هەوڵێکی بێ سەرمەریدا، بەڵکو سۆفی و ژولیش کە پاڵەوانی چیرۆکەکەی بوون؛ تووشی چارەنووسێکی دڵتەزێن تر و تاڵتر لە چارەنووسی ئێمیل و ساین پرێڤ هاتن. فەلسەفەی سیاسیی رۆسۆ لە پەیوەندیی لەگەڵ ژناندا فەلسەفەیەکی گەشبین نییە و ئەگەر پیاوان لە چوارچێوەی دەزگای هزریی ئەودا، دەتوانن ببنە خاوەنی کەسایەتییەکی سەربەخۆ و هاووڵاتییەکی کۆمەڵگاو خاوەنی مافی سیاسیی کۆمەلایەتی، ژنان بەهیچ جۆرێک خاوەنی وەها مافگەلێک نین.

## بەشی نۆیەم:

# جۆن ستوارت میل فمینیستی ئازادیخواز

تەنیا لە رابردوودا نەبووە کە مرۆڤ لە ماف و پێداویستییە گشتییەکان بێبەش بووە و ئەم بێبەشییە تەنیا بۆ رابردوو ناگەڕێتەوە. هەروەکی دیتمان جان جاک رۆسۆ سەرەتا بەشی هەرەزۆری بنەما و پرەنسیپە سەرەتاییەکانی خۆی لە مەڕ ئازادی و مافی یەکسانی، بە شێوەیەکی چڕوپڕ و تێروتەسەل هێنایە گۆڕێ و دواتر ئافرەتانی لەم پرەنسیپ و یاسایانە هەڵئاوارد و بێبەریی کردن. جۆن ستورات میل وێڕای باوەڕ بە رەسەنایەتیی تاک و هزری ئازادیخوازانەی خۆی؛ یەکێکە لە گرینگترین فەیلەسووفانی سیاسیی لیبراڵ و ئازادیخواز، کە راشکاوانە باسی بنەماکانی ئازادی و یەکسانیی مافی ژنانی کردووە. بەر لەوەی بچینە سەر بیروڕای ستوارت میل لەمەڕ فمینییزم و یەکسانخوازیی مافی سیاسی- کۆمەڵایەتیی بۆ ژنان پێویستە کورتە ئاوڕێکی رۆشنگەرانە لە هێندێ روانگەی بیردارێژانی ئازادیخواز بدەینەوە لەمەڕ نیوەی کۆمەڵ واتە ژن. ئێمە لێرەدا ئاماژە بە تۆماس هۆبز، جۆن لۆک و جیمزمیل دەکەین. ئەگەرچی ئیمانۆیل کانت و فریدیش هیگلیش دەیانتوانی لەو باسەی ئێمەدا بەشێک لە مەبەستەکەمان بپێکن.

### تۆماس هۆبز

فەلسەفەی سیاسیی هۆبز لە سەر ئەم بنەمایە دارێژراوە کە تەواوی مرۆڤەکان بە شێوەی سروشتی خاوەنی مافی یەکسانن. بەڵام لە راستیدا ئەم مافی یەکسانییە بریتییە لە هێزی یەکسانی هەرکام لە تاکەکانی مرۆڤ بۆ لەناوبردن و کوشتنی ئەویتر. بەواتایەکی دیکە؛ هۆبز لە بەشی سێزدەهەمی کتێبی لیڤیاتان leviathan دا سەبارەت بە رەوشی سروشتیی



مرۆڤەکان دەنووسێ: "سروشتی مرۆڤەکان لە باری جەستەیی و فیکرییەوە وەک یەک ساز کراون. هەڵبەت لەوانەیە یەکێک لە جەستەدا تۆکمەتر و بەهێزتر و لە باری هزرییەوە هۆشیارتر لەوانی دیکە بێ. بەڵام کاتێک هەمووان دێنینە بەرچاو، جیاوازییەکی بەرچاویان تێدا بەدی ناکەین کە بەپێی ئەم جیاوازییە یەکێک بیهەوێ لایەنێکی پێ باشتر و بەهێزتر بێ و کەسێکی دیکە نەتوانێ وەها ئیدعایەکی هەبێ. چونکی لە بواری هێزی جەستەییەوە تەنانەت لاوازترین بێ هێزترین کەس ئەوەندەی هێز دەبەر دایە کە بتوانێ کەسێکی ئێجگار بە دەستوبردو ئازا- لە کاتێکدا ئەویش لە بەردەم وەها هەڕەشەیەک دابێ- بەپیلانێکی نهێنی یا بە هاودەستی دەگەڵ کەسانی تر بکوژێ[١] لەم پەویوەندییەدا هۆبز باوەڕی وایە کە ئافرەتانیش خاوەنی مافی یەکسانن (لەگەڵ پیاوان)[٢] ئەو لە دژی ئەو بۆچوونە کەپێیوایە پیاوان بە شێوەی سروشتی وەک "رەگەزی بەهێزتر" دەسەلاتداری منداڵەکانیانن و هەروەها ئەوەش کە مرۆڤەکان بۆ کوشتنی یەکتر خاوەنی هێزی وەک یەکن دەڵێ: "چونکی خودا بۆ زاوزێ کردن یارمەتیدەرێکی بۆ پیاوان دیاری کردووە؛ کەواتە دەبێ هەردووکیان دەسەڵاتێکی یەکسان و وەک یەکیان بەسەر منداڵەکانیاندا هەبێ و منداڵیش وەکیەک گوێڕایەڵی هەرکیان بن؛ بەڵام ئەوە شتێکی مەحاڵەو ناکرێ؛ چونکی کەس ناتوانێ گوێڕایەڵی دوو سەرپەرشتیار (ئاغا) بێ. ئەگەرچی کەسانێک بە مافی پیاوی دەزانن کە وەکو رەگەزی باشتر و بەهێزتر چاودێریی منداڵ بکا، بەڵام تەواو لە هەڵەدان، چونکی جیاوازیی لە تواناو ژیرێتیی ژن و پیاودا هەمیشە بەو ڕادەیە نییە کە بکرێ لە رێگەی ئەم جیاوازییەوە بێ هیچ کێشەیەک مافی دەسەڵات و چاودێریی بەسەر منداڵدا دیاری بکرێ."[٣]

هەروەها هۆبز ئەم راستییە بەڵگە نەویستە پشتڕاست دەکاتەوە کە "تا ئەو کاتەی منداڵ لە منداڵدانی دایکی دایە و لە دایک نەبووە" لە راستیدا دایک "سەرپەرشتیاری" سەرەکی و سروشتیی ئەوە[٤].

هۆبز سەبارەت بە دەوری زاڵی باوکان و دەسەڵاتدارێتیی ئەوان بە سەر خێزاندا کە لەلایەن حکوومەتەکانەوە پاساودەدرێ و پاکانەی بۆ دەکرێ

دەڵێ: حکوومەتەکان ئەو کاتەی لەسەر چاودێری و سەرپەرشتیاری کردنی منداڵ کێشەیەک دەکەوێتە نێوان دایک و باوکانەوە؛ بەپێی یاسا مەدەنییەکان کێشەکەیان بۆ چارەسەر دەکەن و زۆربەی جاران بڕیارەکە بە قازانجی باوکان تەواو دەبێ، لە بەر ئەوەی باوکان پێکهێنەری حکوومەتەکانن نەوەک دایکان.[٥] دیارە لە بەڵگەهێنانەوەدا هۆبز هێندێ کەموکورتیی هەیە؛ بۆ وێنە ئەگەر بەڕای هۆبز یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان شتێکی گرینگە؛ چۆناو چۆن تەنیا نیوەی ڕەگەزی مرۆڤ واتە پیاوان دەبنە خاوەنی ئەم پێگە و دەسەڵاتەی کە بتوانن دەوڵەت دامەزرێنن و یاساگەلێک بچەسپێنن کە بە هۆی ئەوانەوە بتوانن زاڵ بن بەسەر نیوەی دیکەی کۆمەڵدا واتە ژنان؟

بەواتایەکی دیکە ئەگەر ژنان مافی سروشتیی خۆیانە کە سەرپەرشتیاری منداڵەکانیان بن ئەدی بۆچی پیاوان "لەحاڵەتی سروشتیدا" باوک سالارن و یاساکان بە قازانجی ئەوان دادەنرێن؟

هۆبز لە کتێبی هاووڵاتی Deceiveو لێڤیاتاندا، پاش لێدوانێکی زۆر لەسەر ئەوەی کە بە شێوەی لۆژیکی دایک و باوک مافی خۆیانە سەرپەرشتیاری منداڵەکانین بن (چاودێریی بکەن) وەک دەزگایەکی تەواو باوک مەزن باس لە بنەماڵە دەکا و دەڵێ: "لە ڕاستیدا هەر بنەماڵەی پیاوێکی هەیە و منداڵەکانیشی دەگەڵ خزمەتکارەکانین و بەمجۆرە باوک ئاغایەکە؛ کە مافی ئۆتۆریتە و دەسەڵاتکردنی هەیە."[٦] دەبینین کە لەم وتارەدا پیاو لە ڕاستیدا مەزنە باوکێکە کە مافی چاودێری و دەسەڵاتکردنی پارێزراوە و هۆبز وەک یەکەی سەرەتایی کۆمەڵایەتی و سیاسی؛ باسی لێ کردووە. لە تیۆریی سیاسی هۆبزدا، بێ هیچ هۆیەکی "ڕەزامەندی دەر" و بێ هیچ شیکردنەوەیەک مافی دایک پشتگوێ دەخرێ و باسی لێناکرێ ئەگەرچی ئەو مافی دەسەڵاتی سەرەتایی و سەرەکیی بە سەرخۆی و منداڵەکانیدا هەیە. تەنیا جارێکی دیکە ئەویش ئەوکاتە هۆبز بە شێوەیەکی کورت لەسەر یاسا گشتییەکان دواوە هەمیسان باسی ئافرەتی کردۆتەوە. ئەو لەوێدا دەڵێ: بنەماڵەی باوک مەزن وەک دەزگایەکی سروشتی پێویستە هەبێ کە لەوێدا؛ "یاساکانی سروشت باوکیان کردۆتە گەورە و سەرپەرشتیاری تەواو



دەسەڵاتدار (ڕەها) بۆ خاو و خێزانەکەی."[٧] هۆبز بۆ هەڵدانی ئەو مەتەڵە زۆری هەوڵ داوە؛ هەوڵێک کە لەلایەکەوە دەسەڵاتی نایەکسان بەسەر بنەماڵەدا بە کردەیەکی ناسروشتیی نێوان ژن و پیاو لەقەڵەم بدا و ئەم کێشە و گرفتانە نەک بە ناخۆشی بەڵکو بە ڕەزامەندی چارەسەر بکا، لەلایەکی دیکەوە باوەڕی بەبنەماڵەی باوک مەزن هەبێ و مەزنایەتی و گەورەیی ڕەهای پیاو بەسەر ژن و منداڵەکەیدا بەمافێکی سروشتی بزانێ. ئەم دژوازییانە هێندێ گرفتی لە فەلسەفەی هۆبزدا هێناوەتە گۆڕێ. چونکی ئەو ئامادە نەبووە بە شێوەی واقعیی و لیبراوانە باس یەکسانیی ژن و پیاو بکا. ئەگەر کۆڵەکەی باوەڕەکانی ئەو لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتیی تاک دامەزرابایە؛ دەبوایە ئەو مافی تاکەکەسیی ژنێک دەگەڵ پیاوێک بە یەکسان لەقەڵەم بدا و هەروەکی پیاوە بێ هێزەکان لەگەڵ زۆردارەکان یەکسانن ژنانیش ئەگەر وایدانێین بێهێز و لاوازیش بن دەبوایە خاوەنی مافی یەکسان لەگەڵ پیاوان بوایەن. بەو جۆرە بۆچوونی هۆبز لەمەڕ پێویست بوونی دەسەڵاتی پیاوان زاڵبوونیان بەسەر بنەماڵە و کۆمەڵگادا بووە هۆی ئەوەی کە ئەو نەتوانێ دەرەنجام و ئاکامی دڵخواز و لۆژیکی لە لێدوانەکانی خۆی وەرگرێ. لە ڕاستیدا دەکرێ بڵێین هەنگاوی مەترسیداری هۆبز لە سیستەمە سیاسییەکەیدا ئەوە بوو کە دانی بە مافی یەکسانیی مرۆڤەکاندا هێناو توانی سەرنجەکان بۆ لای بێ بەشیی ژنان لە مافە سیاسی- کۆمەڵایەتییەکانیان لە کۆمەڵگادا ڕابکێشێ.[٨] بەڵام باوەڕمەندی بە یەکسانیی مافی مرۆڤەکان کە هۆبز بانگەشەکاری بوو دژوازییەکی ڕوونی هەیە لەگەڵ باوەڕمەندیی بە دەسەڵاتدارێتیی پیاو لە بنەماڵەدا. ڕوون و ئاشکرایە ئەو یەکسانییەی نێوان مرۆڤەکان کە هۆبز وەک بنیاتنەری مافی سیاسیی تاکەکەس دەیویست بە شێوەی لۆژیکی پێی بگا دەگەڵ ئەو بیروڕایەی سەبارەت بە سروشتی بوونی بنەماڵەی باوک مەزن لە کۆمەڵگادا، یەکی نەدەگرتەوە و وەدیهاتنی ئەستەم بوو، گرفتی بنەڕەتیی فەلسەی سیاسیی هۆبز و هەروەها گریمانە ڕادیکاڵەکەی ئەو لە پەیوەندیی دەگەڵ مەسەلەی ژندا دەگەڕاوە بۆ ئەم بۆچوونە و لە هەناوی ئەو ڕوانینەدایە.

## جۆن لۆک

هاوشـێوەی ئـەم دۆخـە مـەتـەڵ ئاسـایەی هـۆبز لـە مـەڕ ژنانـەوە خستوویەتەڕوو لە فەلسەفەی سیاسیی جۆن لۆکیشدا بەدی دەکرێ. لۆک لە دژبەریی دەربڕینی خۆیدا لـەگـەڵ فیلمێر filmer لـەمـەڕ دەوڵـەتی باوک سارلارەوە دەڵێ: "دایک و باوک بەناوێکی وەکیەکەوە مافی دەسەلاتیان بەسەر منداڵەکانیانەوە هەیە"(٩) لۆک سەبارەت بە مەسەلەی باوک مەزنی و ئەوەی کە دایک و باوک مافی وەک یەکیان بەسەر منداڵەکانیانەوە هەیە- مافێکی کە فیلمێر تەنیا بە باوکانی ڕەوا دەبیینێ- زیاتر دەچێتە پێشێ و دەست دەکا بە تێکدانی کوڵەکەی دەسەلاتی ڕەهای پاشایەتی کە بنچینەی دۆکترینی باوک مەزنییە. جۆن لۆک لە ڕاستیدا بۆ نکوڵی کردن و وەلانانی شێوەی سیاسیی دەسەلاتی باوک؛ دەستەواژەی "ناوی یەکسان لەگەڵ دایک"*ی بەکارهێناوە. لۆک لە دوو نامیلکە [thtwo treatises دا دەڵێ: "ئەگەر باوکی خێزان بمرێ؛ منداڵان بە شێوەی سروشتی دەبێ گوێڕایەڵی دایکیان بن. "ئایا لێرەدا کەسێک هەیە بڵێ دایک خاوەنی دەسەلاتێکی ڕەوا نییە بۆ سەرپەرشتیاری کردنی منداڵەکانی؟" جا کاتێکی لۆک ئەم بابەتە دەباتەوە سەر دژبەری و دژایەتیی لەگەڵ دەسەلاتی ڕەهای حکوومەت، ئەوکاتەیە تێدەگەین ئەو خوازیاری مافی یەکسان و وەک یەکە بۆ ژن و مێردەکان."(١٠)

گشتاندنی لۆژیکیانەی ئەم بەڵگەهێناوەیە لەوانەیە وا بنوێنێ کە مافی سیاسیی ژنان لەلایەن "لۆک"ەوە بە فەرمی ناسراوەو دۆکترینی خێزانی باوک مەزن وەلانراوە. بەلام سەرەڕای ئەو شتانە و "ئەو یەکسانییەی دایک و باوکان کە لۆک بۆ خەبات دژی دەسەلات و ئۆتۆریتەی ڕەها لە هەرێمی سیاسیدا هێناویەتە گۆڕێ ئەم لە لاپەڕەکانی دیکەی کتێبی دوو نامیلکەدا لێبراوانە بەو دەرەنجامە دەگا کە پرەنسیپ و یاساگەلێک لە سروشتدا هەن کە گوێڕایەڵی و پەیڕەویی لە پیاوان بە هۆی ئەم یاسایانەوە دەکرێتە

* "عنوان برابر مادر"



شتێکی یاسایی و فەرمی. ئەگەرچی مافی سروشتیی تاکەکان دەبێتە هۆی ناڕەوا بوونی دەسەلاتی ڕەها لە هەرێمی سیاسیدا، بەلام دەسەلاتی ڕەها لە نێو بنەماڵەدا تەواو بەڕەوا زانراوە. هەتا ئەوەی کە لۆک دەڵێ: "لەوانەیە لەسەر خاوەنێتی و بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی نێوان ژن و پیاو؛ کێشەیەکیان بکەوێتە نێوان. لێرەدا ڕێسای سروشتی ئەوەیە کە کێشەکە بەقازانجی پیاو- وەک کەسێکی مەزنتر و دەسەلاتدارتر بشکێتەوە و ئەگەر شتێکیش لە گۆڕێ دایە وەبەر پیاو دەکەوێ و پیاو دەبێتە خاوەنی. بەمجۆرە کاتێک - ڕاگەیاندنی یەکسانیی مافەکانی ژن دەگەڵ باوەڕەکانی لۆک ناتەبایە یا لەگەڵ باوەڕەکانی سەردەمی ئەو یەکناگرێتەوە؛ ئەویش وەکو هۆبز دەگەڕێتەوە بۆ "سروشت" بۆ ئەوەی ڕەوایی بدا بە ژێردەستەیی ژنان و دەزگای خێزانیی باوک مەزن (کە لە ڕاستیدا سەرچاوەی بێبەشیی ژنانە لە مافە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانیان) لە جێگەی ئەو دادەنێ و ڕاشکاوانە دەڵێ: باوک هەر خۆی سەروەرو نوێنەری بەرژەوەندییەکانی بنەماڵەو هەروەها کۆمەڵگایە.

## جیمزمیل

جیمزمیل باوکی جۆن ستورات میل؛ لە بەرهەمەکەی خۆیدا واتە حکوومەت Gorernment کە لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتیی تاک نووسراوە؛ بە قەدرایی تۆماس هۆبز و جۆن لۆک بایەخی بەتاک دەدا. ئەوانە هەمووان باوەڕیان وابوو کە حکوومەت دەبێ ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری بۆ خەڵک دابین بکا کە کەمترین زیان و زەرەری بۆیان هەبێ. جیمزمیل حکوومەتی هەڵبژێردراو لەسەر ئەو بنەمایە هەڵدەسەنگێنێ کە مرۆڤەکان حەزیان لەوەیە دەسەلات بگرنە دەست و لەم ڕێگەیەوە بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بن کە بەپێی یاساکانی سروشت شتێکی حکوومەتییە. ئەگەر ئامانج و مەبەست لەم دەسەلاتدارێتییە، دابینکردنی ئەوپەڕی بەختەوەرییە، ئەوا، ئەوان بەبێ هیچ ئازارێکی ویژدان، لە پێناو دابینکردنی بەختەوەریی خۆیاندا پێشوازی لەم دەسەلاتە دەکەن.(١٢) جیمزمیل لە دەرەنجامی باسەکەیدا دێتە سەر ئەو

باوەڕە کە، نوێنەران لە حکوومەتی هەڵبژێردراودا، هێز و دەسەڵاتی خۆیان لە گۆمەڵگا وەردەگرن و قەرزاباری کۆمەڵگان؛ بەو جۆرە ناکرێ بەرژەوەندییەکانی ئەوان دژبەر و جیاوازبن لە بەرژەوەندیی خەڵک و کۆمەڵگا کە لەگەڵ بەرژەوەندیی دەسەڵاتداران یەکناگرێتەوە.[١٣]

جیمزمیل بەو شێوەیە باس لە ئاستەنگ و لایەنە پۆزێتیڤەکانی حکوومەتی هەڵبژێردراو دەکا: "شتێک کە تەواو روونە ئەوەیەکە تەواوی ئەوکەسانەی بەرژەوەندییان بە کەسانی دیکەوە گرێ دراوە، لە حکوومەتی هەڵبژێراودا لەوانەیە قازانجەکانیان نەمێنێ (لێیان زەوت بکرێ) بۆ وێنە بەرژەوەندیی منداڵان لە تەمەنێکی تایبەتدا بەستراوەتەوە بە بەرژەوەندییەکانی باوکیانەوە و هەر وەها قازانجەکانی ئافرەتان یا بۆ باوکیانە یا بۆ مێردەکانیان.[١٤] بەوپێیە بەو دەرەنجامە دەگەین کە پیاوان لەبەر قازانج و بەرژەوەندیی خۆیانە کە حکوومەتی هەڵبژێردراو دادەمەزرێنن. جیمزمیل لێرەدا باوەڕی خۆپەرستانەو بەرزەدەماخیانەی خۆی لە بیر دەچێتەوە کە پێی وابوو؛ حکوومەتی هەڵبژێردراو پێوەری ئەوپەڕی بەختەوەرییە بۆ خەڵک و " بەجۆرێک پێی باشە قازانج و بەرژەوەندییەکانی ژنان بۆ پیاوان بێ." دیارە ئەویش وەک هۆبز و لاک و. . . کە باوەڕیان بە رەسەنایەتیی تاک و لیبرالیزم هەیە لە ژێر هێژمونیی دۆکترینێک دان کە ناچارە رەوایی بدا بە بوونی بنەماڵەی باوک مەزن. ئاڵۆزی و لێڵیایەکی بنەڕەتی کە لە بیروڕای نەک هەر ئەم سێ فەیلەسووفە بەڵکو لە زۆربەی بیرمەندە لیبراڵە نەریتییەکاندا بەدی دەکرێ ئەوەیەکە: ئەوان لە بڕی ئەوەی بەپێی باوەڕی خۆیان وەک ئەندامی سیستەمێکی سیاسی باس لە رەسەنایەتیی تاک بکەن، لە راستیدا باسیان لەسەر مەزنێتی و سەروەریی رۆڵی پیاو لە بنەماڵەدا کردووە. بەواتایەکی دیکە لە جێگەیەک کە مەبەست بەرژەوەندییەکانی پیاوانە، لە هەرێمی سیاسیدا و ئەم بەرژەوەندییانە زۆریان دەگەڵ بەرژەوەندیی یەک بەیەکی ئەندامی بنەماڵەی باوک مەزن ناتەباو پێک ناکۆکن؛ ئیدی باسکردن لە سەروەریی پیاوان لە نێومالێ و داکۆکی کردن لە سیستەمێکی باوک سالار لەگەڵ رەسەنایەتیی



تاک و لیبرالیزم ناتەبان و یەکناگرنەوە. بۆ وێنە؛ بەرگرتن و بەرتەسک کردنەوەی ژنان لە پێناو گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسیدا، یەکێکە لەو شتانەی کە زۆر جاران دەگەڵ بەرژەوەندیی پیاوان یەکناگرنەوەو لە خۆڕایی نییە کە بەردەوام هەوڵ دەدرێ کە ژنان لە گۆڕەپانی سیاسەتدا یا تەواو لابچنیا ئەوەی کە دووربخرێنەوە.

## جۆن ستوارت میل

هەر وەکی لەم بەشەدا بۆمان دەردەکەوێ جۆن ستوارت میل، دەگەڵ بۆچوون و رێگەچارەی لیبرالیزمی کلاسیکدا نییە. ئەگەرچی میل بەڕادەی ئەفلاتوون یا هیگل؛ فەیلەسووفێکی (انتزاع)ی نییە. بەڵام بەو بیروڕا بەربڵاوەی خۆی کە زیاتر ئاوڕی لە بابەتە گرینگ و سەرنجڕاکێشەکانی ژیان داوەتەوە؛ کاریگەرییەکی شیاوو بەرچاوی بەسەر کۆمەڵگای سیاسییەوە هەبووە؛ چونکی فەلسەفەی سیاسیی ئەو بەگشتی پەیوەندیی بە باتگەلێکی پڕ بایەخی وەکو ئازادیی مافی تاکەکەس، دادپەروەری و دیموکراسییەوە هەبووە. میل باوەڕی وابوو کە تاقانە ئامانج و مەبەستی حکوومەت پێکهێنانی ئەوپەڕی بەختەوەرییە بۆ خەڵک و ئەو ئامانجەش بەبێ دەستەبەرکردنی ئەخلاق و گەوریی هزری رەگەزی مرۆڤ وەدی نایە. ئەو بە پێچەوانەی جێرمی بێنتام (١٧٤٨- ١٨٣٢) و جیمزمیلی باوکی، دەزگا سیاسی- کۆمەڵایەتییەکانی بە یەکێک لە گرینگترین ئامرازگەلی گەشەکردن و توانایی بەرزیی مرۆڤ دەزانی و باوەڕی بەوە بوو کە مرۆڤ بەبێ دەزگا گەلی سیاسی- کۆمەڵایەتی؛ لە کۆمەڵگادا ناتوانێ بەختەوەری دەستەبەربکا. بەو پێیە، یەکێک لە گرینگترین داخوازییەکانی میل لەسەر فمینیزم کە لە نووسراوەکانیدا روون و بەرچاوە؛ گەشەپێدان و هەراوترکردنی دەزگا سیاسی- کۆمەڵایەتییەکانە، کە بەڕای ئەو دەسەڵاتدارانی سەردەم هەوڵ دەدەن نەهێڵن ئەو دام و دەزگایانە پەرەبگرن و زیاد بکەن.[١٥]

تاوتوێکردنی فمینیزمی جۆن ستوارت میل، بێگومان دەرفەتێکی پڕبایەخە کە لەم رێگەیەوە نەک هەر قوولایی بیروباوەڕەکانی ئەومان لەمەڕ

رزگارکردنی ژنان و گەیاندنیان بە ئاستی پیاوان و هەروەها بەختەوەرکردنیان لە کۆمەگادا بۆ دەردەکەوێ بەڵکو لەوەش گرینگتر ئەو بەشەیە کە ئەو خوازیاری ئەوەیە سەرلەنوێ لە جسناتی مرۆڤدا چاکسازی و ریفۆرم بکرێتەوە. دژایەتیی میل، لەگەڵ ئەو دەمارگرژی و باوەڕانەی لە تەواوی قۆناغەکانی ژیاندا؛ ژنان دەچەوسێنێتەوە؛ هەر لە سەرەتای لاوێتی و لە نووسراوە سەرەتاییەکانی ئەودا کە لە مەڕ بابەتگەلی ئەخلاقی و سیاسییەوە نووسرابوون، بەدی دەکرا.

ئەو لە سەرەتای چالاکییەکانیدا، کاتی خۆی بۆ یەکێک لە بەرهەمە گرینگەکانی خۆی واتە "گوێڕایەڵی ژنان" The subjection of women، تەرخانکرد و لەسەر ئەم باوەڕە بووکە: "چەوساندنەوە و کۆیلەکردنی رەگەزێک [ژن] بەپێی یاسا لەلایەن رەگەزێکی دیکەوە [پیاو] هەڵەیەکی گەورەیە کە بووەتە یەکێک لە کۆسپەکانی بەردەم چاکسازی لە جسناتی مرۆڤدا.[16] ژیاننامە (بیوگرافی) و نامەکانی میل ئەو ئیدعایە دەسەلمێنن کە ئەو ماندوویی نەناسانە ئاگاداری رەوشی ژنان و پێگەی ئەوان بوو، هەروەها خەریکی هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنی ئەو پێوەرگەلە بوو کە سیستەمە فەلسەفییەکان و ئەخلاقی گشتی و ئاکاری خەڵکی کردبوویاننە مەحەکی هەڵسەنگاندنی بەهاکان و لە قۆناغە مێژووییەکاندا جێکەوتبوون؛ بۆ ئەوەی بۆی دەرکەوێ ئەو شتانە چ رۆڵێکیان لە کۆمەڵگادا هەبووە و چۆن رووبەڕووی پرسی ژنان بوونەتەوە.[17] بەڵام بۆ ناسینی بیروڕای جۆن ستوارت میل هەر ئەوەندە بەس نییە بگەڕێینەوە بۆ روانگەی ئەو سەبارەت بە کۆیلەکردنی ژنان. ئەو بە مەبەستی پاراستنی گیانی خۆی و ناوبانگی هارێت تایلۆرمیل* وازی هێنا لە بیروباوەڕە رادیکاڵەکانی خۆی

* Haret taylay، ئەو لە پێشدا خێزانی جۆن تایلۆری بازرگان بوو کە لە هیچ بوارێکدا یەکیان نەدەگرتەوە.

هلرێت رۆشنبیرێک بوو کە شیعری دەهۆنییەوە و وتاری دەنووسی. میل ساڵی ١٨٣٠ کە تەمەنی ٢٤ ساڵانەبوو ئەوی ناسی کە ئەویش ٢٣ ساڵ تەمەنی بوو. میل ئەم هاوڕێیەتییەی بە "باشترین هاوڕێیەتیی ژیانی" ناودەبرد. میل و هارێت لە باری هزرییەوە زۆر لێک نزیک



لەمەڕ تەڵاق و کۆنترۆڵ کردنی زاوزێ، کە لە راستیدا ئەم بیروڕایانە بە داکۆکیکردن لە مافی ژنان لەقەڵەم دەدان. وێڕای ئەوەش نامەو بەرهەمە لە چاپ دراوەکانی ئەو؛ پێشاندەر و دەربڕی بیروڕاکانیین. دیارە لەم باسەدا؛ سەرچاوە و ژێدەری بابەتەکانی ئەم دەخرێنەڕوو، هەروەها ئاماژە بەبیروڕا سەرنج راکێشەکانی هارێت تایلۆرمیل دەکرێ کە لە راستیدا لەژێر سێبەر و کارتێکەریی بیروباوەڕەکانی ستوارت میل (لەمەڕ ژنان) دابوون[18].

بیروباوەڕە رادیکاڵەکانی میل لەمەڕ مەسەلەی ئافرەتانەوە بە گشتی ئێجگار بە بیروباوەڕە باوەکانی نێوەراستیی سەدەی نۆزدەهەم نامۆبوون. بۆ ئەوەی لەو "هانە" یە تێبگەین کە ئەوی بەفمینیزم باوەڕمەندکرد، دەبێ ئاوڕ لە چەند بیرمەندێک بدەینەوە کە ئەو لەگەڵیان لە پەیوەندیدا بوو. بۆ وێنە؛ دۆکترینی سوودگەرایی utilitarianism* کە لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە: مەبەست لە چاکسازی و کاری گشتی تەنیا و تەنیا دابینکردنی ئەو پەڕی بەختەوەری و خۆش بژیوییە بۆ خەڵکی، کاریگەریی هەبووە لەسەر بیچم گرتنی بیرو بۆ چوونەکانی ئەو لەسەر ژنان[19] بەپێی سوودگەرایی و بنەمای بەرژەوەندی خوازیی، ژنان رێک بەو رادەیە مافی دەنگدانیان هەیە کە پیاوان هەیانە[20] ئەوە لە حاڵێکدابوو کە جێرمی بێنتام لەو هەلومەرج و کاتەدا هێنانە گۆڕێی مافی ژنانی بەشتێکی ناوەخت دەزانی و نەیدەویست بەخستنەڕووی ئەم مەسەلەیە کە خۆی گەلێک دەرەنجامی نالەبار و

بوون هەتا ئەوەی کە؛ بیست ساڵ دواتر خێزانی میل کۆچی دوایی کرد و پێکەوە (میل و هارێت) زەماوەندیان کرد. میل بەر لەزەماوەندکرنەکەی بەڵگەنامەیەکی بۆ ئیمزاکرد کە تێیدا چاوپۆشی کرد لە تەواوی ئەو مافانەی یاسا بەنیسبەت ژنەکەی بۆی لەبەر چاو گرتبوو. بێگومان هارێت کاریگەرییەکی بەرچاویبوو لەسەر بیچم گرتنی بیروباوەڕەکانی میل بەتایبەت دەرحەق بە مافی ژنان. هارێت ١٨٦٥ بە هۆی نەخۆشی ئازارە باریکە مرد و میل بۆ دەربڕینی پەژارەی خۆی گوتی "بەهاری ژینم کۆتایی هات".

* utilitarianism: لەوانەیە بەرژەوەندی سوودگەرایی؛ هاوواتای پڕ بەپێستی نەبێ. لێرەدا بەرژەوەندخوازیی یا (رەسانەیەتیی سوود و قازانج) بەو مانایەیە کە لایەنگرانی ئەو رێبازە باوەڕیان بەوەبوو کە هەموو دامودەزگاکان لە خزمەت و بەرژەوەندیی تاک دابن.

رەخنەگرانەی لەمەڕ مافی جیاوازی ژن و پیاوەوە بە دواوە بوو؛ پێگەی خۆی بخاتە مەترسییەوە، بەڵام میل بەپێی نووسینەکانی لە ئۆتۆبیوگرافییەکەیدا، "وێڕای خستنەڕووی پێناسەی ئازادی، دەروانێتە داهاتوو... پەرەگرتنی گرینگیدان بە مەسەلەی ئازادیی ژنان کە لە هاوژینی دەگەڵ پیاوان دێتە ئاراوە."[٢١] لەو نێوەدا جیمزمیلیش بە نووسینی نامیلکەیەک لە پەیوەندی دەگەڵ حکوومەتدا بووە هۆی دڵ ئێشانی بیرمەندە رادیکاڵەکان و یەک لەوان جۆن ستوارت میل.

لەو نامیلکەیەدا باس لەوە کراوە کە: "باشتروایە لە مافی دەنگداندا، ژنان هەڵئاوێردرێن (مافی دەنگدانیان نەدرێتێ) لە بەر ئەوەی کە بەرژەوەندییەکانی ئەوان لە پاوانی مێرد و خێزانەکەیان دایە. نامیلکەکەی لەمەڕ حکوومەت؛ بووە هۆی سازبوونی مشتومڕ و دژبەری لە نێوان لایەنگرانی رەسەنایەتی تاکدا، تا ئەو رادەیە کە میلی لاو لە زمانی خۆی و هاوکارەکانییەوە کە جێرمی بێنتامیشی دەگرتەوە گوتی: "ئێمە بێ هیچ پێچ و پەنایەک بەهەڵستکار و دژبەرین".[٢٢]

دیارە ئەم دەرەنجام وەرگرتنەی میل و دەربڕینی ئەم وتەیە، شوێندانەر بووە لەسەر ئیدانەکرانی بۆچوونەکەی میل؛ چونکی ئەم دەرەنجام وەرگرتنە کاریگەریی راستەوخۆی لەسەر مەکاولی macaul دانا و وای لێکرد هێرش بکاتە سەر "نامیلکەیەک لەمەڕ حکوومەت" و بڵێ کە "هەروەکی بەرژەوەندیی رەعییەتەکان و ئاغاکان وەکیەک نین؛ بەرژەوەندیی ژنانیش دەگەڵ بەرژەوەندیی مێردەکانیان یەکسان نین".[٢٣] تەواوی ئەو شتانە و شەڕو مشتومڕ و گەنگەشەی رۆشنبیرانە و هەروەها بڵاڤۆکی Wesyminster Review ی ئۆرگانی لایەنگرانی تیۆریی سوودگەرایی کە لەبەر داکۆکی کردن لە مافی ژنان خۆیان بە قارەمان و پاڵەوان دادەنا، سەرنجی جۆن ستوارت میلیان بۆ لای فمینیزم راکێشا بوو. سەرەتای ساڵی ١٨٢٤ میل وتارێکی بڵاوکردەوە کە تێیدا هێرشێکی رەخنەگرانەی توندی کردە سەر ئەو پوانە فەرمی و ئەخلاقی و هەڵسوکەوتە تاکەکەسییانەی بەمەبەستی



جیاوازی خستن و خۆبە مەزنتر زانینی رەگەزێک [پیاو] لە رەگەزێکی دیکە [ژن] لە گۆڕێدان.[٢٤].

سەرچاوەی ئیلهام دەری فمینیزمی میل دەگەڕاوە بۆ سوسیالیستە فەرەنسی و بریتانییەکانی پێشوو.

بۆ وێنە ئەو ئاماژە دەکا بە دیمانەکانی خۆی لەگەڵ ویلیام تۆمپسۆن William Thompson ئۆوێنایت owenit کە لە ساڵەکانی ١٨٢٠ دا گەلێک بابەتیان لە مەڕ فمینیزمەوە نووسیبوو.

ئەو لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: "سەرنجم دایە بابەتە پڕبایەخەکانی ئۆوێنایت و سۆسیالیستەکانی دیکە کە لە هەموو بوارەکاندا خوازیاری مافی یەکسان بۆ ژنان بوون.[٢٥] هەروەها لە نامەکانی میل وادەردەکەوێ کە ئەو تاسەبارانە بیروباوەڕەکانی ئێن فانتین En fantin و مێسیۆنێرەکانی لایەنگری سان سیمۆنی saint siman دەخوێندەوە کە لە سەرەتای ساڵەکانی ١٨٣٠ دا هاتبوونە لەندەن.[٢٦] میل لە ژیاننامەکەی خۆیدا دەنووسێ: "بەگشتی لایەنگرانی سان سیمۆن، ئۆوێن و فێورییە؛ لە پەیوەندی لەگەڵ یەکسانی نێوان ژن و پیاوو چۆنێتی پەیوەندیی ئەوان بە یەکەوە، سیستەمێکی نوێییان خستەڕوو بۆ ئەوەی ناویان بە یادگار بمێنێتەوە بۆ نەوەی داهاتوو.[٢٧] شتێکی دیکە کە بووە هۆی ئەوەی میل بەباوەڕەوە لایەنگریی لە فمێنیزم بکا، پەیوەندیی ئەو بوو لەگەڵ W. j. fax و گۆڤاری Monthly Repository . ئەم مانگنامەیە لەسەرەتای ساڵی ١٨٢٣ دا وتارەکانی هارێت مارتیتۆ Harrietn martineau ی بڵاودەکردەوە کە پەیوەندییان بە مافی یەکسانیی پەروەردەو خوێندنی ژنانەوە هەبوو. بەتایبەتی لە ساڵەکانی ١٨٢٠ دا کە (فوکس) سەرنووسەری بوو؛ گەلێک وتار لەسەر بابەتگەلی وەک، مافی دەنگدانی ژنان، هەڵسوکەوتی بێ جێ لە پەیوەندی لەگەڵ تەڵاقدا و هەروەها، باشترکردنی (ریفۆرم) ئاکاری ناڕەوا و ناماقووڵ لە بەرامبەر ژناندا، بڵاودەکردەوە. فرانسیس مینکا لەم بارەوە دەڵێ: "ئێمە هەوڵمان دەدا بۆ نووسینی وتارگەلێک لەمەڕ رزگاریی ژنان، ئەوەش هەوڵێکی پیرۆز و جێی شانازی بوو. چونکی بیروڕای گشتی هیچ

زانیارییەکی لەسەر مەسەلەی ئازادیی ژنان و مافی دەنگدانیان نەبوو، هیچ بڵاوکراوەیەکیش لە ئارادانە بوو کە لایەنگری بکا لەم میتۆدی رۆشنگەرانەو رۆشنبیرانەیە لە پەیوەندی لەگەڵ ژناندا"[٢٨].

میل لە ساڵەکانی دەیەی ١٨٣٠ دا هاوکاریی گۆڤاری monthly Repository دەکرد و لە نامەگۆڕینەوەکانیدا دەگەڵ فۆکس دەریدەخست کە ئەوان بۆ پەرەپێدانی بیری فمێنیستیی ئەم، پاڵنەر و دنەدەرێکی باش بوونە.[٢٩] دواجار بە هیچ شێوەیەک ناکرێ رۆڵی ئەو ئافرەتە رۆشنبیرانەمان لەبەر چاونەبێ کە پەیوەندییان بەمیلەوە بوو و کاریگەرییەکی راستەوخۆیان لە سەر بیروڕای فمینیستیی ئەو دانا. ئافرەتی رۆشنبیر و هۆشیار و زانستوانی وەک هاریێت مارینۆ سارا ئاوستین sarah Austin جان کارلایل jane car lae، سار فلۆوێر sarah flowar ئێلیزا فلۆوێر Eliza flower و لە هەموان زیاتر هاریێت تایلۆر بوو، کە گاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر بیروڕای میل لەمەڕ مەسەلەی ئازادی دانا. بڵاوبوونەوەی بیبروبۆچوونەکانی هاریێت تایلۆر کاریگەرییەکی باشیان لەسەر میل دانا.[٣٠] چونکی میل لەلایەکەو نەک هەر ئەوەی بە جۆش و خرۆشەوە تاریفی توانا و هێزی هەڵکەوتەیی (نبوغ)ی ئەوی کرد بەڵکو دانی بەوەدا هێنا کە لە راستیدا بیروباوەڕەکانی خۆی لەمەڕ مەسەلەی ژنانەوە، لەسەر بنچینەی بیر و باوەڕەکانی هاریێت تایلۆر دامەزراندووە، کەسێک کە یارمەتیی جێرمی بێنتامیدا کتێبی دۆمۆن Dumont بنووسێ.[٣١] لەلایەکی دیکەوە زۆرکەس پێیان وایە کە هاریێت تایلۆر کاریگەرییەکی خراپی بەسەر (میل)ەوە بووەو ئاستی چلۆنایەتیی بەرهەمەکانی ئەوی تەواو دابەزندووە.

لێرەدا واباشتر بێینە سەر رای H. O. pappe؛ کەسێک کە بەڵگە لە ئەزموونەکانی خۆی دێنێتەوە و لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەو کاریگەرییە (خراپە) لەبەر ئەوە بوو کە میل لە تاریفکردنی تواناکانی هاریێتدا، زۆری پێوەنابوو و ئەوی بەخاوەنی هەموو جۆرە "نبوغێک" زانیبوو. بەکورتی؛ لەبەر دوو هۆ پێویست نەبوو بیروباوەڕەکانی میل تووشی ئەم باس و خواسانە بن.



یەکەم: میل بەڕوونی و راشکاوی گوتوویەتی کە؛ هاریێت تایلۆری هاوسەری، کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر باوەڕەکانی ئەو هەبوو. بەڵام سەرچاوەی باوەڕەکانی ئەو بە یەکسانیی مافی ژن و پیاو- کە لە نامەکانی و گرنگترین کتێبەکانیدا هەن- هیچ پەویوەندییەکی بە ژنەکەیەوە نەبوو؛ چونکی ئەو بەرلەوەی هاریێت تایلۆر بناسێ؛ باوەڕی بەداکۆکی کردن لە مافی ژن هەبوو. هاریێت تەنیا ئەوی زیاتر هۆگری مەسەلە و پرسی ژنان کرد و بووە هۆی ئەوەی کە بە باوەڕێکی پتەوو قایمترەوە داکۆکی لە مافی ژنان بکا. میل ئەوەشی لێ زیاد دەکا؛ کە لەو ماوە دوور و درێژەی دەگەڵ تایلۆر پەیوەندیی هەبووە، ئاکامی ئەو پەیوەندییە پێکهاتنی ژیانی هاوبەشیانی لێکەوتۆتەوە؛ هاریێت کاریگەریی بووە لەسەر بیروڕای سەربەخۆی ئەو سەربارەت بە ژنان و مەسەلەی ژنان کە هەتا ئەوکات بەلایەوە بابەتێکی ئابستراکت و رەبەن بوو؛ بە هۆی هاریێتەوە بوو بە بابەتێکی واقیعی و کردەیی- میل بەیارمەتیی هاوسەرەکەی رۆژبەڕۆژ زیاتر هەستی بە کاریگەرییەکانی مافی ژنان و ئەو دەرفەتە نالەبار و نایەکسانانە دەکرد کە لە کۆمەڵگادا هەیان بوو.

ئەو لەو پەیوەندییەدا لە ژیاننامەکەیدا نووسیویێتی کە: ژنەکەی هەروەها تێی گەیاند لە رەوشی ژێر چەپۆکەیی ژنان و گرفتە ئاڵۆزەکانیان کە هەمووی ئاکامی میتۆد و شێوازە نالەبار نەگونجاوەکانی کۆمەڵگایەو دەبێتە هۆی سازبوونی کۆسپ و تەگەرە لە بەردەم چاکسازی و ریفۆرم لە جستانی مرۆڤ دا.[٣٢] بەو پێیە؛ هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە میل وەکو فمێنیستێک سەربەخۆبوو لە بیروباوەڕەکانی هاریێت تایلۆر و؛ ژنەکەی تەنیا بووە هۆی ئەوەی کە، بە ورەو باوەڕێکی پتەوتر و قایمترەوە داکۆکی لە مافی یەکسانی ژنان لە بەرامبەر پیاواندا بکا و بۆ چاکسازی کردن و ریفۆرم لەو باوەڕەدا راپەڕێ کە پێی وابوو ژن بە شێوەی زاتی بوونەوەرێکی لاواز و بێهێزە.

دووهەم: کەس ناتوانێ بڵێ؛ یەکەمجار مەسەلە و پرسی ژن لە مێشکی کامیاندا چرۆی کرد. ناوازەییەک "ریز پەڕییەک" کەلەم پەیوەندییەدا

لـەگۆڕێدایـە ئـەوەیـە کـە ئـەو دوانـە هـەر لـە سـەرەتـای ئاشـنایەتـی و پەیوەندییەکەیاندا پێکەوە دوو کورتە وتاریان نووسی کە یەکێکیان لەسەر "زەماوەندکردن و تەڵاق" و ئەوی دیکەیان لەسەر "مافی دەنگدانی ژنان" The Enfranchisement of women بوو.

بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ کە میل کتێبی کۆیلەکردنی ژنانی لە پاش مەرگی هارێت تایلۆر و بەتەنیایی نووسیوە. لەو وتارانەی بە یەکەوە نووسیویانن دەردەکەوێ کە بیروباوەڕەکانی تایلۆر زۆر لە باوەڕەکانی میل توندتر و رادیکاڵتر بوونە. بۆ وێنە ئەو لەسەر ئەم باوەڕو بوو کە ئەگەر بێتو رۆژێک لە رۆژان ژنان بەتەواوی بەمافە مەدەنی و سیاسییەکانیان بگەن؛ دەبێ تەواوی یاسا و رێساکانی زەماوەندکرن بسڕدرێنەوە بێ ئەوەی دەرەنجامێکی خراپی بۆ ژنان بە دواوەبێ. لە حاڵێکدا میل خوازیاری هێندێ ریفۆرمی "میانرەوانەتر" بوو لەسەر مەسەلەی تەڵاق و قەت باوەڕی بەوەنەبوو کە دەبێ یاسا و رێساکانی زەماوەندکردن هەڵوەشێنرێنەوە. بەکورتی باوەڕە سیاسی- کۆمەڵایەتییەکانی میل و تایلۆر زیاتر لەسەر ئەم پرسە واتە رزگاربوونی ژنان چڕبووە کە بەلایانەوە گەلێک گرینگ بوو. باس و لێدوانەکانی ئەوان کە بابەتەکانی نێو کتێبی کۆیلەکردنی ژنانیشی لەخۆ دەگرت بۆیە یەکەم جار لە وتاری "مافی دەنگدانی ژنان"دا دەرکەوت، بەڵام بەتەنیا ئەم هۆیە بەس نییە بۆ ئەوەی دەرکەوێ ئەو دووانە لەبیروباوەڕە سەرەتاییەکاندا هاوڕا بوون. هەروەکی گوترا تایلۆر سەبارەت بە یەکسانیی مافەکانی ژنان بیروباوەڕێکی رادیکاڵانەتری هەبوو؛ هەربۆیەش زۆربەی کۆمپانیاکانی چاپ و بڵاوکرنەوە؛ کتێبەکانی ئەویان چاپ نەدەکرد. بەو پێیە لەوانەیە پەیوەندییەکی چڕوپڕیان پێکەوە هەبووە لەسەر باوەڕەکانی خۆیان کەوتوونەتە مشتومڕ و گەنگەشەو هەروەکوو میل دەڵێ: "ئێمە بۆ گەیشتن بە باوەڕێکی هاوبەش مشتومڕ و گەنگەشەیەکی لە رادەبەدەرماندەکرد و ئێستاش بەشی هەرە زۆری ئەم لێدوانانە لە مێشکماندا ماونەتەوە."[٣٣] بەو جۆرە دەتوانین بەو دەرەنجامە بگەین کە هۆی باوەڕی قایم و پتەوی جۆن ستوارت میل بە فمینیزم ئەوەبوو کە ئەو لەگەڵ گرووپگەلی بیرمەندی دیکەی وەکو؛ سوودگەراکان (utilitarianism)



سۆسیالیزمی پێشڕەو، لایەنگرانی سانسیمۆن و لایەنگرانی فێورییە و هەروەها سوودگەرا رادیکاڵەکان؛ پەیوەندیی هەبووە. هەروەها ئەو پەیوەندیی بووە بە چەندین ژنی رۆشنبیری وەک هارێت تایلۆر کە بەردەوام نارەزایەتییان دەربڕیوە بەنیسبەت رەوش و دۆخی ژنانی سەردەمی خۆیان و ئازاریان دەچێشت بە هۆی کاریگەریی نالەبار و پڕ لە جیاوازی خستن بەنیسبەت یاساکانی زەماوەندکردن و دەست پێ رانەگەیشتنی ژنان بە پەروەردەی پێویست. بۆیەش؛ هیچ سەیر نییە کە میل بڕیاریدا گرینگترین بنەما و کۆڵەکەکانی بیروباوەڕە سیاسی- کۆمەڵایەتییەکانی خۆی بۆ ئازادی و رزگاربوونی ژنان تەرخان بکا. جۆن ستوارت میل لە کتێبی "لەمەڕ ئازادی on liberty دا خۆی بواردووە لەوەی کە بەبێ لەبەر چاوگرتنی بەکەڵک و بە شێوەی ئەبستراکت باس لە "ماف" بکا و لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا؛ خۆی بە دەروەست دەزانێ کە وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە وا بەوەی تاوانبار دەکەن کە دەیەوێ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەناوی "مافی رەبەن "ئەبستراکت" وەڕێ بخا[٣٤] بەواتایەکی دیکە؛ مەبەستی میل ئەوەیە کە ناکرێ بەبێ لەبەر چاو گرتنی سوود و قازانج بە شێوەی ئەبستراکت و رەبەن باوەڕ بە ماف بکەین. هەروەها بەکەڵکی و بەقازانجی لە روانگەی سیاسی- کۆمەلایەتیی ئەوەوە هەر بەرژەوەندییە راستەقینە و نەگۆڕەکانی مرۆڤە کە بۆ گەشە و پێشکەوتن پێویستێتی. میل لەوکاتدا و سەرەڕای ئەو هەموو قسە جیددییە؛ زیاتر دەگەڵ تێۆرداڕێژانی سروشتی هاودەنگ بوو هەتا لایەنگرانی دۆکترینی سوودگەرایی.

سوودگەراکان سەرەڕای ئەوەی "هێندێ هەڵەی بنەڕەتییان" هەبوو، واتە ئەوانیش وەک تێۆرداڕێژانی "مافی سروشتی" باوەڕیان بەدادپەروەری و یەکسانی لە مافی ژن و پیاودا نەبوو. بەتایبەتی لەمەڕ مەسەلەی گرینگی کار و ئیشی ژنان و مافی هەڵبژاردنی کار بەپێی ویست و زەوق و سەلیقەی خۆیان"[٣٥] بە و حاڵەشەوە میل لە دوو کتێبی "لەمەڕ ئازادی و کۆیلەکردنی ژنان"دا باس و داکۆکی لە بەکەڵک بوون (سوودمەندی) لە پانتاییەکی هەراودا دەکرد کە لە سەر بنچینەی بەرژەوەندییە هەمیشییەکانی

ژنان وەک مرۆڤی پێڕەو بنیاتنراوە و داکۆکی لە ئازادییەکانیان و مافی هەڵبژاردنی کاروباریان؛ کردووە. ئەو بەتوندی بەرپەرچی بیروبۆچوونەکانی بێنتام لەمەڕ سروشتی مرۆڤ دەداتەوە لەوتارێکدا بەناوی "لەسەر بێنتام".(٣٧) و لەبەرهەمەکانی دیکەشی دا ئەم دژبەرییەی خۆی دەردەبڕێ.

بۆ وێنە ئەو لە کتێبی " لەمەڕ ئازادی"دا لەم بارەوە دەنووسێ: "سروشتی مرۆڤ شتێکی وەک مەکینە نییە کە خاوەنی پارادایم (نموونەی دیاریکراوی پێشوو) بێ بەڵکو وەک دەرختێکی زیندوو وایە کە بەپێی خەسڵەتە زاتییەکانی؛ چاوەڕوانیی هەڵدان و گەشەی لێدەکرێ."(٣٨)

بەهەر حاڵ؛ چەمکی "نامیکانیکی"ی میل بۆ سروشت چ ئەوە روون بکاتەوە کە ئەو لە بنەماکانی "مەزنترین بەختەوەری بۆ زیاترین خەڵک" کشاوەتەوە و چ ئەوەیکە میل لەلایەنگرانی سوودگەرایی دووربکاتەوە؛ لەخۆیدا نیشاندەری ئەو حەقیقەتەیەکە؛ ئەو پێداگربوو لەسەر مەسەلەی پێگەی دامودەزگا مرۆییەکان و گەشەکردنیانی زیاتر بەلاوە گرینگ بوو لەو ئەزموونە چێژ بەخشانەی کە مرۆڤەکان دەستەبەری دەکەن. لەو پەیوەندییەدا نەک هەر بیروبۆچوونی جێرمی بێنتامی قبووڵ نەبوو لەمەڕ pushpin (جۆرەکایەیەکی منداڵانە) یە کە بێنتام پێی وابوو ئەگەر خەڵک چێژ لە مۆسیقای ئەم یارییە وەردەرگرن؛ ئەوا لە هونەر و شیعر و مۆسیقا زۆر باشترە؛ بەڵکو بووە هۆی دڵ ئیشانی جێرمی بێنتام. میل باوەڕی وابوو کە مەزنترین چێژێک کە گەورەترین بەختەوەری بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر دەکەن؛ چێژە هزرییەکانن و چەپەڵترین چێژەکانیش ئەوانەن کە لە هەستەکانەوە سەرچاوە دەگرن. (٣٩).

هەروەها ئەم چەشنە چێژە (چێژی هەستەکان) لە ئاکامی نەبوونی پەروەردەی عەقڵی و هزرییەوە سەرهەڵدەدەن.(٤٠) بەو پێیە ئەو ئامرازە پێویستەی کە هەموو کەسێک دەتوانێ بە هۆی ئەوانەوە بە مەزنترین چێژەکان بگا، ئەوەیە کە لێیانگەڕێن بە ئازادی و ویستی دڵی خۆیان لە شیعر و شتەکانی دیکە چێژ وەرگرن. پەرەگرتن و هەراوتربوونی ئەخلاقییاتی مرۆڤ؛ ئادەمیزاد دەگەیەننە لوتکەی بەختەوەرییەکان. چونکی



مرۆڤی رەوشت بەرز و مەزن، تەنیا بەو کەسانە ناگوترێ کە چاکەکارن و لە پێناو بەختەوەریی خەڵکدا خۆ لە چێژی شەخسی و خۆپەرستی دەبۆێرن؛ بەڵکو بەوانەش دەگوترێ کە لە ئەنجامی کارێکی باشدا دڵیان سوکنایی دێت و هەست بە شادمانی و رەزامەندی دەکەن.(٤١) بەو پێیە باوەڕی میل لەمەڕ سوودگەرایی جیاواز بوو لە بیروباوەڕی بێنتام، تا ئەو رادەیە کە میل هیچ هیوایەکی بە وەڵامی ئەو پرسیارە نەبوو کە ئایا مەزنترین بەختەوەرییەکان تاقیکراونەتەوە، یان نا؟. میل لە لاپەڕەکانی سوکرات و بەراز socrate and The pig دا، لەمەڕ گەورەترین بەختەوەرییەکان، بە راشکاوانە گوتویەتی کە: بەختەوەرییەکان لە چۆنایەتیدا لێک جیاوازن، هێندێکیان لە هێندێکیان باشترن. بۆ وێنە، ئەو چێژ و خۆشییانەی کە پەیوەندییان بە عەقڵەوە هەیە، باشتر و مەزنترن لەو خۆشییانەی لە نێو مرۆڤ و ئاژەڵدا هاوبەشن و لە هەستەکانەوە سەرچاوە دەگرن. ئەو لەو پەیوەندییەدا دەپرسێ: چ کەڵە پیاوێک (وەکو سوکرات) حازرە نەزان و گێژبێ لەبەر ئەوەی زیاتر لەنەزانین دایە، بەڵام نەبێتە گەورە پیاوێکی زانا کە تێگەیشتوویی جیا لە ژان و ئازار هیچ دیارییەکی پێ نابەخشێ؟ ئەم گەورە مرۆڤە زانایە، حازرە مرۆڤ بێ و لە هەموو خۆشی و چێژێک بێبەش بژی نەک بەرازێکی بەکەیف و بێ خەم.[B]

دیارە میل کە ئازار و بەختەوەریی کردووە بە پێودانگی ئەخلاقی، سەرنجی بەم خاڵە نەداوە کە ئەگەر ئەخلاق و توانایی هزریی خەڵک گەشە بکا و پەرەبگرێ، ئەوان بە هۆی بەختەوەری و خۆشییەکانی خۆیان تێدەگەن کە لێک جیاوازن. بەو پێیە؛ ئەوەی کە چێژ و خۆشییەک لە چێژ و خۆشییەکی دیکە باشتر و مەزنترە؛ ئیتر شتێکی بێ مانایە. بێگومان میل لێرەدا تووشی ئەندێشە و بیری نوخبەگەرایی بووە، چونکی ئەو کاتەی بێنتامی لەبەر ئەوە دەدایە بەر رەخنە کە لە خۆیدا بە پێوەری "سروشتی

[B] ئەم رستە بەناو بانگەی ستوارت میل لە هێندێ شوێن بەمجۆرەش وەرگێردراوە: "باشتر وایە سوکرات بیت و چارەڕەش، نەک بەرازبیت و بەختەوەر" کتێبی مێژوو و هزری رۆژئاوا. ل١١٠

مرۆڤ" گەیشتووە؛ میل ئاگای لێ نییە کە بۆ خۆیشی هەر ئەم کارەی دووپاتە کردۆتەوە. ئەو خۆی وەک نموونەیەک لە ئیستاتیکای (زاهیدانە) و رۆشنبیرانە بۆ جسناتی مرۆڤ وێنا کردبوو. بەهەرحال، میل کە لەبەر ئەسڵی "گەشەی ئەخلاقی و توانایی هزریی مرۆڤ " نکوڵی کردبوو لە بنەماکانی مەزنترین بەختەوەرییەکان و تەواو هاتبووە سەر ئەوەی کە تەنیا بە پەروەردە و راهێنان بەختەوەری دەستەبەردەکرێ، هیچ کات جیا لە وێناکردنی رۆشنبیرانەی خۆی لە مەسەلەکە، ئەزموونێکی دیکەی نەخستەڕوو، خۆ دیارە بەیەکجار ئەزموون و تاقیکردنەوە، دروستی و هەڵەبوونی گریمانەیەک ناسەلمێندرێ.

مەبەست لە هێنانە بەرباسی ئەم بابەت و مەسەلانە، ئەوەیە کە روانگەی بەرژەوەند سوودگەرایانەی دڵخوازی میل و چەمکی "مرۆڤ" مان لە روانگەی ئەوەوە بۆ روون بێتەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی (بەڕای میل) ئەخلاقی، پێشکەوتوو و لە باری هزریشەوە جێی گۆڕان و و ریفۆرم هەڵگرە؛ هەمووی ئەوانەش بۆ ئەوەیە لەم رێگەوە بتوانین لە روانگەی فەلسەفەی- سیاسیی ئەو بەنیسبەت مەسەلەی ئافرەتانەوە تێ بگەین؛ چونکی لە کتێبی کۆیلەکردنی ژنان و بەرهەمەکانی دیکەیدا، کە لە مەڕ رزگاریی ژنانەوە نووسراون؛ بەدەگمەن مەسەلەی پێشکەوتنی مرۆڤ خراوەتە بەرباس و لێدوان. ئەو تەنیا لە لاپەڕەیەکی کتێبەکەیدا لەژێرناوی پرەنسیپی ئابووریی سیاسی Thprincipal of political Economy بە کورتی جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکاتەوە کە "ئەو یاسا و باوەڕانەی [لەسەر رەگەزی ژن و پیاو] لە ئارادان لەسەر بنەمای مافی یاسایی و بوونی جیاوازی لە توانایی راپەڕاندنی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیاندا بە فەرمی ناسراون، دەبێ وەک کۆسپێکی گەورەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت کۆسپی سەر رێگەی مسۆگەر بوونی ریفۆرمی عەقڵانیی جسناتی مرۆڤ بناسێندرێ و لەقەڵەم بدرێ.[٤٢]



## ئازادی، سەربەستی و دادپەروەری

دوو بنەما و پرەنسیپی بەرچاوی دیکەش لە کتێبی کۆیلەکردنی ژنان و بەرهەمە فمێنیستییەکانی دیکەی میلدا هەن. یەکێکیان لەسەر ئازادی و سەربەستییە، ئەوی دیکەش لەمەڕ دادپەروەری، بەمەبەستی لەبەرچاوگرتنی یەکسانی بەبێ لایەنگری لەلایەنێک. هەر دووکی ئەم مەسەلانە، پەیوەندییان بە ئەخلاق و گەشەکردنی توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ و هەورەها پەیوەندییان بە بەختیاریی ژنانەوە هەیە کە دەبێ بەدەستی خۆیان جێبەجێ بکرێن.

یەکەم: میل لە کتێبی "لەمەڕ ئازادی"دا بەڕوونی و بەوردی؛ بەهاکانی ئازادی وەک یەکێک لە ئامرازە گرینگەکانی گەیشتن بە سەربەستی و بەختەوەری خستۆتە بەرباس و لێیان دواوە. بەواتایەکی دیکە ئەو هەبوونی ئازادی، بە نەمانی کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم مرۆڤەکان لە کۆمەڵگادا، دەزانێ. گۆمەڵگای ئازاد بەڕای ئەو کۆمەڵگایەکە؛ کە تاکەکان چ ژن و چ پیاوی ئەو کۆمەڵگایە؛ بۆ گەیشتن بە بەختەوەری تووشی هیچ کۆسپ و لەمپەرێک نەبن. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە تەنیا ئەو کاتە کۆمەڵگا پێشکەوتنی سیاسی- کۆمەڵایەتی بەخۆوە دەبینێ کە ئاستی ئەخلاق و توانا هزرییەکانی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە گەشەی کردبێ و بەرز ببێتەوە؛ ئەوەش وەدی نایە مەگەر ئەوەی کە؛ بە ئازادی بگەن بۆ ئەوەی بۆیان بلوێ بۆ گەیشتن بە بەختیاری؛ تواناکانی خۆیان پەروەردە بکەن. میل لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا دەنووسێ: "پاش پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان وەک: بژیو و جلوبەرگ؛ ئازادی بەهێزترین ویستی سروشتیی مرۆڤە و هەبوونی لەوپەڕی پێویستی دایە.[٤٣]

هەروەها لە کتێبی ئازادیدا بەوجۆرە باس لە مەرجی بەکارهێنانی زەبر و زەنگ و دەست تێوەردان لە پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵ و تاکەکاندا، دەکات: "مرۆڤەکان تەنیا کاتێک بۆیان هەیە بە شێوەی کۆ، یا تاکەکەسی خۆ لە ئازادیی ئەوانیتر هەڵقورتێنن کە بیان هەوێ پێشگری بکەن لە زیان و زەرەر وێکەوتن وەکەسانی دیکە.[٤٤] بەواتایەکی سادەتر؛ لە کۆمەڵگا ژیارییەکاندا؛ تەنیا بەمەبەستی پێشگرتن لەوەی کە تاکەکان زیان بەیەکتر یا

بەکۆمەڵگا نەگەیەنن وەک سزای یاسایی کەڵک لە زەبر و زەنگ وەردەگیردرێ. تاک لەو بەشە لە کردەوەو ئەدگارەکانیدا کە پەیوەندییان بەخۆیەوە هەیە ؛ لەوپەڕی ئازادی (ڕەها) دایە. میل بۆ کەسانێک باس لەم پرنسیپە دەکات کە لە هەموو بوارێکەوە تەواو پێگەیون. بۆ وێنە؛ ئەو منداڵان یا ئەو کەسانەی کە هێشتا خۆیان نەناسیوە و پێویستیان بەوەیە لە ژێر چاودێریی کەسانی دیکەدابن لەم ڕێسایە دەرداوێ و باوەڕی وایە کە ئەوان دەبێ بپارێزرێن لەوەی کە هەم خۆیان زیان بەخۆیان نەگەیەنن و هەم خەڵک زیانیان پێنەگەیەنن.

میل بە پێچەوانەی ڕۆسۆ کە تێگەیشتنێکی لیبڕاوانەی لە ئازادی بۆ پیاوان خستبووەڕوو؛ ئەم بێگومان ئازادیی بەیەکێک لە بەها و پێودانگە گرینگ و بەڵگەنەویستەکانی داکۆکی کردن لە ماف و پێگەی یاسایی ژنان دەزانی. مەسەلەی ئازادی و سەربەستی؛ لەو مەسەلە بەرباسانەی ستوارت میلن دژی نایەکسانیی یاساکانی زەماوەندکردن و ئەو جیاوازی خستنە لە ڕادەبەدەرانەی کە لەمەڕ خوێندن و پەروەردە و کەموکوڕی یا نەبوونی دەرفەتی کار بۆ ژنان لە کۆمەڵگادا، دەدوێن. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ڕزگاربوونی ژنان بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان سەرەڕای ئەوەی کە بەختەوەریان دەکا؛ قازانجی ڕاستەوخۆی بۆ کۆمەڵگاش هەیە. لە کۆمەڵگایەکدا کە ئافرەتێک بەکردەوە هیچ دەرفەتێکی بۆ هەڵبژاردنی ئیش و کار، پێنەدراوە و تەنیا مافی شووکردنی هەیە، ئەویش شووکردنێک کە بە شێوەی یاسایی دەبێتە دیل و کۆیلەی مێردەکەی و هیچ دەسەڵاتێکی نابێ بەسەر ماڵ و سامانی خۆیدا، دەرەنجامەکەی ئەوەیەکە؛ لە کۆمەڵگادا جیاوازییەکی قووڵ هەیە لە نێوان ژیانی کۆیلەتی بۆ داخوازیی ئەوانی دیکە، لەگەڵ ژیانی ئازاد و سەربەخۆ بۆ ویستەکانی خۆت.[٤٥] میل لێی سوور بوو کە بەختەوەریی ژنان بەستراوەتەوە بە ئازادیی ئەوان لە هەڵبژاردنی ژیانیاندا و هەروەها ئەوەش کە ژنان زۆر لە پیاوان پتر لەبەردەم ژیانی خۆیاندا بەرپرسیارن، بۆ ئەوەی ژیانێکی سەربەخۆ پێکەوەنێن و هەر جۆرێکی دڵیان دەخوازێ بژین. ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە "ئەگەر



پێویستە هەوڵێک بۆ بەختەوەریی مرۆڤ بدرێ ئەو هەوڵە دەبێ هەڵبژاردن و حەز و ویستی کەسەکانی تێدابێ"[٤٦]. کەواتە ئەو ئازادی و دەستئاوەڵاییەی لە هەڵبژاردنی کار و [ژیان]دا بۆ پیاوان هەیە؛ دەبێ بۆ ژنانیش هەبێ. لەو جۆرە هەلومەرجانەدایە کە ژیانی هاوبەش یا ڕەبەنی؛ مانای خۆیان وەدەست دێنن. جیا لەوە زەماوەندکردن بەمانای ڕاکردن لە دەست "قەیرەیی oldmaid hood و پەنابردن و خۆخستنە بەردەستی پیاوانە و ئەوەش دەگەڵ واقیعی ڕاستەقینەی زەماوەندکردن یەکناگرێتەوە کە [لێرەدا] ژن و پیاو بە شێوەی یاسایی، خاوەنی ماف و بەرپرسیارەتیی وەک یەک و یەکسان بن.

ئەگەرچی میل لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا هیچ باسێکی لە باوەڕە ڕادیکاڵەکانی خۆی لەمەڕ زەماوەندکردن نەهێناوەتە گۆڕێ، بەڵام لە وتارێکیدا لە ژێرناوی "یەکسانیی ڕەگەزەکان" و "زەماوەندکردن و تەڵاق"دا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە دەبێ لەسەر ویستی هەردووکیان (ژن و مێرد) گرێبەستێکی ئازاد هەبێ کە تێیدا دیاری بکرێ [دوای تەڵاق] منداڵەکەیان کە بەرهەمی ئەم زەماوەندکردنەیە بەکێهەیان دەدرێ. ئەو بەگشتی و بەتوندییش دژی ئەم ڕوانگەیەی سەردەمی خۆی بوو کە زەماوەندکردنی بەشتێکی سروشتی و پێویست دەزانی و لەبەرپەرچیدا دەیگوت: زەماوەندکردنی بەزۆرەملی"بەدڵنیاییەوە هەڵەیەکی گەورەیە لە هەناوی هەڵەیەکی دیکەدا. چونکی بە هەموو شێوەیەک نابێ هیچ هانە (انگیزە)یەک بێجگە لە بەختیاریی ژن و مێرد لە گۆڕێدا بێ کە یەکتریان خۆش دەوێ و هەست دەکەن دەتوانن پێکەوە بژین[٤٧]. میل باوەڕی وایە کە نکوڵی کردن لە ئازادیی [مرۆڤ] ئەویش بەبیانووی پاراستنی ئەو لە زیان و خەسارەکان؛ کارێکی هەڵە و دزێوە. ئەو داکۆکی لە ئازادیی ژنان دەکا کە بەگشتی بە یەکێک لە ئامرازە گرینگەکانی بەختەوەری و چارەنووسی ئەوان لە قەڵەم دەدرێ؛ بەتایبەت ئازادیی هەڵبژاردن و بڕیاردان، ئەوە نەک هەر بۆ ژنان بەڵکو بەشتێکی پێویستی دەزانێ لە پێناو پێشکەوتنی کۆمەڵگادا. میل لە کتێبی لەمەڕ ئازادیدا دەڵێ: "دەزگا کۆمەڵاتییەکانی چاکسازی بەڕادە

و ژمارەی کەسەکان، هەن. بەڵام دەبێ ئەوەمان لێ روون بێ کە بزاڤی ئازادی، تاقانە ناوەندی خۆڕاگریی چاکسازی و ریفۆرمە.(٤٨)

پەرەپێدان بە پەروەردە، رزگارکردنی ئافرەتان لە کۆتوبەندی کاری بەزۆردا سەپاو لە ماڵێدا و رەخساندنی دەرفەت و بواری کار بۆیان؛ گەلێک قازانج و بەرژەوەندیی بۆ کۆمەڵگا لێدەکەوێتەوە، چونکی دەبێتە هۆی چوونە سەرەوەی ئاستی توانا ئاوەزەی و عەقڵییەکان بۆ هاتنە ئارای خزمەتگوزارییە مەزنەکانی مرۆڤ.(٤٩)

وێڕای ئەوە، میل باوەڕی وایە کە بەسەرنجدان بە چوونە سەرێی بەهرە وەرگرتن لە توانا عەقڵییەکان کە ئەویش دەرەنجامی ئازادیی ژنانە لە کاری زانستوانی و هەڵبژادنی ئازادانەی کاروباردا، نەک هەر کاریگەرییەکی پرپایەخی لەسەر پیاوان دەبێ بەڵکو هاوکاریی ژنان و پیاوان بە شێوەی یەکسان و هەڤرکێی ئەوان پێکەوە دەبێتە هۆی گەشە و پێشکەوتنیان. میل باوەڕی وایە کە ئەگەر پیاوان کەمتر خۆیان بەکاروباری دەرەوەی ئەو چالاکییانەوە خەریک بکەن کە تایبەت بە خۆیانن و زۆرینەی کاتی خۆیان لە ماڵەوە تێپەڕ بکەن، ژیان روخسارێکی گرینگتر و جوانتر بەخۆوە دەگرێ و هەروەها کاریگەریی هاوسەرەکانیشیان بەسەریانەوە زیاتر دەبێ. هەروەها لەسەر ئەم روانگەیەی کەپێیوایە هەرکەس یا هەر کۆمەڵگایەک مل بۆ چاکسازیی رانەکێشێ و ریفۆرم قبوولّ نەکا، بەرەو فەساد و لەناوچوون دەچێ؛ میل دەڵێ: هاوژینیی بەردەوام لەگەڵ ژنێکی نەزان و گێژ؛ مێردەکەی تووشی خەیانەت و فەساد دەکا، تەنانەت ئەگەر مێردەکەی رۆشنبیریش بێت. میل لەم پەیوەندییەدا دەپرسێ کە؛ چۆناوچۆن لە سیستەمێکدا سەرنج بەهەموو کاروبارەکان دەدرێت و پیاو بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی هزریی خۆی لە کۆمەڵگادا خاوەنی ئازادییە و سەربەستە، بەڵام لەبەرامبەردا ژن بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، گەلێک کێشە و ئاستەنگی لەپێشە؟ ئەم نەبوونی هاوسەنگییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ژن خۆ لەبەر وزە و توانا هزرییەکانی پیاو رانەگرێ و بە هۆی نزم بوونی ئاستی خوێندەواری و کۆتوبەندی دیکە؛ ملکەچی داخوازییە رۆشنبیرییەکانی پیاو بێ. ئەم جیاوازی



خستنە و نەبوونی یەکسانییەی نێوان ژن و پیاو، خەسار بەتاک و کۆمەڵگا دەگەیەنێ و ئەگەر چاکسازی لەم شێوە روانگە و تێڕوانینە بە نیسبەت مافی کەسەکانەوە نەکرێ، تاک و خێزان و کۆمەڵگا تێدا دەچن. میل لە درێژەی بۆچوونەکانیدا دەڵێ: "بەو کاریگەرییانەی کە لە هەموو ماڵێکدا هەیە، ئایا بۆ ئەوە دەبێ سەرت لەو حکوومەتە سوڕ بمێنێ کە ئاستی تێگەیشتنی بەڕێوەبەرەکانی زۆر لەسەرێ نییە و لە باری هۆشیاری و ئەخلاق و ئەدگارەوە خاوەنی تایبەتمەندی و خەسڵەتی سەرنجڕاکێش و بەرچاونین؟(٥٠)

## دادپەروەری

یەکەم: رێگە چارەی جان جاک رۆسۆ بۆ پێشگرتن لە کاریگەریی خراپی ژنان ئەوەبوو کە تەنانەت لە ماڵیشدا لە پیاوانیان هەولاوێرن؛ دیارە پێویست بەوە ناکا بڵێین میل بە تەواوەتی دژی ئەم بۆچوونە بوو.

بەڕای میل؛ دۆخی ژێردەستەیی و ملکەچیی ژنان و بێبەری کردنیان لە بوار و دەرفەتەکانی کارکردن، بە هۆکار و هێزێکی بەردەوام بۆ دواکەوتنی کۆمەڵگا لەقەڵەم دەدرێ. ئەو باوەڕی پتەوی بەوە هەبوو کە ئەگەر ژنان ئازاد و سەربەست و دەست ئاوەڵابن، دەرەنجامی کار و چالاکییەکان شتێکی سەرسوڕهێنەر دەبێ و کۆمەڵگا لەم دواکەوتووییەی رزگار دەبێت و پێشکەوتنێکی بەرچاو بەخۆوە دەبینێ .

دووهەم: مەسەلەیەکی دیکەی کە ستوارت میل لە باسەکانیدا گرینگییەکی لە ڕادەبەردەری پێداوە؛ مەسەلەی دادپەروەرییە کە باوەڕوایە تەنیا لە هەبوونی ئازادیدا وەدی دێ و دەستەبەر دەبێ. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە؛ هەڵسوکەوتی دادپەروەرانە لە کۆمەڵگادا هیچی لە ئازادی کەمتر نییە و هەردوو بابەت، واتە ئازادی و دادپەروەری، نەک هەر بۆ ژنان بەڵکو بەگشتی بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ ئێجگار پێویستن. میل زیاتر لە دوایین بەشی کتێبی سوودگەراییدا بەتێروتەسەلی لەسەر دادپەروەری دواوە. ئەو لەوێدا واتای بنەڕەتی و کاکڵی مانای دادپەروەری لەوەدا دەبینێ کە: "بەو جۆرە

لەگەڵ خەڵک  هەڵسوکەوت بکەن کە بۆ خۆتان دەتانهەوێ واتان لەگەڵ بجووڵێنەوە". ئەو دەری دەخا کە هۆکاری لێک جیاوازیی کۆمەڵگاکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان روانگەیەکی جیاوازیان بۆ چەمک و واتای دادپەروەری هەیە و لە  بواری لادان لە دادپەروەریشدا خاوەنی پێوەرگەلی خۆیانن. هەر وەکی لە بەشی چوارەمی هەر ئەم کتێبەی بەر دەستتاندا، باسکراوە؛ دادپەروەری لە روانگەی ئەرەستۆوە ئەوەیە کە: تاکەکان هەر لە هاووڵاتییانەوە بگرە هەتا ژنان و ئامرازداران (خاوەن کەرەسە و ئامراز) و کۆیلەکان بە پێی ئەو زات و جەوهەرەی هەیانە؛ ئەرک و بەرپرسیارەتیی جیاوازیان لە کۆمەڵگادا پێ سپێردراوە و بەپێی شوێن و بەرپرسیارەتییە کۆمەڵایەتییەکانیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێ. روانگەی ئەرەستۆ بۆ واتا و چەمکی دادپەروەریی؛ بەلای ستوارت میلەوە؛ نموونەگەلێکی دادپەروەریین کە جێی شەرمەزارین. ئەو لێبراوانە دژایەتیی خۆی لە بەرامبەر ئەو باوەڕەدا دەردەبڕێ کە دەڵێ: "وای دادەنێین هەموو کەس لە کۆمەڵگادا مافی یەکسانیان هەیە و وەک یەک هەڵسوکەوتیان دەگەڵ دەکرێ، مەگەر ئەوەی کە بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی ئەو شتانەی لێ زەوت بکا.[٥١] چونکی ئەو شتەی کە یاسا لە واتا و چەمکە جۆراوجۆرەکانی بەرژەوەندیی کۆمەڵگای وەریدەگرێ لە راستیدا هەمووی پاساودەری بێداری و نایەکسانیی سیستەمەکانی کۆمەڵگان ئەو  کۆمەڵگایانەی سیستەمەکانی کۆیلەداری و ئایینی ئالاهەڵگریانن. بێدادی و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان بە ناوی بەرژەوەندیی [کۆمەڵ] نەک بە قازانجی نین بەڵکو بەپێچەوانەوە ئاکار و کردەیەکی زاڵمانەن. بە هەرحاڵ " خەڵک لە بیریان دەچێتەوە کە ئەوان بە دەستکردەی نادادپەروەرانەوە کە لەژێر ناوی دادپەروەری و بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتیدا دەکرێن، دەناڵێنن و ئازار دەچێژن.[٥٢]  نموونەیەکی بەرچاوی ئەوەش؛ ژێرچەپۆکەیی ئافرەتانە لە کۆمەڵگادا و رۆسۆش نموونەیەکی دیکەی ئەم جۆرە باوەڕ و تێڕوانینەیە. ئەگەرچی لە شارستانیەتی نوێی ئێستادا هەست بە نایەکسانیی ژن و پیاو و کاریگەریی خراپی ئەم نایەکسانییە ناکرێ، (بۆ وێنە) کۆیلەکانی نێومالێ



کە یۆنانییەکان وەک خەڵکێکی ئازاد؛ کەڵکیان لەوان وەردەگرت نابینرێن[٥٣]. بەڵام میل ئەم جۆرە کۆیلایەتییەی لە شارستانیەتی نوێدا دیتەوە کە ئەویش جۆرێک کۆت و بەندی نائاساییە. ئەو دەڵێ: "زەماوەندکردن کۆت و بەندێکی واقیعی و ناوسراوی نێو یاساکانی ئێمەیە، هەڵبەت بەڕواڵەت هیچ لەمپەرێکی یاسایی لە گۆڕێدانییە، بێجگە لەو قەرەواشانەی لە ماڵێدان.[٥٤] بەهەرحاڵ، پێگەی نایەکسانی ژنان لە کۆمەڵگادا، وەکو نەبوونی مافی دەنگدان لە رابردوودا؛ یەکسەر بە شتێکی سروشتی لە قەڵەم دراوە و میل لەم پەیوەندییەدا دەپرسێ: مەگەر هەر کەسێکی دەسەڵاتخواز کە بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵ دەبێ ناڵێ ئەم دەسەڵاتە دەسەڵاتێکی "سروشتییە"؟[٥٥] دیارە زۆربەی فەیلەسووفان و راهێنەرانی رۆشنبیری جیهانی کۆن، وەک ئەرەستۆ کە لەوە دڵنیا بوون کە کۆیلەداری "مافی سروشتی" خاوەن کۆیلەیە و بەگزادە و ئاغاوەتانیش کە ئاغایەتیکردنیان بەسەر قەرەوە رەشاییدا بە "مافی سروشتیی" خۆیان دەزانی و هەروەها ئەوەی کە خۆبەزۆرزانانی رەگەزپەرست کە باوەڕیان وایە؛ دەستڕۆیشتووی بەهێز بە شێوەی سروشتی مافی دەسەڵاتدارێتیی بەسەر هەژار و بێ هێزدا هەیە، هەمووی ئەوانە، لەژێر ناوی "مافی سروشتی" دا زوڵم و زۆری لەڕادە بەردەریان کردووە.

ئەوەی سەیر و جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە کە ژنان ژێر چەپۆکەی پیاوان بوونە و هەتا ئێستا کە ئەم نەریتە بووەتە واقیعێکی جیهانی و وڵاتی تەنیوەتەوە، کۆمەڵگاکان هەنووکە راشکاوانە و لێبڕاوانە رادەگەیەنن کە مافی دەسەڵاتی پیاو بەسەر ژندا "مافێکی سروشتییە".

لێرەدا بایەخ و سەرنجدانی ستوارت میل بە دەکارکردنی هەراوی وشەی "سروشتی" کە بۆ رەوایی بەخشین بە یاسا نایەکسانەکان کەڵکی لێوەردەگیردرێ؛ زۆر جێی لێ وردبوونەوەیە. ئەو لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: "ئەوەی کە بە "سروشتی بوون" لە قەڵەم دەدرێ، لەڕاستیدا ئامرازێکی گشتییە بۆ خستنەڕووی ناسروشتی بوونی واقیعەکان.[٥٦]

بەگشتی، لەوکاتەوە ئەو باوەڕمەندبوو بەوەی کە کۆمەڵگای یەکسان بیچم و فۆرمی بەرز و پێگەیشتووی کۆمەڵگاکانە، ئیتر بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی خەبات بکا دژی ئەو ئیدعا گشتییانەی کە نایەکسانییە رەگەزییەکانیان وەک شتێکی سروشتی دەنواند. میل ناچار بوو بۆ باشتر خستنەڕووی بۆچوونەکەی خۆی بە شێوەیەکی دڵخواز لەسەر قبووڵ کردنی بنەمای "هەڵسوکەوتی دادپەروەرانە" بۆ وەدی هاتنی یەکسانیی ژنان؛ ئاماژە بەدووخاڵ بکا.

یەکەم: میل راست بە پێچەوانەی ئەم روانگەیە دەچێتە پێشێ کە دەڵێ: "ئەو مەسەلەیەی ئێمە دەگەڵی رووبەڕووین مەسەلەیەکە کە پێیان وایە؛ ژنان خاوەنی ئەو لێوەشاوەیی و توانایە نین کە بگەن بە بابەتگەلی هزری و بەڵگاندنی لۆژیکیانە."[٥٧] روانگەیەک کە هەر لە کۆنەوە لە کۆمەڵگاکاندا باو بوو و بۆ سەلماندنی ئەم تیۆری و باوەڕە بەکاریان دەهێنا کە (دەیویست) ژنان ژنان بە شێوەی سروشتی بە بن دەست، بێ دەسەڵات و لەڕادەبەدەر هەستەوەر و کەم عەقڵ پێناسە بکا.

میل بۆ دەربڕینی دژبەریی خۆی (دژی ئەم بۆچوونە) گەلێک هۆکار و بەڵگەی هێنایەگۆڕێ و سەلماندی کە هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر بۆ ئەم بۆچوونە لە گۆڕێدا نییە و تەواوی ئەو ئیستدلالگەلە هەڵە و بێ بنەمان.

دووهەم: میل دەبێ بۆ هەموو ئەوانەی خۆیان بە لایەنگری رێبازی سوود خوازی دەزانن، بسەلمێنێ کە هەڵسوکەوتی نایەکسان و چەوسێنەرانە لەگەڵ ژنان بە قازانج و بەرژەوەندیی کۆمەڵگانییە.

لە باسی یەکەمدا میل وێڕای ئەوەی کە دەبوایە ئەو بیروڕا گشتییەی ئەم بۆچوونەی قبووڵ کردووە بێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە بۆچوونی گۆڕین هەڵەیە؛ دەبوایە بە پەرچەکرداری توند و رادیکاڵانەی خۆی قەناعەت بە زۆربەی ئەو رۆشنبیرانەی سەدەی نۆزدەهەمیش بێنێ کە دژی دۆکترینی ژینگەخوازی Environmentalism بوون، چونکی زۆربەی رۆشنبیرانی هاوچەرخی میل ئەوەیان لەبەرچاو بوو کە تیۆرداریژەرانی فەرەنسی وەک هێلڤێتیوس Helvetius، و هۆڵباخ Holbach، بەڵگە و هۆکاری زۆر



زێدەرۆیانەیان خستۆتەڕوو لەسەر ئەوەی کە بەپێی تیۆریی ژینگەخوازی؛ رەوشت و توانا عەقڵی و زەینییەکانی مرۆڤ بەپێی ژینگەکەیان بیچم دەگرن.

ستوارت میل لە دژبەریی لەگەڵ رۆشنبیرانی سەردەمی خۆی کە سەرچاوەی جیاوازییەکانی هەڵسوکەوتی پیاو و ژن و توانا هزری و ئاوەزییەکانی ئەوانیان دەگەڕاندەوە بۆ سروشتی ژن و پیاو؛ هەروەها لە هاودەنگی و هاوڕایی لەگەڵ تیۆرداریژانی چاخی رۆشنگەری، باوەڕی بەوە بوو کە جیاوازییەکانی هەڵسوکەوتی ژن و پیاو لە کۆمەڵگاکاندا کە هەر لە منداڵییەوە بەسەریاندا سەپاوە، بەستراوتەوە بە جۆری ژینگەکەیان و شێوازی پەروەردە و فێرکردنیان. بەواتایەکی دیکە؛ ئەم جیاوازییانە وەردەگیردرێن (اکتسابی) و لە جەوهەر و زاتی مرۆڤ، (چ ژن، چ پیاو)نین. ئەو هەروەها لە وتاری "یەکسانیی رەگەزەکاندا"، بەتوندی "دژایەتی دەکا لەگەڵ هەرچەشنە جیاوازی خستن و نایەکسانییەکی زاتی لە نێوان ژن و پیاودا، جیا لە هێزی جەستەیی و شانۆ باهۆ، کە لەویش بەگومان بوو.[٥٨] بەڵام میل لەدواییدا لەو هەڵوێستە رادیکاڵا نەیەی خۆی دابەزی و گوتی؛ هیچ هۆیەک بۆ جیاوازیی ئەخلاقی یا توانایی هزریی نێوان ژن و پیاو لەئارادا نییە؛ ئەگەرچی لەوانەیە هێندێ لەو جیاوازییانە لەگۆڕێشدابن.[٥٩] ئەو بۆیە لەم بۆچوونە رادیکاڵەی خۆی هاتە خوارێ، چونکی دژی دەمارگرژی و دۆگماتیزم بوو؛ لەبەر ئەوەی کە لێبڕاوانە گوتبووی هیچ بەڵگە و هۆیەک نییە بۆ سەلماندنی گریمانەی سروشت خوازانە لەسەر ژن* و مێرد. لە حاڵێکدا میل خۆی دەڵێ: "ئەگەر بەدژایەتی لەگەڵ ئەم روانگەیەش؛ بگوترێ کە هیچ هۆیەک بۆ جیاوازیی زاتیی ژن و پیاو لەگۆڕێدانییە، بڵێین کە ئەم دژبەرییەش خۆی جۆرە گریمانەیەکە،[٦٠] بەڵام هەرچی بێ، دەبێ سەرنج بدەینە ئەم خاڵە کە بیروبۆچوون و بنەما و پرنسیپەکانی رۆشنبیرانی هاوچەرخی میل لەسەر سروشت و چۆنایەتییە سروشتییەکانی ژن؛ بۆ

* گریمانەی سروشت خوازانە: مەبەست ئەو گریمانەیەکە هەموو جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو بەشتێکی سروشتی و لە سروشتەوە دەزانێ. (وەرگێڕی کوردی)

ماوەیەکی زەمەنیی ئێجگار دووردرێژ لە کۆمەڵگاکاندا برەویان هەبوو ئێستاشی دەگەڵ بێ لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا ئەم بیروڕایانە هەر هەن.

ستوارت میل ئاماژە بە چەمک و تێگەیشتنە جیاوازەکان لە "سروشتی ژن" دەکات و باوەڕی وایە کە ئەم چەمکانە لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی دیکە لە گۆڕان دان و لێک جیاوازن. بۆ وێنە ژنان لە کولتووری رۆژهەڵاتیدا "بە شێوەی سروشتی" ورووژێنەر (شهوت انگیز)ن، لە بریتانیا (بە شێوەی سروشتی) سارد و سڕ و خۆڕاگرن و لە حاڵێکدا لە فەڕەنسا ژنان (بە شێوە سروشتی) راڕایی و وزای وازیین.

دیارە ئەو روانگە جیاوازانە دەرحەق بە ژنان؛ بەسن بۆ ئەوەی باوەڕە چەقبەستووەکانی ئەوان بەرێتە ژێر پرسیار و لەرزۆکیان بکا. هیچ گومانێک لەوەدانییە کە تێڕوانینە جیاوازەکان دەرحەق بە (سروشتی ژن) بە پێی کولتووری کۆمەڵگاکان خروانەتەڕوو (لە هیچ کام لەوانیشدا، باسێکی ئەقڵانی لەسەر نزیکایەتیی سروشتیی رەگەزەکان لەگەڵ ئەرکەکانیان لە ئارادا نییە.)[٦١] بەواتایەکی سادەتر، کولتووری جیاوازی کۆمەڵگاکان، خاوەنی روانگەی جیاوازن لەسەر سروشتی ژن و رۆڵ و ئەرکەکانیان لە کۆمەڵگادا.

میل لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا جەختی کردۆتەوە کە (ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا کە ژنان بەبێ پیاوان و پیاوان بەبێ ژنان، رۆڵ و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیان لە ئەستۆیە و کەسێک ئەو شتە، بە بەڵگەیەک لەسەر جیاوازیی سروشتیی ژنان لە قەڵەم بدا؛ من وەدرۆی دەخەمەوە و (دەڵێم وانییە) بەڵام ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا کە پیاوان بەسەر ژناندا زاڵ نین، وەها ئیدعایەک بێتەگۆڕێ؛ دەبێ هەڵویستە لەسەر وەها روانگەیەک بکەین و "تێی بفکرین".[٦٢] چونکی هەتا ئەوکاتەی هەلومەرجی یەکسان لە کۆمەڵگادا بۆ ژن و پیاو نەڕەخسێ، هیچ کەس ناتوانێ ئیدعای ئەوە بکا، کە جیاوازییەکانی نێوان پیاو و ژنان سروشتین. بەڵام هەبوونی ئەم جیاوازییە کاتێک بۆ هەر دوو رەگەزەکە جیاوازییەکی سروشتییە؛ کە ئەوان وەکو یەک، بەیەکسانی و ئازادی دەرفەت و کەرەستەی پێویستیان لەبەردەست بێ بۆ خۆپێگەیاندن و



گەشەپێدان بە هزر و توانا عەقڵییەکانیان و پەروەردەکردنی خۆیان. بەو پێیە ستوارت میل بەتوندی دژی ئەرک وەخۆگریی lism functiona سروشتیی ئافرەتانە کە لە فەلسەفەی ئەرەستۆ و رۆسۆدا هەیە.

ستوارت میل بۆ پێشان دانی کاریگەریی ژینگە و کۆمەڵگا لەسەر مرۆڤ بەگشتی و لەسەر ژنان بەتایبەتی، کەڵک لە خوازە (میتافۆر) وەردەگرێ و سروشتی مرۆڤ بە درەختێک دەشوبهێنێ و لە کتێبی لەمەڕ ئازادیدا دەنووسێ: (سروشتی مرۆڤ وەک درەختێک نییە کە بەپێی پلان و گەڵاڵە سازکرابێ، بۆ ئەوەی ئەو شتە بەرێوەبەرێ کە بۆی سازکراوە، بەڵکو وەک درەختێکە، کە دەبێ لە هەموولاوە بەپێی جەوهەر و توانا دەروونی (هەناوەکی)یەکانی خۆی هەڵ بدا و گەشە بکا. بەو پێیە لێکدانەوە و خوێندنەوەی ئەو بۆ ژن ئەو بوونەوەرەیە کە بەپێی گەشە و پێشکەوتن لە ژینگەیەکی ئازاد و گونجاودا وەکو درەختێک وەبەر دێ. لە بەرامبەردا، هەڵدان و گەورەبوونی دەرەختێک لە شوێنێکی نارێک و کەشێکی نالەباردا، (کە نیوەی هەڵم دایگرتبێ و نیوەشی بەفر داپۆشی بێ) بەڕەوتێکی نائاسایی دەزانێ[٦٣].

بەو پێیە سەرکوتی ژنان و پێ شێل کردنی مافەکانیان و هەروەها راگرتنی ئەوان وەک گیانلەبەرێکی نیوە گەشەکردووی نیوە گەورە بوو لە پێناو بەرژەوەندیی پیاواندا، کارێکی تەواو نائاساییە. لە روانگەی میلەوە، ئەو کەسانەی کە لە تەمەنی سەرێدا، دەگەڵ گرفتی زۆر رووبەڕوون، ئەو کچ و کوڕانەبوون کە لە کۆمەڵگادا شوێنی پەروەردە و بەرپرسیارەتیی جیاوازیان بووە و بەو پێیە دەکرێ بەو ئاکامە بگەین کە زۆربەی چۆنایەتییە ئەخلاقییەکان و ئەم کەمتواناییە زەینی و عەقڵییانەی لە هەڵسوکەوت و کەسایەتیی ژناندا دەرکەوتووە، دەگەڕێتەوە بۆ رەگەز و ژینگەی پەروەردەکرانیان کە بووەتە هۆی ئەوەی کە بە درێژایی مێژوو مافەکانیان پێ شێل بکرێن و داوا رەواکانیان سەرکوت بکرێن.

رۆسۆ توانا و وزەی پراکتیکی و عەقڵیی ژنانی بەواقیعێکی سروشتی دەزانی و تەنیا گرینگی بە شێوازێک دابوو کە کچان بەپێی ئەو پەروەردە

بکرێن و ڕاهێندرێن بۆ ئەوەی وردەکارییەکانی نێومالّ ڕاپەڕێنن، بەلاّم لەبەرامبەردا، کوڕان فێری تەکنیک و زانستەکان (بەواتاکلاسیکییەکەی) دەکران. میل بەپێچەوانەی ڕۆسۆ خوازیاری ئەوەبوو پەروەردەی یەکسان و هەلومەرجی لە باری کارکردنی وەک پیاوان بۆ ژنان برەخسێ. ئەو دەی گوت هەڵەکانی ژنێک وەکو هەڵەکانی پیاوێکی خۆپێگەیاندوو وان، کەسێک کە لەبەر نەزانینی بنەما و پرەنسیپەکانی زانستی گشتی و نەبوونی توانایی بۆ تێگەیشتن لە شتە ئابستراکت و ڕەبەنەکان و ناسینی چەمکە دژوارەکانی تیۆرداڕێژان، تووشی ئازار دەبێ.[٦٤] بەواتایەکی دیکە؛ مەبەستی میل ئەوەیەکە؛ چونکی ژنان دەستیان بە فێربوونی زانستە گشتییەکان ڕاناگا، ڕاست بەو جۆرە لەگەڵ شتە ئابستراکت و ڕەبەنەکان ڕووبەڕوو دەبنەوە کە لەوەها هەلومەرجێکدا پیاوان ڕووبەڕووی ئەو شتانە دەبنەوە. دیارە کابرایەکی وەک ڕۆسۆ نایهەوێ زۆرسەرنج بداتە ئەو ژینگە جۆراوجۆرانەی کە ژن و پیاو لەوێدا بە شێوەی جیاواز پەروەردەکراون. بۆیەش ناچارە جیاوازییەکانی نێوانیان بە جیاوازییەکی زاتی و سروشتی لەقەڵەم بدا و بڵێ کە یەکێک لەم دوو ڕەگەزە (پیاو) لە باری توانایی هزرییەوە لە ڕەگەزەکەی تر (ژن) بەهێزترە.

ستوارت میل ئەو قسەزاڵەی سەردەمی سەدەی نۆزدەی قبووڵ نییە کە دەڵێ: ژنان لە باری ئەخلاقییەوە لە پیاوان سەرترن و ئەوەش بە شێوەی زاتی پوانێکە بۆ ژنان [هەر بۆیەش میل] لەبەرپەرچی ئەم قسیەدا دەڵێ: ئەو قسەیە ڕاست بەڕادەی ئەو ئیدعایە بێ ماناو بێ ناوەڕۆکە کە پێیوایە ژنان لە ڕووی عەقڵییەوە ئەوەیان تێدایە کە ژێر دەستە و گوێڕایەڵی پیاوان بن.[٦٥] میل باوەڕی وابوو کە هەردووکیان (ژن و پیاو) توانایی وەک یەکیان هەیە و مەزنتربوون لە باری ئەخلاقییەوە واتە ڕەوشت پاکی، ((دەسکەوت و بەروبووی زانست و پەروەردەیە))، بەلاّم چۆنایەتیی خاکەڕایی و بە ئەخلاقیی ژنانیان بەپێی بەستراوەییان بە پیاوانەوە لێکدەدایەوە. ئەو لە کتێبی کۆیلەکردنی ژنانـدا دەنووسێ: (مـن سـەرم لـەگـەمـژەیـی و ناتێگەیشتوویی خەڵکی جیهان کە خوێندەوارەکانیش لەخۆدەگرێ سوڕماوە،



کە بۆچی ئەوانە کاریگەرێتیی دۆخە کۆمەڵایەتییەکانیان وەلاناوە و بە هەڵسوکەوتێکی پەسن بێژانە کەوتوونەتە تاریف و پێداهەڵگوتن بە ئەخلاق و سروشتی ژنان.[٦٦]

هەروەکی لە پێشدا دیتمان، ستوارت میل بەرپەرچی زۆربەی بیرمەند و فەیلەسووفانی وەک ئەرەستۆ و ڕۆسۆی دەدایە و دژایەتیی دەکردن. لەبەر ئەوەی کە ئەوان باوەڕیان بەوە بوو کە ڕەوشت و ئەخلاقی ژنان لەباری چۆنایەتییەوە لەهی پیاوان جیاوازە. میل هەر لەو کاتەوەوە کە وتاری بۆ بلاڤۆکی westminster Review دەنووسی، هێرشی کردە سەر ئەو ڕوانگە و پێودانگە ئەخلاقییانەی کە بەپێی ڕەگەز؛ داوەرییان لەسەر چاکی و خراپیی خەڵک دەکرد و بڕیاریان دەدا. ئەو پێی وابوو کە بیروباوەڕەکانی ئەوان تایبەت بە خۆیانن و بە هۆی پیاوبوونیان هێندێ بەهای جیاواز و جوێ لە ئەوانی دیکەیان بۆ خۆیان لەبەرچاوگرتووە و تەرخانیان کردووە، کەواتە، (ئەوان سەربەخۆیی، سەربەستی و ئازادییان بۆ پیاو بەشیاو زانیوە نەوەک بۆ ژنان، هەروەها خەسڵەت و ئەدگاری باشیان داوەتە پاڵ پیاوان، لە حاڵێکدا بەشتێکی خراپ و جێی لۆمە و سەرکۆنەی دەزانن کە ژنان ئەو شتانەیان هەبێ. بۆ وێنە، ئەم فەیلەسووفانە هەر پیاوێک دلێر و بوێر نەبێ بەلایانەوە سووک و بێ نرخە، لە حاڵێکدا ڕێز بۆ ترسنۆکیی ژنان دادەنێن و وەک خەسڵەتی باش لێی دەڕوانن و لە ڕوانگەی ئەوانەوە ژنی بە ئەمەگ و دڵۆڤان ئەو ژنەیە کە: تەواو لەژێر دەسەلاّتی مێردەکەی و لە پەنای ئەودا هەست بەهێمنی و ئاسوودەیی بکات و لە چێژ وەرگرتن و شادمانییەکاندا خۆی بە قەرزاباری ئەو بزانێ و هەروەها بۆ هەر بڕیارێک و دەربڕینی هەر بیروباوەڕێک یا بۆ هەر چەشنە داهێنان یا پێشنیاری ڕێگە چارەیەک چاو لەدەست و گوێڕایەڵی ئامۆژگاری و نسحەتەکانی مێردەکەی بێ. بەلاّم ئەگەر ژنێک بیەوێ هەر چەشنە مافێکی پاوانخوازانە و دانسقە کە پیاوان بۆ خۆیانیان تەرخانکردووە؛ پێ شێلبکا، یان ئەگەر بیەوێ قازانج و سوودی، بۆ خۆی و خەڵکی دونیا هەبێ و کۆیلە و دیلی مێردەکەی نەبێ، ئەوادەکەوێتە بەرلۆمە و لەقەم و سەرکۆنەی خەڵک.[٦٧]

جۆن ستوارت میل لەبەرامبەر ئەو بیرۆکە واقیعییە جیهانییەدا، واتە: مافی یەکسان و وەک یەک؛ تایبەتە بە ژن و پیاو، هەروەها لە وەڵامی نامەیەکی تۆماس کارلایل thomas carlyle دا کە باوەڕی بەوە بوو؛ باشترین کەسەکانی دوو رەگەزەکە؛ تێکەڵاوییەکن لە بەرزترین چۆنێتی (کیفیت) و توخمی (عنصر) نێر و مێ؛ دەڵێ: (ئایا بە شێوەی واقیعی و راستەقینە جیاوازییەک هەیە لە نێوان رەوشت و توخمی بەرزی نێر و مێ)؟[٦٨] وێناچێ مەبەستی لەم بارەیەوە ئەوە بێ کە ئەخلاق و مەزناهیی (فەزیلەت)ی هەردوو رەگەزەکە بکاتە یەک. بەهەرحاڵ میل، یەکەمین و گرینگترین فەیلەسووفێکە، کە لەسەر بەختیاری و بە کەڵک بوونی یەکسانیی ژن و پیاو، دواوە.

میل لە ئەنجامی هەوڵەکانیدا بۆ بە تاڵکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی ئەو پرەنسیپ و رێسا زاڵانەی کە بە شێوەی زاتی و جەوهەری ژنیان لەبەرامبەر پیاودا دەکردە بوونەوەرێکی ژێردەست (زەعیفە) و رەگەزی پلەدوو؛ هەستیکرد دەبێ کەڵک لە دەروونزانی وەربگیردرێ؛ چونکی زانستی بایۆلۆژی مێشک و زەینی کۆمەڵگای ئەو کاتی داگیرکردبوو. بەڕای میل ئەوە جێی داخ بوو کە هیچ گرینگی و سەرنجێکی نەدەدا بەکاریگەریی ژینگە لەسەر بیچم گرتنی مرۆڤ.[٦٩] ئەم تیۆرییە وای لێهات باوەڕ بە زانستی بایۆلۆژیی (کە پێی وابوو دەتوانێ وەڵامدەری هەموو شتێ بێ) گۆڕی و هێنایە سەر بۆچوونەکەی هێلڤێتیان Helvetian کەپێی وابوو: (پەروەردە و فێرکردن هەموو شتێکیان لە دەست دێ). ئاوگۆست کۆنت August conte کە رەقیبی میل بوو، بۆ ناسین و تێگەیشتن لە بۆچوونی ژینگەخوازێ: توانی لەم هەڤرکێیەدا سەرکەوێ و گەلێک بەڵگە و هۆکاری ژینگەیی بخاتەڕوو سەبارەت بە کاریگەریی ژینگە لەسەر بنەما و پێکهاتەی رەوشت و ئاکاری ژنان. ساڵی ١٨٤٣ میل و کۆنت دەستیان کرد بە نامە گۆڕینەوەو ئەوەش بووە هۆی بیچم گرتنی بەشی هەرەگرینگی بیر و باوەڕی میل لەمەڕ ئازادی و رزگاریی ژنان.[٧٠] کۆنت لەسەر ئەم باوەڕەبوو کە زانستی فیزیا بە تەنێ هێز و توانای چارەسەرکردنی گرفتەکانی مرۆڤی نییە، لەبەر



ئەوەی کە ئەم کێشە و گرفتانە دەبێ بەزانستی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکرێن. لە حاڵێکدا لایەنگرانی زانستی بایۆلۆژی لەمەوبەر بە شێوەی پراکتیک وەڵامە گرینگەکانی خۆیانیان ئامادەکردبوو، کەواتە کۆنت لەوە دڵنیا بوو کە (زانستی بایۆلۆژی بەوەندە رازی نەدەبوو کە ژن بە هۆی جەستەی دانسقەی خۆیەوە؛ بوونەوەرێکی کەمتواناو پلەدوویە و دەبێ لە خزمەتی رەگەزی لە خۆی مەزنتر (پیاو) دا بێ، لەبەر ئەوەی کە لایەنگرانی ئەم زانستە بە خستنەڕووی بۆچوونی هێرارشیی جۆرەکانی گیانلەبەر (انواع) و هەورەها بە لێک هەڵوەشاندنەوەی جەستە و زانسی توێکاریی لەش (علم تشریح) پێیان وایە لە نێو تەواوی گیانلەبەراندا بەتایبەتی مرۆڤ، رەگەزی مێینە کەمتواناتر و کەمترە لە رەگەزی نێرینە.[٧١] کۆنت بە دڵنیایی لە تیۆریی پێش دارڤینی per –Darvinian کە باوەڕی بە تاقانەیی جسناتی مرۆڤ بوو دەڵێ: (دیارە هەلومەرجی جەستەیی مرۆڤ وەک ئاناتۆمیی گیانلەبەرێک دەبێ بەسەر هەلومەرجەکانی دیکەدا زاڵ بێ. بەدڵنیاییەوە هەلومەرجە ژینگەییەکان ناتوانن ئێمە بکەن بەمرۆڤ یا سەگ یا مەیموون و تەنانەت دەسنیشانکردنی جۆری تایبەتیی مرۆڤ بەڕادەیەکی زۆر پەیوەندیی بەو بیروباوەڕانەوە هەیە.[٧٢] بەڵام هەروا سووک و هاسان نییە کە ژنان لەبەر بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی دەبنە ژێر چەپۆکەی پیاوان. زۆر بێ مانا و بێ جێیە گەرپێمان وابێ ئەو باوەڕە لە زانستی بایۆلۆژییەوە سەرچاوە دەگرێ کە لای وایە ئاناتۆمیی جەستەیی ژنان و لاوازبوونی جەستە و توانا هزری و ئاوەزییەکانیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بە شێوەی لۆژیکیانە ژێر دەست و گوێڕایەڵی پیاوان بن. کۆنت باوەڕی بە جیاوازیی لە ئاناتۆمیی جەستەیی ژناندا هەیە کە ئەو جیاوازییە لەلایەن سروشتەوە لەوپەڕی نیانی و ناسکیدا بۆ کار و بارێکی گرینگتری وەک دەربڕینی هەست و ئیحساس پێیان دراوە، بەڵام لەسەر ئەم باوەڕەیە کە ئەم بۆچوونەی کە لە باری هزری و عەقڵییەوە ژنان بەکەمتر لە پیاوان دادەنێ و مافی هیچ جۆرە بڕیاردان و بەشداریکردن لە کاروباری سیاسیدا کە پێویستییان بە عەقڵ و بیروکردنەوەیە؛ بە ژنانی نادا؛ نەک هەر بە دژی

سروشتی دەزانێ بەڵکو پێیوایە بۆ ڕەوشی ژنان کۆمەڵگا شتێکی کارەساتبارە.

میل تێگەییبوو لەو جیاوازییە زۆرەی نێوان زانستی بایۆلۆژیی کۆنت کە لە خۆڕا بە هۆی بەرزە دەماخی و خۆپەرستی دەیویست بیسەپێنێ لەگەڵ ئەو شتەی خۆی سەبارەت بەکاریگەریی ژینگە دەیزانی و بە شێوەی هێمنانە و خاکەڕایانە وەلای دەنا.[٧٣] هەروەها میل بەتەواوی بێ باوەڕ بوو بەو بۆچوونە کە پێی وابوو زانستی بایۆلۆژی دەتوانێ هەموو کێشە و گرفتەکان چارەسەر بکا، هەرچەندە دەیگوت لەوانەیە ڕۆژێک دەرکەوێ کە لە نێوان مێشکی ژن و پیاودا؛ جیاوازیی سایکۆلۆژییانە هەیە. بەڵام میل لە وەڵامی کۆنتدا پێداگربوو لەسەر ئەوەی کە هێشتا زانستێکی وا لە گۆڕێدا نییە کە لێبڕاوانە پەیوەندیی نێوان هەڵسوکەوتە فیزیکییەکانی مێشک و توانا هزرییەکان بسەلمێنێ و پشت بەستن بەم باوەڕانە بەڕای ئەو، ساویلکەیی بوو. لەبەر ئەوەی کە ئەگەر قبووڵ بکەین کە درشتیی جەستەی پیاوان لە چاو ژنان نیشانەی درشتیی مێشکیانە، دەبێ باوەڕ بەوەش بێنین کە ئەو پیاوەی بە جەستە لە پیاوێکی دیکە زلتر و بەخۆوەترە، دەبێ بەوڕادەیەش لەو ژیرتر بێ. یا ئەوەی کە نەهەنگ و فیل دەبێ لە باری هۆشیاری و توانایی عەقڵی و هزرییەوە لە مرۆڤەکان ژیرتر بەتواناتربن"[٧٤].

میل لەوە دڵنیابوو کە هەتا ئەودەمەی ئەو هەلومەرجی ژینگەیی و ڕەچەڵەکییانە تاوتوێ نەکرێن کە لەسەر تاکەکان شوێندانەر و کاریگەرن، بەڵگە هێنانەوە بە شێوەی کۆنت لەسەر جیاوازیی نێوان دووڕەگەزی ژن و پیاو هیچ دەرەنجامێکی لێناکەوێتەوە. میل لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا دەڵێ: (دەبێ زانستی ژینگەناسی) پەرەبگرێ و گەشە بکا چونکی تەواوی ئەو کێشە و گرفتانەی کە لەمپەر و کۆسپن لەبەردەم ڕەوتی بیرکردنەوە و دەربڕینی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و چارەسەریی کێشەکان؛ لەوەڕا سەرچاوە دەگرن. ئەو زانستە (ژینگەناسی) کە زانستی کاریگەریی ژینگەیە لەسەر هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ، وەلانراوە.[٧٥] دیارە میل لەبەرامبەر گرفتەکانی بەڕێوەبردنی ئەم کارەدا، کەمتەرخەم نەبوو، لەبەر



ئەوەی تاقیگەی زانستی ژینگەخوازی لە گۆڕێدا نییە کە بکرێ لەوێوە بە دەرەنجامگەلی پراکتیکی بگەین. سەرەڕای تەواوی ئەو شتانە ئەو هاتبووە سەر ئەوەی کە نابێ ئەم بەشە لە زانست بەرەو ئاقارێک ببردرێ کە لۆژیک پشتگوێ بخرێ. ئەو لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: هێندێ باوەڕی بەرایی زانستی هەر لە ئاستی تیۆریدا ماونەتەوە و هیچ هەنگاوێکیان بۆ بە دەستهێنانی ئەزموونی پراکتیکی هەڵ نەهێناوەتەوە.[٧٦] میل لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: ئەگەر ئەم زانستە بەڕێکوپێکی بڕواتە پێشێ، دەریدەخا هیچ جۆرە جیاوازییەکی ئەخلاقی و هزری لەگۆڕێدا نییە کە لەسەر بنەما و هۆکاری زاتی یا سایکۆلۆژیکیی نێوان پیاو و ژن پێکهاتبێ.[٧٧]

کەواتە بە هۆی هەبوونی ئاستەنگی و کەموکوڕی لەو زانستەدا؛ نابێ لێبڕاوانە ئیدعای ئەوە بکرێ کە بە شێوەی ئەبستراکت (ڕەبەن) و عەقڵانی؛ ئەو توانا و هێزەیان نییە واقیعەکان دەستەبەربکەن. چونکی ئەم باوەڕانە بە هیچ چەشنێک پێشاندەر و دەربڕی ژێردەستەبوونی ژنان لە کۆمەڵگادا نین.

وێڕای ئەوەش؛ میل باوەڕی وایە کە ژنان وێڕای ئەوەی گوشارێکی دەمارگرژانەیان لەسەر بووە و فێربوونی زانست و زانیارییان لێ قەدەغەکراوە؛ هێشتا لە زۆربەی بوارەکاندا سەرکەوتنی سەرنجڕاکێشیان بەدەستهێناوە، لە حاڵێکدا ئێمە ئاگادارین کە بەجێی فێرکردنیان و گەیاندنیان بە ئاستی پسپۆڕی؛ بەردەوام کۆسپ و تەگەرەیان دەخەنە سەر ڕێگەیان بۆ ئەوەی بوار و دەرفەتەکانی کارکردن هەر لە دەستی پیاواندا بن.(٧٨) ئەو لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا، لەم بارەوە دەڵێ: هەر ئەوەی کە ئافرەتگەلێکی وەک خاتوو دۆستال Mmdestael و جۆرج ساند George sand لە بواری ئەدەبییەوە گەیشتنە کاروباری سیاسی، هۆکارێکی قەناعەت پێهێنەرە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ژنان ئەم لێوەشاوەیی و لێهاتوویییەیان هەیە کە لە ئاستی سەرەوەدا چالاکی بنوێنن. هەروەها ژنان بەکردەوە توانیبوویان لێهاتوویی خۆیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسیدا بسەلمێنن و (لێوەشاوەیی ژنان لە بواری حکوومەتداریدا بە کردەوە سەلمێنراوە و بەڵگەی پێویست لەو بوارەدا زۆرن).[٧٩] بۆ وێنە، ئەلیزابێت دێبۆرا Deborah

، جوانی خەڵکی ئارک joan of Arc، مارگاریتی ئۆسترالیالی mararet of و ئافرەتگەلێکی پسپۆڕی دیکەش کە لە ئاستی ڕێبەرایەتیدا کاروباری حکوومەتییان بەدەستەوە گرتبوو، توانیبووشیان کاروباری وڵات بە شێوەی سەرکەوتوانە ڕاپەڕێنن، ئەوە زۆر مەخسەرە و گاڵتەجاڕانەیە کە وێڕای هەبوونی ئەو هەموو بەڵگەیە دیسانیش ئیدعا بکرێ کە ژنان لێوەشاوەیی و لێهاتوویی بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسییان نییە. توانایی ژنان لە بەدەستەوەگرتنی کاروباری سیاسیدا ئەگەر لە توانایی پیاوان پتر نەبێ لانیکەم دەکرێ لە ئاستی ئەواندا بێ و یەکسان بێ دەگەڵ توانایی پیاوان.

میل لەسەر ئەم باوەڕەیە کە لە زۆربەی بوارەکانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، بەدەگمەن وەها بوارێک بۆ ژنان ڕەخساوە کە خۆیان لەوەی کە ئێستا هەن زیاتر و باشتر بنوێنن، تەنانەت لە هێندێ شوێندا ئێزنیان پێنەدراوە لە بواری کارکردندا بە نزمترین ویستەکانی خۆیان بگەن. چونکی داهێنان، خوڵقێنەری هەڵکەوتەیی و توانایی بۆ وەدەستهێنانی کاروبار لە ئاستی سەرەوەدا پێویستیی بەزانست و ئەزموونە (ئەوشتەی) کە بە شێوەی نەریتی ژنانیان لێ بێبەری کردووە، لەبەر ئەوەی کە بەمجۆرە دەیانویست ئەوان ناچاربن بۆ دابینکردنی پێداویستسییەکانی مێرد و منداڵەکانیان بە کار و ئیشگەلێکی ئاساییەوە خەریک بن پێویستیان بە داهێنان و هەڵکەوتەیی نەبوو.

ستوارت میل لە دوایین بەشی کتێبی ڕەسەنایەتیی قازانج (اصالت فایده؟) دا دەڵێ: خەڵک بەردەوام نیشانیانداوە کە نایان هەوێ جیاوازی خستن و بێدادی قبووڵ بکەن مەگەر ئەوەی ڕازی بکرێن بەوەی کە ئەم جیاوازی خستنانە لە پێناو بەرژەوەندیی کۆمەڵگادا بەڕێوە دەچن. بەوجۆرە میل خۆبە دەرووەست دەزانێ و دەڵێ کردەی جیاوازی دانان دژی ئافرەتان کە بەناوی بەرژەوەندییەوە، بەڕێوە دەچێ، نەک هیچ بنەمایەکی لۆژیکییانەی بۆ جیاوازیی لە نێوان ژن و پیاودا نییە، بەڵکو بەزیان و زەرەری ژنانی کۆمەڵگایە کە خوازیاری یەکسانین و کەوتوونەتە سەر ڕێگای پێشکەوتن و بەختەوەری. باسی دادپەروەری لە بیرۆکەی فمێنیستیی میلدا زۆر لە



مەسەلەی ئازادی دەچێ و کاکڵ و مۆتیڤی هەردووکیان چاکترکردنی جسناتی مرۆڤە. میل لە کۆیلەکردنی ژناندا باس لەوە دەکا کە: هەڵسوکەوتی نادادپەروەرانە دەگەڵ ژنان لە کۆمەڵگادا، و پێشگرتنیان لە وەدیهاتنی ویستەکانیان بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵاتی یاسایی و ڕەوا؛ هانیان دەدا ڕێگای شۆڕش و میتۆدگەلێکی کاولکارانە بگرنەبەر.[٨٠]

ئەو باوەڕی وایە کە ئەو ژنانەی لە ماڵێدا لە ژێر گوشاردان و (دەچەوسێندرێنەوە) و دەزانن مێردەکانیان ڕازی نین بەوەی کە ویستەکانیان وەدی بێ، بۆ وەدیهێنانی ویست و داخوازەکانیان پەنادەبەنە بەر فرت و فێڵ و گزەکردن. ئەوان هەتا ئەو کاتەی پیاوەکانیان لە ماڵێدا بڕیاردەربن، هیچ حەزیان لە باس و لێدوانی عەقڵانی و سیاسی نییە. بەڵام هەر دەگەڵ ئەوەی کە بایەخ بە کاریگەریی هێزی سیاسیی ژنان بدرێ، کاریگەریی ناڕاستەوخۆی کەمتەرخەمییەکانی مێردەکانیان لەسەر خۆشبژیویی خێزان؛ بەرتەسک دەبێتەوە. بەواتایەکی دیکە؛ ئەگەر ژنان بتوانن ڕاستەوخۆ لە کاروباری سیاسیدا بن، بەوڕادەیە کاریگەریی سیاسەتی پیاوان دەرهەق بە خۆیان؛ کەمتر دەکەنەوە.

ستوارت میل بە پێچەوانەی ڕۆسۆ، دەزانێ کە بێ بەشداریی ژنان لە مافی دیاریکردنی چارەنووسیاندا، خێزان هیچ سەرکەوتنێک بەخۆوە نابینێ؛ چونکی پێگەی کۆمەڵایەتیی ئەوان ئێزنیان پێنادا دەرفەت و بوارێکیان بۆ باشترکردنی ڕەوشی خێزان، بۆ بڕەخسێ.[٨١] بەڵام ئەگەر ئەوان بە ئامرازگەلی یاسایی بتوانن بەمافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان بگەن، ئەو کات دەتوانن کاریگەربن لەسەر ڕەوتی سیاسەتداڕێژی و بەڕێوەبەریی پیاوان. میل هەروەها دەڵێ: (ژنان لە قۆناغەکانی دواییدا بەرپرسیارانە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی نێوان خۆیان و ئەوانی دیکەدا و هەروەها بە قازانجی وڵات و مرۆڤایەتی کەڵک لەم ئامرازانە وەردەگرن و بەوجۆرە شێواز و فۆرمێکی باشتر بە بۆچوونەکانی خۆیان دەبەخشن).[٨٢] ئالێکسی دۆ تۆکڤێل Alexis de Tocqueville باوەڕی وابوو کە: (فێربوونی زانست و زانیاری؛ کاریگەریی بەرچاو و هەراوی دەبێ لەسەر بەشداریکردنی ژنان

لە کاروباری سیاسیدا و ئەگەر ئەوان [ژنان] بۆ وەدەسهێنانی مافە سیاسییەکانیان تێبکۆشن و لە کۆمەڵگادا مافی دەنگدان و بیرورا دەربڕینیان هەبێ و خۆیان لە کۆت و بەندی دەسەڵاتی مێرد رزگار بکەن؛ ئەو کات تێدەگەن کە ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانیان کە دەگەڵ رەوشی ئێستایان یەکناگرێتەوە دەگۆڕدرێن).[٨٣] کەواتە هەبوونی سەربەستی و مافی دەنگدان بۆ ئافرەتان قازانجی دوو بەرامبەر بە کۆمەڵگا دەگەیەنێ؛ لەبەر ئەوەی کە لەلایەکەوە ئاستی ئەو فیزلی و خۆپەرەستییەیان دادەبەزێنێ کە بە هۆی دژایەتیکردن لەگەڵ مێردەکانیان تووشی هاتوون، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرپرسیارەتییە کۆمەڵایەتییەکانیان.

جۆن ستوارت میلیش پێیوایە سڕینەوە و لابردنی ئەو یاسا نایەکسانانەی ئیزن بە پیاوان دەدەن ژنەکانیان بچەوسێننەوە بە قازانجی بەهاکانی خێزانە و لەسەر ئەم باوەڕەیە کە: (کۆمەڵگایەک لە دۆخی سروشتیی خۆی دایە کە مافی یەکسان بۆ هاوولاتییەکانی لەبەرچاو بگرێ و بێجگە لەوەش ئەو کۆمەڵگایەی کە هاوولاتییەکانی مافی یەکسان و وەکیەکیان هەیە، تاقانە قوتابخانەی راستەقینەی ئەخلاقە.)[٨٤] ئەو لەم پەیوەندییەدا دەڵێ: دەسەڵاتی خۆپەرستانە و خۆ بەزۆر زانینی پیاوان بەسەر ژناندا کە بەردەوام لە ئارادایە؛ بەهاکانی ژیان لەناو دەبا و کاریگەریی زۆر خراپی لەسەر منداڵان دەبێ.

لە هەلومەرجێکدا کە پەیوەندیی ئاغاو رەعییەتی، لە نێوان دوو کەسدا هەبێ و یەکێکیان باوەڕی پتەوی بەوەبێ کە لە هەموو بوارێکەوە لەوی دیکە مەزنترە، لەوەها دۆخێکدا بەها مرۆیی و دادپەروەرییەکان دەستەبەر نابن. ئەو پرسیار دەکا کە چ هیوایەک هەیە بە چاکبوون و چاکسازیی ئەخلاقی کۆمەڵگا لە پێجێییەک کە کەشی خێزان لەسەر بنەمای نایەکسانی دامەزرابێ و ئەندامەکانی هەر لە سەرەتای منداڵییەوە خۆیان بە مافی نایەکسان گرتووە؟ بەواتایکی دیکە؛ ئەگەر یاساکانی زەماوەندکردن؛ یەکسانیی مافی ئەندامانی کۆمەڵگا بە فەرمی بناسێ و بنەماڵە کە کۆڵەکەی سەرەکیی بیچم گرتنی کۆمەڵگایە ببێتە قوتابخانەیەک کە داکۆکیکاری



یەکسانی و هاوژینی بێ لە کەشێکی پڕ لە دڵۆڤانی و خۆشەویستی و بەبێ دەسەڵاتی یەکێک بەسەر ئەوی دیکەدا، ئەو کات منداڵان لەوەها کەش و فەزایەکدا ئامادە دەبن ئەو شتە وەدی بێنن کە ستوارت میل (بۆ مەزناهیی راستەقینەی مرۆڤ) و (ژیانی یەکسان لە کەشێکی یەکسان) دا چاوەڕوانیی دەکرد.[٨٥] پێویستە لێرەدا ئاماژە بە خاڵێک بکرێ، ئەویش ئەوەی کە سەرەڕای ئەم لێدوان و باسە جیددییانەی میل کە لەسەر یەکسانیی ئەندامی خێزان نووسراون و بەرهەمە فمێنیستییەکانی ئەو بەگشتی و بەشێوەی ئیماژی؛ بۆ ئەو تاقمە ژنانەیە کە سەر بە بنەماڵەی چینەکانی سەرێ و نێونجیی کۆمەڵگان.[٨٦]

میل خوێنەرانی خۆی لەوە دڵنیا دەکاتەوە کە ئەگەر بنەماڵە مافی سیاسی و مەدەنیی یەکسان و وەکیەکی هەبێ؛ ئیتر ژن و مێرد وەک دوو ڕەگەزی دژ و لێک جیاواز لە کۆمەڵگادا جێی پەرۆشی و نیگەرانیێ نین[٨٧]؛ چونکی ئەگەر هەمووان مافی سیاسی و مەدەنی یەکسانیان هەبێ، ئیتر بنەماڵە لەوشوێنەوە کە تێیدا وانەی سەرەڕۆیی و دیکتاتۆری دەگوترانەوە؛ دەبێتە جێگایەک کە تێیدا مەزنایەتیی ئازادی فێری تاکەکان دەکرێ.[٨٨] ئەگەرچی ستوارت میل نکوڵی دەکا لە رەوایی و یاسایی بوونی نایەکسانی لە بنەماڵەی باوک مەزندا و لە ژێر ناوی (پێویستی مرۆیی)؛ بەڵام لە بەشێکی کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا، باسێک لەسەر دابەشکردنی نەریتیی کار لە بنەماڵەدا بەمجۆرە دەخاتەڕوو: ((ژنان دەبێ خاوەنی مافی هەڵبژاردنی کار یا شوکردن بن و ئەگەر وەها مافێکیان بۆ لەبەرچاو گیرا، ئەوان زیاتر وایان پێ باشترە شوو بکەن؛ دیارە هەڵبژاردنی ئەوان وەک هەڵبژاردنی کار وایە، چونکی ژنێک بەهەڵبژاردنی شووکردن، کارێکی وەکو منداڵداریێتی و منداڵ بەخێوکردنی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و هەڵبژاردنی کارەکانی دیکەی وەلا ناوە و جوان دیارە کە ئەم هەڵبژاردنە، رێک وەک کار هەڵبژاردنی پیاوێک وایە.[٨٩] ئەو بە هاوڕایی لەگەڵ وەها هەڵبژاردنێکدا دەڵێ: ((بەو جۆرە، ژن بە هەڵبژاردنی کارێکی وەک دایکایەتی، لە چاو پیاو پەیوەندییەکی نزیکتری لەگەڵ منداڵەکەیدا دەبێ)).[٩٠] هەروەها ((ئەوەش کە

بۆ پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵ کەس ناتوانێ جێگەی دایک پڕبکاتەوە.))[٩١] دیارە میل بەبێ سەرنجدان بە بارودۆخی دایکایەتی کە ئەویش جیاوازییەکی دیکەی ئافرەتانە لە پیاوان؛ هۆکارێکی دیکەش بۆ میتۆدی نەریتیی خێزان دێنێتەوە و ئەوەش دەگەڵ تیۆرییەکەی خۆی لەسەر هەلومەرجە ژینگەییەکان یەکناگرنەوە. ئەو لە شوێنێکی دیکەدا، هێور و لەسەرە خۆ، مل رادەکێشێ بۆ دابەشکردنی رەگەزییانەی کاروبارەکان لە نێومالێدا و دەنووسێ: ((بەشێک یا تەواوی ئەم جۆرە کاردابەشکردنانە، لەمەوپێش لەسەر رەزامەندیی دوولایەنە یا نەریتی گشتی قبووڵ کراون و بەزەبری یاسا نەچەسپاون)) و هەورەها بۆ داکۆکی کردن لەم چەشنە کاردابەشکردنانە دەڵێ "زۆربەی ئەو کارانەی بەسەر پیاو و ژن دا، دابەش دەکرێن ئەو کار و بارانەن کە شیاوی خۆیانن[٩٢]. لەو تارە سەرەتاییەکانی میلدا کە لەسەر زەماوەندکردن و تەلاق نووسراون دەمار گرژییەکی زیاتر بەنیسبەت ئەو مەسەلەیە خراوەتەڕوو لە چاو بەرهەمەکانی ئەم دواییانەیدا وەک کۆیلەکردنی ژنان. ئەم بابەتە؛ رێک ئەو بەشە لە بیر و هزرەکانی ستۆرت میل لە خۆ دەگرێ کە لەگەڵ هارێت تایلۆر یەکیان نەدەگرتەوە، چونکی میل ساڵی١٨٣٢ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە ((هیچ چەشنە نایەکسانییەکی سروشتی لە نێوان ژن و پیاودا نییە))، بەڵام دوایی بیروڕای گۆڕدرا و گوتی : ((ئەگەر قەرەواشێک (ژنەخزمەتکار) لەماڵێدا نەبێ سروشتییە کە دەبێ کابانی ماڵێ ئەرکەکانی ئەو راپەڕێنێ)) هەروەها ئەم بۆچوونە کە ((دەبێ گەورەترین کار و ئەرکی ژنان؛ رازاندنەوەی ژیان و دلۆڤانی نواندن بێ؛ چونکی ژنان بە شێوەی سروشتی، خاوەنی ئەمجۆرە وردبینی و زەوق و سەلیقە باشانەن)).[٩٣]

ئەو کاتەی میل کتێبی ((کۆیلەکردنی ژنان))ی دەنووسی؛ ئیتر باوەڕی بە کاری سروشتیی کابانێتی بۆ ئافرەتان نەبوو، چونکی بەڕوونی بۆی دەرکەوتبوو کە بەکارهێنانی وشەی ((سروشتی)) لەڕاستیدا بەفەرمی ناسین و پاکانەیەکی فریودەرانەیە بۆ ئەرکە نەریتییەکانی ژنان لە ماڵێدا. بەگشتی دەبێ سەرنج بدرێتە ئەوە کە؛ سەرەڕای بەکارهێنانی دەستەواژەگەلێکی



وەک ((شیاوو پڕبەپێست)) و ((نەریتی باو)) کە لە بەرهەمانی میلدا لە بری ((سروشتی)) دانراون؛ بنچینە و جەوهەری باوەڕەکانی میل هیچ گۆڕانێکیان بەسەر دانەهاتووە.

لەو کاتدا، بەکارهێنانی میتۆدی کۆنی پێشگرتن لە ((زگ پڕی)) ببوە هۆی مردنیگەلێک لە ژن و منداڵان و هەروەها کاروبارە ئاساییەکانی ماڵێش زۆر تاقەت پڕووکێن بوون. تێگەیشتن لە پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵ بە شێوەی هاوبەش؛ بەلای میلەوە دژوار بوو. بەو حاڵەشەوە سەیر ئەوەیە کە ئەو بەنیسبەت چۆنێتی زاوزێ و پەیوەندیی نێوان دەزگای خێزان لە نێو چینە نێونجەکان و پێگەی ژن لە کۆمەڵگادا، ناڕەزایەتیی دەرنەبڕی؛ چونکی بە ئاشکرایی؛ شێوەی بنەماڵەی تایبەتی (خصوصی) بە ((کاری ژنان لەماڵێدا)) و کاری پسپۆڕیی (حرفەای) و پیشەیی ((پیاوان لە دەرەوەی ماڵێ)) و مەودای بەربڵاوی نێوان دووکەشی کارکردن، لەلایەن سروشتەوە بەرسەر ئەواندا نەسەپێنرابوو.

بۆچوون و باوەڕی ستوارت میل لە پەیوەندی لەگەڵ نەگۆڕ بوونی رەوشی خێزان و گەڕانەوەی ژنان بۆ ژیان لە چوارچێوەی ماڵێدا و هەڵبژاردنی کابانێتی بووە هۆی پێکهاتنی کەلێنێکی قووڵ لە ئەندێشەی فێمنیستی ئەودا کە بزاڤی فێمنیستیی ئێستا، هەوڵی چاککردنی دەدا. باوەڕهێنانی میل بە رۆڵی نەریتیی ژن و پیاو لە بنەماڵەدا، بەو هۆیانە؛ گەلێک ئاستەنگی بۆ بنەماکانی ئازادی و یەکسانیی ژنانی بەمێرد؛ دروستکرد.

یەکەم: ئەگەرچی میل؛ مافی مڵکایەتی و وەرگرتنی میرات و ئەو داهاتەی ژنان وەدەستی دێنن بۆ ئافرەتان بەفەرمی دەناسێ؛ بەڵام ئەو مافانە بەڕای ئەو مافی یەکسانی داهاتی بنەماڵە لە خۆ ناگرن. میل دەنووسێ: ((رێسایەکی سادە و ساکار ئەوەیەکە؛ داهاتی ژن و پیاوی سەڵت دەدرێ بەخۆیان، بەڵام ئەگەر زەماوەند بکەن؛ ئەو داهاتە، هەروا لە ژێر رکێف و دەسەڵاتی خۆیاندا دەمێنێتەوە)).[٩٤] بەواتایەکی دیکە: داهاتی پیاوان دوای زەماوەندکردنیش هەر بە خۆیان دەبڕدرێ و ژنانیش کە دەبێ کاری ماڵێ وەئەستۆ بگرن و لە ماڵێ نەیەنەدرێ، بێ داهات دەبن، بەڵام میل ئەوەش

قبووڵ ناکا کە تەنانەت حەقدەستیان پێ بدرێ. ئەو لەم پەیوەندییەدا لەوتاری ((مافی دەنگدانی ژنان)) دا گوتوویەتی : ((ژنانی بەمێرد پێویستە بۆ خۆیان داهاتێکیان هەبێ، چونکە ئەگەر ئەوانیش هەم داهاتیان هەبێ و هەم مافی خاوەنێتی، رەوش و پێگەیان لە کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکیش بەرەوباشی دەچێ)).[٩٥]

ئەگەرچی میل لە کتێبی کۆیلەکردنی ژناندا گوتوویەتی کە ژنە بەمێردەکان دەبێ داهاتی خۆیان هەبێ (نابێ لە باری ئابوورییەوە چاو لەدەستبن- وەرگێڕی کوردی)، بەڵام راشکاوانە و لێبڕاوانە ئەم رایەی، دوای وتەکەی خۆی دەربڕیوە کە: ئەگەر خۆ دابینکردنی ئەوان (لە باری ئابوورییەوە) بووە هۆی ئەوەی کە فریای کاروباری ماڵێ و منداڵ بەخێوکردن نەکەون، هەر واباشترە وازی لێ بێنن.

بە پێچەوانەی هاریێت تایلۆر کە باوەڕی بە سەربەخۆیی ئابووریی ژنان هەم لە کاتی رەبەنی و هەم لە سەردەمی خێزانداریییاندا هەبوو، ستوارت میل؛ باوەڕی بەوجۆرە لە سەربەخۆیی ئابوورییە نەبوو کە دەبێتە هۆی کەمتەرخەمی دەرهەق بە منداڵ بەخێوکردن و کاری ماڵێ.

دووهەم: داکۆکیی میل لە رۆڵی نەریتیی ژن و پیاو لەماڵێدا، بووەتە هۆی نکۆڵی کردن لە ئازادیی ژنان و هەروەها لە دەرفەت و هەلومەرجی پشکوتنی توانا و زەوقی ژنان. چونکی ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە پاراستنی خێزان ئەرکی سەرشانی ژنانە و دەبێ بەردەوام مشوری بخۆن. دیارە ئەم وتانە هۆیەکی دیکەن بۆ ئەوەی ژنان ناتوانن لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست و هونەردا چالاکی بنوێنن و میل بەم باوەڕەوە بۆتە هۆی هاتنە ئارای کۆسپ و لەمپەرگەلێک کە خراونەتە سەر رێگەی ژنان.[٩٦] ئێستا ئەگەر بەکردەوە نەهێڵن زۆربەی ژنان ئەو کارانە بەدەستەوە بگرن کە دەتوانن بەڕێوەیان بەرن، یا بەدانانی یاسا و دەستوور، کۆسپ و تەگەرەیان بخەنە سەر رێ، رەگ و ریشەی ئەم دژایەتیکرن و دەمارگرژییە دەرهەق بە ژنان چۆن خاشەبڕ بکرێ؟ هەروەها چۆن بڕوا بەو ئیدعایەی میل بکەین کە لە نامەیەکدا بۆ هاریێت تایلۆر دەنووسێ: ((بۆ لەناوبردن و



سڕینەوەی بیروڕای دەمارگرژانەی خەڵک لەسەر ئەوە یکە ژنان دەبێ ژێردەستە و گوێڕایەڵی پیاوان بن؛ دەبێ کار و چالاکییەکانی ژنانیان لە پراکتێکدا پێشان بدەین،.[٩٧] میل لە کتێبی (مافی دەنگدانی ژنان)) دا کە لە سەردەمی زیندووبوونی تایلۆردا نووسیویێتی بیروڕاکانی لەچاو دوای مەرگی تایلۆر رادیکاڵانەتر بوونە.

لەوانەیە ئەم وتارە کە میل بۆ داکۆکی کردن لە ژنانی بەمێرد (خێزاندار) نووسیویێتی و تێیدا پشتیوانیی کردووە لە سەربەخۆیی ئابووریی ژنان (بۆ ئەوەی چاو لە دەستی پیاوان نەبن) و هەروەها ئەوەش کە ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی رەدکردۆتەوە کە دەڵێ: ((ئەرکی ژن منداڵ پەروەردەکردن و رازاندنەوەی ماڵی مێردە.))[٩٨] وێدەچێ؛ سەرچاوەیان لە بیروڕاکانی هاریێت تایلۆری خێزانی وەرگرتبێ و میل باوەڕی پێیان نەبووبێت.

سەرەڕای ئەوانەش؛ جۆن ستوارت میل کەسێک بوو کە بە حەز و تاسەوە هەوڵیدا بنەماکانی لیبراڵیزم و یەکسانی بۆ ژنان بەکاربێنێ. ئەو بەتوندی دژی سیستەمی باوک مەزنی لە نێو خێزاندا و هەروەها ژێردەستەیی سیاسی، یاسایی و شەرعیی (ئایینی)، ژنان بوو. ئەو شتانەشی بە سووکایەتیکردن بە ئازادی و دادپەروەری و هەروەها بەهەڵەیەکی مێژوویی لە قەڵەم دەدان کە لە سەردەمی نوێدا سەریانهەڵداوە. ئەگەرچی ستوارت میل یەکێک بوو لە فێمینیستە سەرەتایی و پێشڕەوەکان، بەڵام ئەو هیچ کات لە هێندێ لەو بێدادی و نادادپەروەرییانە هەر تێنەگەیشت کە ئیزنی بەپیاو دەدا سەرەڕای ژیان و منداڵ، سەربەخۆیی ئابووریشی هەبێ، بەڵام ژنی ناچار دەکرد لەم دووانە لە یەکیان سەرپشک بێ. هەروەها میل بە پشتیوانی کردن لە سیستەمی نەریتیی خێزان، بنەماکانی ئازادیخوازی و یەکسانی و بیرۆکەی فێمینیستیی خۆی بەرتەسک کردەوە.